# داستانی یاوەران

بەشی سێیەم

ئامادەکردنی

باوکی عبداللّە

١٩٩٨ز

١٤١٨ھ

بسم الله الرحمن الرحيم

پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی

الله الله في أصحابي لا تتخذوهم غرضاً بعدي

لا تسبوا أصحابي فلو أن أحدكم أنفق مثل أحدٍ ذهباً ما بلغ مُدَّ أحدهم ولا نصيفه . أصحابي كالنجوم بأيهم اقتديتم اهتديتم

٤١

# خالیدی کوڕی وەلید

## شمشێری خوا
## لەسەر ملی گاوران

# ٤١

# خالیدی كوڕی وەلید
# شمشێری خوا لەسەر ملی گاوران

سەربردەی ئەم یاوەرە سەیرە .....!!

ئەو پیاوە بووە هۆی شكستی مسوڵمانان لە ڕۆژی ئوحدو بووە هۆی شكستی دوژمنانی ئیسلام لە ڕۆژانی تر .....

ئینجا بادەست بكەین بە گێڕانەوەی ئەم سەربردەیە لە سەرەتاوە

بەڵام چ سەرەتایەك ... ؟؟

ئەم یاوەرە خودی خۆی حەز ناكات باسی ژیانی بكەین لە سەرەتادا تەنها لەم ڕۆژەوە نەبێت كەوا دەستی لەناو دەستی پێغەمبەر ﷺ ناو موبایەعەی كرد

ئەگەر لە تواناو دەسەڵاتی بوایە هەموو ئەم ڕۆژگارو ساڵانەی پێش مسوڵمان بوونی دەسڕیەوە .....

ئینجا با لەم شوێنەوە دەست پێبكەین كەوا خۆی حەزی لێدەكات لەم ساتوكاتە پرشنگدارانەی كەوا دڵی مل كەچ بوو بۆ فەرمانی خواو هەردوو دەستە ڕاستەكانی بەزەیی خوای گەورەی بەسەر دڵو دەروونیدا هاتو ، جۆش درا بۆ ئایینی خواو ، پێغەمبەرەكەیو گەیشتن بە شەهادەت لە پێناوی خوای گەورەو ، سڕینەوەی هەموو ئەو تاوانانەی كە بۆ سەرخستنی ناهەقو لە ڕۆژانی پێشوودا لەسەر ئەستۆی كۆببۆوە

*　　　　*　　　　*

ڕۆژێك (خالید) لەگەڵ خەیاڵی خۆی دەدوا ، بە بیرە تیژەكەی بەخۆیدا دەچۆوە سەبارەت بەم ئایینە نوێیەی كەوا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر گەشە دەكاو پەرە دەسێنێت ، هیوای دەخواست لە پەروەردگاری خاوەن نهێنی شتێكی بۆ ئاشكرا بكات ببێت بە هۆی هیدایەت دانیو ، مزگێنی دڵنیا بوونی لە دڵودەروونی بچەسپێنێت ، ئینجا گوتی

( سوێند بە خوا ئەمە ڕێگایەكی ڕاستە )

ئەم پیاوە پێغەمبەرە .......

ئیتر تاكو كەی .... ؟؟ سوێند بە خوا دەڕۆم ، مسوڵمان دەبم تا ...)

با گوێ لە خالید بگرین ... خوا لێی ڕازی بێت .. باسی ئەم كاروانە پیرۆزەمان بۆ بكات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ وە ئەم گەشتەی لە مەككە كردی بۆ مەدینە بۆ ئەوەی جێگایەك بگرێت لە كاروانی بڕواداران

(( حەزم دەكرد بۆ ئەم گەشتە یەكێك هەبێت لە ڕێگادا هاوڕێیەتی بكەم ، گەیشتمە لای عثمان كوڕی طلحة ، باسی ئەم شتەم بۆ كردكە مەبەستمە ئەویش ئەم كارەی پێ چاك بوو (استجابە)ی بۆم هەبوو ، هەردووكمان بەڕێكەوتینو ملی ڕێگامان

گرت ، کاتێك گەیشتینە دەشتایی (عەمری کوڕی عاص)مان گەیشتێ ، گوتی سلاوتان لێبێت ، ئێمەش گووتمان لە تۆش بێت

(( گوتی ڕوو لە وێ دەکەن ؟ ئێمەش پێمان گوت ، پاشان ئێمەش پرسیارمان لێکرد ئەویش گوتی نیازم لای پێغەمبەرە بۆ ئەوەی مسولمان بم

(( هاوڕێیەتی ئەویشمان کرد تاکو گەیشتینە مەدینە لە یەکەم ڕۆژی سالی هەشتی کۆچی کاتێك پێغەمبەری خوامان لێ بەدیار کەوت ﷺ سەلاممان لێکرد ، ئەویش وەلامی سەلامەکەی داینەوە بە ڕوویێکی گەش ، بوومە مسولمان و شاهێدی هەقم دا

(( پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :- من بیروهۆشم لە تۆ دەبینی تکام وابوو تەنها بت گەیەنێت بە چاکە

(( موبایەعەم دا بە پێغەمبەری خواو گووتم :- داوای لێخۆش بوونم بۆبکە لە هەموو ئەم شتانەی کردبووم بە بەرپەچ لە ڕێگای خوا

فەرمووی :- ئیسلام هەموو گوناهەکانی پێشوو دەسڕێتەوە

گوتم : لەسەر ئەمە ئەی پێغەمبەری خوا

فەرمووی :- پەروەردگارا لە خالیدی کوڕی وەلید خۆش ببە لەسەر هەموو ئەم شتانەی کردبووی بە بەرپەرچ لە ڕێگاکەت

(( عەمری کوڕی عاص و عثمان کوڕی طەلحەش هاتنە پێش و ، مسولمان بوون و موبایەعەیان دا بە پێغەمبەری خوا

ئایا داواکاری خالید دەبینن بۆ پێغەمبەر:- داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە لە هەموو ئەمانەی دامنابۆوە بۆ داخستنی ڕێگای خوا )) ؟؟

ئەوەی وای کرد ئەم عیبارەتە دەربڕێ بیروبۆچوونەکانە بوو ، کەوا دەمانگەیەنێ بە تێگەیەشتنێکی ڕاست و دروست بۆ ئەم هەلوێستانەی کە بە مەتەل دەچێت لە ژیانی شمشێری خواو پالەوانی ئیسلام

هەر کاتێکیش گەیشتنە ئەم هەلوێستانە لە داستانی ژیانی ئەم یاوەرە ئەم عیبارەتە دەبێتە بەلگە بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی ماناکانی

با ئێستاش ، لەگەل خالید کەمێك بوەستین کاتێك بوو بە مسولمان ، بۆ ئەوەی سوارچاکی قورەیش و سەرلەشکری سوارچاکان و زۆرزانی عەرەب لە دونیای شەڕو شۆڕدا ببینین چۆن خواکانی باپیرانی و میللەتەکەی دەخاتە پشت گوێ و ، لەگەل پێغەمبەرو مسولمانان پێشوازی لە جیهانی نوێ دەکات و تێدەکۆشێ لەژێر ئالای موحەممەد و وشەی یەکتاپەرستی

*　　　*　　　*

ئایا هەوالی شەهید بوونی ئەم سێ شەهیدە قارەمانەی جەنگی موئتەتان بە یادا دێت ؟

ئەمانەش زەیدی کوڕی حاریث و جەعفەری کوڕی ئەبوطالیب و عبداللەی کوڕی ڕەواحە بوون

ئەمانــە پاڵــەوانی جــەنگی (موئتــە) بــوون لــە خــاکی شــام      ئــەم جەنگــەی ڕۆمــەکان دووصــەد هــەزار جــەنگاوەری بــۆ کۆکــردەوە ، مســوڵمانان تێــدا تووشــی بەلایەکی بێوێنە بوون

ئایا ئەم عیبارەتە بەڕێزە خەمگینەتان بەیاد دێت کەوا پێغەمبەر ﷺ تێیدا ماڵئاوایی کرد لە هەر سێ فەرماندەی جەنگ ، کاتێك فەرمووی :-

( زەیـدی کـوڕی حاریثــە ئاڵاکــە وەردەگرێــت و شــەڕی پێدەکــات هــەتاکو شــەهید دەبێـت      پاشان (جەعفەر) وەریدەگرێت شەڕی پێدەکات تاکو شەهید دەبێـت پاشان (عبداللەی کوڕی ڕەواحە) شەڕی پێدەکات تاکو شەهید دەبێت )

بەشەکەی تری ئەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا ﷺ ، بۆ جێگـای خـۆی بـەجێمان هێشتبوو لەسەر ئەم لاپەڕەیە

ئەم بەشەی ماوەتەوە ئەمەیە :-

(پاشـان ئاڵاکــە شمشــێرێك لــە شمشــێرەکانی خــوا وەریدەگرێــت . خــوای گــەورە سەرکەوتن لەسەر دەستی ئەو وەدەست دێنێت )

ئایا دەبێت ئەم قارەمانە کێ بێت       ؟

ئەم قارەمانە (خالیدی کوڕی وەلید)ە      کەوا بەبێ دواکەوتن چوو بۆ جەنگی موئتە وەکو موجاهیدێکی ئاسایی لەژێر سەرکردایەتی ئەم سێ سەرکردەیەی کەوا پێغەمبـەری خوا لەسەر سوپا دایتان زەیدو جەعفەرو کوڕی ڕەواحە ، کەوا هەروەك ئەم ڕێکخستنو دانانەی بۆیان دانرا لەسەر گۆڕەپانی ئەم جەنگە دژوارە شەهید کران

پاش شـەهیدبوونی کۆتـا سـەرکردە ، بەخێرایی (ثـابت کـوڕی ئـەقرەم ) بـە دەسـتی ڕاستی ئاڵاکەی هەڵگرت و بەرزی کردەوە لە ناوەڕاستی سوپای مسوڵمانان تاکو پشێوی ناو ڕیزەکانیان دروست نەبێت

(ثابت) ئاڵاکەی هەڵگرت بە پەلەو بەبێ دواکەوتن ڕووی کردە (خالیدی کوڕی وەلیـد) و ، پێی گوت :- ( ئاڵاکە بگرە ئەی باوکی سولەیمان)

بەڵام خالید ئەمەی بە مافی خۆی نەزانی لە کاتێکدا تازە هاتبووە ناو ئیسلام

ئەمەیـە ئـەدەبو ملکـەچیو خۆناسـینو ڕەوشــت . ئەمانــە هــەر هــەمووی شــایانی ئەم بوون !!

لێرەدا وەڵامی ( ثابت کوڕی ئەقرەم )ی دایەوەو پێی گوت :-

(نەخێر ... نەخێر ئاڵاکە وەرناگرم ، - تۆ شایەنی ئەمەی      لـەمن بەتەمـەن تـریو بەشداری بەدرت کردووە -)

( ثابت ) وەڵامی دایەوە ( بیگرەوە ، تۆ لە جەنگ لـەمن شارەزاتری ، سوێند بەخوا وەرم نەگرتووە تەنها بۆ تۆ نەبێت ).

پاشان بانگی مسوڵمانای کردو ئایا بە سەرکردایەتی خالید ڕازین      ؟

گوتیان : بەڵێ

ئەم پاڵەوانە سواری ئەسپەکەی بوو و، ئاڵاکەی بەدەستە ڕاست هەڵگرتو بۆ پێشـەوە ڕۆیشت هـەروەك بڵێیـت چەند دەرگایەکی لەسـەر داخراوە ئێستاکە کـاتی هـاتووە ئـەم

دەرگایانـە لەچـەند ڕێگایـەکی سـەخت بکرێنـەوە ، ئەمـەش پاڵـەوانێك بەچـەند بـازێك دەیکاتەوە لە کاتی پێغەمبـەرو دوای کۆچـی دوایـی پێغەمبەر ، تـاکو دەسـەڵات و توانـای دەگاتە ڕادەیەکی بێئەندازە ئەمەش بەهۆی ئازایەتی و چاونەترسی ئەم قارەمانە بوو

خالید سەرکردایەتی سوپای وەرگـرت ، پاش ئـەوەی ئـەنجامی جەنگەکە دیار بوو ، مسـوڵمانان قوربانیـان زۆر بـوو ، لایەنـەکانیان شپرزەبووبوون و ... سـوپای ڕۆمیـش لـە زۆرییەکی بێ ئەندازە بوو، سەرکەوتوو و بە وورە بوون

هـەروەها نـەدەکرا ئـەنجامی جەنگەکـە بگۆڕدرێـت بـە هیـچ کەل‌وپـەلێکی جـەنگی زیادکردنی ژمارەی جەنگاوەران وا بکات ژێرکەوتوو سەرکەوتوو بکات یاخود سەرکەوتو ژێرکەوتوو بکات

بەڵام تەنها کارێك نەبێت چاوەڕێی قارەمانێك دەکرا بۆ ئەوەی کارەکە ڕاپەڕێنێت و ، زیانـەکانی لەشـکری ئیسـلام بوەسـتێنێت و ، ژمـارەی لـێنەدراوەکان ڕزگـار بکـات ، واتـە کێشـانەوەیەکی کـاتی بـۆ پاراسـتنی ئـەم بەشـە ماوەیـەی کـەوا لـە گۆڕەپـانی جەنگ شەڕ دەکەن

لەگەڵ ئەمەشدا کێشانەوەیەکی بەم جۆرە لەناو دەمی ئەژدیها زۆر گرانە

بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت شتی زەحمەت و گران لە دڵی پیاوی ئازادا جێگای بۆ نیە ، باشە چ دڵێك ئازاترە لە دڵی خالید بۆ ئەوەی ئەم کارەی لا زەحمەت بێت ؟؟!

لێرەدا شمشێری خودا پێش کەوت و گۆڕەپانی جەنگ بە هەردوو چاوە چەشن هەڵۆ ئاسا تیژەکانی ، پیلانەکانی لێکدایەوە بە بیرە تیژە خۆرئاساکانی و سوپاکەی دابەش کردو - جەنگ بەردەوام بوو - کردنی بە چەند کۆمەڵێك ، پاشان هەر کۆمەڵێکیش بە گرنگیی خۆی هەڵسا ئەویش هونەری مرۆڤ داناو بلیمەتەکانی خۆی بەکارهێنا ، تاکو بۆشایییەکی فراوانی لە ڕیزەکانی دوژمن کردەوە ، سوپای مسوڵمانان بە گشتی تێیدا بە ساغ و سەلامەتی دەرچوون ، ئەمەش بە هۆی ئازایەتی پاڵەوانی ئیسلام بوو لەم کارەساتە بن برە کەوا ڕزگار بوونی بۆ نەبوو

لێرەدا لەم جەنگەدا پێغەمبەری خوا ئەم نازناوە مەزنەی بەخشی بە خالید

*　　　*　　　*

قورەیشـەکانیش پەیمانـەکانیان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا ﷺ هەڵدەوەشـاندەوە ، ئـەوەبوو مسـوڵمانانیش لـەژێر سـەرکردایەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەڕۆیشـتن بـۆ ڕزگـارکردنی مەککـە لـە لای ڕاسـتی سـوپاکە ، پێغەمبـەر ﷺ خـالیدی کـوڕی وەلیدی کرد بە ئەمیر

خلید وەکو فەرماندەیەکی سوپای مسوڵمانان چووە ناو شاری مەککە ، پاش ئەوەی کاتی خۆی دۆڵ و چیاکانی بینیبوو ، یەکێك بوو لە سەرکردەکانی سوپای بت پەرستی بـۆ ماوەیـەکی درێـژ بەسـەرهاتەکانی منداڵـی و جێگـا خۆشـەکان و یادگاریـەکانی گەنجێتی و ڕابردووەکانی بە دڵدا دەهاتـەوە پاشـان ئـاخی هەڵدەکێشا بۆ ئەم ڕۆژگارە درێژانەی کەوا لە تەمەنی ڕۆیشتبوو بۆ خزمەتی ئەم بتە داماوو ڕەق و ووشکانە

پێش ئەوەی گوناهەکانی پێشووی ، فرمێسك لە چاوەکانی بهێنێتە خوارەوە دیمەنی ڕزگارکردنی مەککە دڵو دەروونی خۆش کردبوو

دیمەنی ئەم ڕۆناکیی‌ەی باڵی کێشا بەسەر مەککەو دیمەنی ئەم چەوساوانەی تاکو ئێستا شوێنەواری ئازارو ئەشکەنجە لەسەر جەستەیان مابوو ، ئێستاکە دەگەڕێتەوە مەککە . لەسەر پشتی ئەسپەکانیان دەنگی ئەسپەکان گوێی بێباوەڕانی کاس کردووە لەژێر ئاڵا شکۆدارەکەی ئیسلام پاش ئەوەی بە بێ گوناهو بەبێ ستەم لە وڵاتی خۆیان دەربەدەرکرابوون و هەتا دوێنێ پسەپس و قسە نهێنیی‌ەکانیان لە ماڵی ئەرقەم ئێستاکەش گۆڕاوە بە تەکبیرو تەهلیلەی سەرکەوتن هەموو شاری مەککە دەهێنێتە لەرزین ، هەروەك بڵێیت هەموویان لە جەژندا بن

ناتوانن بە هیچ جۆرێك لێکدانەوە بۆ ئەم ڕووداوە بکەین تەنها بە هۆی ئەم ئایەتە نەبێت کەوا مسوڵمانە سەرکەوتووەکان لە ناوەندی تەکبیرو تەهلیلەکانیان تەماشای یەکتریان دەکردو دووبارەیان دەکردەوە :-

﴿ وعد الله لا يخلف الله وعده ﴾

لێرەدا خالید سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و ، تەماشای ئاڵا شکۆدارەکەی ئیسلامی دەکرد بەدڵخۆشیی‌ەوە دەیگوت :-

(بەڵێ ئەمە بەڵێنی خوایەو ، خواش بەڵێنی خۆی بەدوا ناخات ) !!

پاشان سەری خۆی بۆ زەوی هێنا خوارەوە لەسەر ئەوەی خوای گەورە هیدایەتی‌دا بۆ سەر ڕێگای ئیسلام پێش ئەوەی مەککە ڕزگار بکرێت ئیسلامی هێنا بۆ مەککە لەوانە نەبوو بەهۆی فەتحی مەککە ناچار بێت مسوڵمان ببێت !!! ؟

(خالید) لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە ، هەموو توانایەکی بەرزی خۆی بۆ خزمەتی دینەکەی بەکارهێنا کەوا بە هەموو دڵەوە بڕوایی پێ‌ی هەبوو ، ژیانی کرد بە قوربانی

پاش ئەوەی پێغەمبەری بەڕێز گەیشت بە پەروەردگار ، ئیمامی ئەبوبەکر لێپرسراویەتی خەلیفایەتی وەرگرت . گەردەلولی هەڵگەڕانەوەی فێڵ و ستەم دەستی پێکرد ، بەرەنگاری ئاین بوونەوە لەم نەخشەو شۆڕشەی دروستیان کردبوو ، ئیمامی ئەبوبەکر بۆ یەکەمین جار ئاوڕی لە پاڵەوای مەیدان و ئامادەبوو باوکی سولەیمان ، شمشێری خوا خالیدی کوڕی وەلید دایەوە !!

بەڵێ ئیمامی ئەبوبەکر دەستی بە جەنگێك کرد دژی هەڵگەڕاوەکان بە سوپایەك خۆی سەرکردایەتی دەکردو خالیدیشی دانا بۆ ڕۆژی یەکلابوونەوە ، خالید پیاوی هەڵبژاردەو بلیمەتی خەلیفە بوو بۆ ئەوەی بەشداری پێ‌بکات لە جەنگی یەکجارەکی کەوا لە هەموو جەنگەکانی هەڵگەڕاوەکان ترسناکتر بوو

* * *

کاتێك کۆمەڵی هەڵگەڕاوەکان خۆیان ئامادەکردو دەستیان کرد بەجێ‌بەجێ‌کردنی پیلانەکانیان ، خەلیفەی مەزن ئەبوبەکر وا نەخشەی کێشا سەرکردایەتی سوپاکە خۆی

بیکات . گەورە یاوەرەکان هەوڵێکی بێهوودەیان دا بۆ گێرانەوەی خەلیفە لەسەر ئەم بڕیارە . بەڵام ئەو زیاتر پێی دادەگرت . لەوانەیە بەمە خەلیفە مەبەستی ئەوە بووە زیاتر گرنگی بە مەسەلەکە بدات کەوا داوای جەنگی لە خەڵك بۆ دەکات بەم جۆرە کارەکەی لەبەرچاوی خەڵك زیاتر پیرۆزترو گەورەتر دەکرد ، ئەمەش بە هۆی بەشداریکردنی خودی خۆی لەم جەنگە دژوارە کەوا دەستاری دەگەڕا لە نێوان هێزی ئیمان و هێزی سوپای هەڵگەڕاوەو تاریکی

ڕاپەڕینی هەڵگەڕاوەکان گەورەترین مەترسی هەبوو ، لەگەڵ ئەوەی لەم کاتەی دەستی پێکرد هەڵگەڕانەوەیەکی کاتی بوو و دامرکایەوە تێیدا هەموو دوژمنانی ئیسلام و ئەوانەی لە سەنگەر بۆی دانیشتبوون چاوەڕێی دەرفەتێکی وا بێوێنەیان دەکرد ئینجا چ لە نێو هۆزە عەرەبەکان و یان لە سنوورەکان بێت ، هەروەها پادشاکانی فارس و ڕۆم هەستیان بە مەترسی گەورەی ئیسلام کردبوو لەسەریان . ئینجا ئەوانیش لە پشتەوەی پەردەوە پاڵیان بە ئاژاوە وەدەنا

ئاگری ئاژاوە بەستی پێکرد لە نێو هۆزەکانی ئەسەدو ، غەطفان و عەبەس و

پاشان لە هۆزەکانی :- بەنی عامر و هەوازین و سەلیم و بەنی تەمیم

هێشتا پێکدادان دەستی پێنەکردبوو تاکو سوپای لەبن نەهاتووی هەڵگەڕاوە گەیشتە دەیەها هەزار جەنگاوەر

خەڵکی بەحرێن و عومان و مەهرە بەرەو بانگەوازی ئەم پیلانە ترسناکە هاتن ، ئیسلام پێی تووشی ترسناکترین کارەسات بوو، زەوییان لە هەرچوار لا لە مسوڵمانان کردە ئاگر

بەڵام لێرەدا ئیمامی ئەبوبەکر جاڕی چەکداری گشتی لێدا لە کاتێك دا هۆزەکانی (بەنی عەبەس و بەنی مرە و ژیان ) بە سوپایەکی یەکجار گەورە بۆیان دەرچوون شەڕ هەڵگیرساو ، درێژەی کێشا . پاشان خودای گەورە سەرکەوتنێکی گەورەو مەزنی بۆ مسوڵمانان هێنا

هێشتا سوپای سەرکەوتوو لە مەدینە پشووی نەدابوو ، دووبارە خەلیفە دەست نیشانی تری کرد هەروەها هەواڵی هەڵگەڕاوەکان و کۆبوونەوەکانیان سات لە دوای سات مەترسی زیاتر دەبوو ئەبوبەکر بۆ جاری دووەم لە پێشەوەی سوپا بۆیان دەرچوو ، بەڵام گەورە یاوەرەکان ئارامیان لێنەبڕاو ، بیروڕایان یەك کرد لەسەر ئەوەی خەلیفە لە مەدینە بمێنێتەوە ، ئیمامی عەلی پێش ڕێگای ئیمامی ئەبوبەکری گرت و جڵەوی وڵاخەکەی گرت ئەویش لە ڕۆیشتن بەردەوام بوو پێی گوت :-

( بۆ کوێ ئەی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ؟؟ )

ئەوەی من پێت دەڵێم لە ڕۆژی ئوحد پێغەمبەری خوا ئەمەی فەرمووە :-

( ئەی ئەبابەکر شمشێرەکەت لە شوێنی خۆی دانێوە ، کارەساتی خۆتمان پێنیشان مەدە ...)

بەرامبەر کۆمەڵێك بڕیوڕا لە مسوڵمانان ، خەلیفە ڕازی بوو لە شاری مەدینە بمێنێتەوەو سوپاکەی دابەش کرد لە یازدە کۆمەڵ ، کاری گرنگی بۆ هەر کۆمەڵێك دانا

خالیدی کوڕی وەلید لەسەر یەکێك لە کۆمەڵە گەورەکان بووە ئەمیر ، کاتێك خەلیفە بۆ هەر یەکێك لە کۆمەڵەکان ئاڵای دانا ، ڕووی وەرگێڕا خالید پێ ی گوت :-

( گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو :- باشترین بەندەی خوا و ، برای پشتیتان ، خالیدی کوڕی وەلیدە ، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا ، خوا بەرزی کردۆتەوە بۆ سەر ملی گاورو مونافیقان )

خالید لەسەر ڕێگەی خۆی مایەوە بە سوپایەکەیەوەلەم جەنگ بۆ ئەو جەنگ دەگوازرایەوە ، وە لە سەرکەوتنێك بۆ سەرکەوتنێکی تر تاکو جەنگەکە کۆتایی پێ هات ...

لێرەدا لە (یەمامە) بەنو حەنیفەو هەندێك لە هۆزەکان ، سوپایەکیان ڕێکخست بە گەورەترین سوپای هەڵگەڕاوە دادەنرێت ، موسەیلەمەی درۆزن سەرکردایەتی دەکرد

هەروەها هەندێك لە هێزەکانی مسوڵمانان بەختی خۆیان تاقیکردبوّوە لەگەڵ سوپای موسەیلەمە ، نەگەیشت بوون بە هیچ ئامانجێك

فەرمانی خەلیفە هات بۆ فەرماندەی لێهاتوو بڕوا بۆ سەر بەنی حەنیفە خالیدی بەڕێکەوت ... هێشتا موسیلەمە نەیزانیبوو کوڕی وەلید لە ڕێگایە دەگاتە سەر گیانی بۆ ئەوەی سوپاکەی ڕێکبخاتەوەو ، بەرەنگاری ئەم مەترسی یە ڕاستەقینەی ببێتەوە هەردوو سوپا بە یەکگەیشتن

کاتێك لە پەڕتووکەکانی سیرەو مێژوودا ڕووداوی ئەم جەنگە دژوارە دەخوێنیتەوە ، موچڕكو ترس بە لەشدا دێت ، ئەگەر دەروونت لەبەرامبەر ئەم جەنگە ڕابگریت لە دژواری و سەختی دا لەگەڵ جەنگی نوێ ی ئێستا ، ئەوا تەنها لە جۆری کەلوپەلو جۆری چەك جیاوازی پێ دەکەیت

خالید بە سوپاکەیەوە گەیشتە بەرزایی یەك کە دەڕوانێتە سەر یەمامە ، موسەیلەمە بەفیزو زۆرداری یەوە هاتە پێشی ، ڕیزەکانی سوپاکەی لە زۆریی یان دەتگوت کۆتایی نی یە !!

خالید سوپاکەو ئاڵاکانی وەرگرت بۆ ئەوەی سەرکردایەتی لەشکرەکە بکات ، شەڕ لە نێوان دوو سوپاکە دەستی پێکرد ، کوشتارێکی مەترسی دار کرا شەهیدی مسوڵمانان دەتگووت گوڵەکانی باخچەکانن ڕەشەبایەکی توونـد لێیان دەداو هەڵدەوەران ...!!

خالید بینی تەرازووی جەنگ بەلای دوژمنانە ، لە سواری ئەسپەکەی بەرز بۆوە بۆ گردێکی نزیك ، تێڕوانینێکی بە خێرایی و زیرەكو قووڵی کرد بەسەر جەنگەکەدا یەکسەر خاڵە بێ هێزەکانی سوپاکەی بەدیکردو ژماردنی

هەستی بە لێپرسینەوە کرد ، لە پڕێکدا بێ هێزیی خستە ناو ڕیزەکانی موسەیلەمە ، لە هەمان ساتدا بڕیاری دا و هەستی لێپرسراوەتی دروست کرد لە نێو دڵی مسوڵماناندا

لە بچووك بگرە تاکو گەورە ، بانگی لایەن و هێزەکانی سوپاکەی کردو ، دووبارە سوپاکەی ڕێکخستەوە لەسەر گۆڕەپانی جەنگ ، پاشان بەدەنگە سەرکەوتووەکەی هاواری کرد :-

( جێ پێ شوێنتان دیار بێ و خۆتان دیار خەن ، بۆ ئەوەی ئیمڕۆکە کردەوەی هەموو زیندوویێك ببینین )

کۆچکردووەکان لە ژێر ئاڵاکەیان مانەوەو ، یاریدەدەرەکان لەژێر ئاڵاکەیان و هەر تیرەیەك لەژێر ئاڵاکەی خۆی

بەم جۆرە بە تەواوی ئاشکرابوو ، شکستی لە کوێ دێ و کەی دەست پێدەکات دەروونیان بە جۆرێك گەرم بوو دەتگوت ڕووناکی لێ‌هەڵگیرساوەو دڵیان پڕ بوو لە ئەخشەو خۆشی

سات دوای سات خالید تەکبیرەیەك یا تەهلیلەیەك یاخود هاوارێکی بۆ ڕەوانە دەکرد ، مانای فەرمانێکی دەگەیاند ، شمشێرەکانی سوپاکەی هێزێکی وایان دروست کرد هیچ تەگەرەیەك نەیتوانی ڕێگا لە مەبەستەکانیان بگرێت ...

لە چەند ساتێکی کەمدا ئەنجامی جەنگەکە گۆڕا سەربازەکانی موسەیلەمە بە دەیەها و سەدەها و هەزاران هەڵدەوەران ، هەروەکو چۆن بە مێش کوژ لە کۆمەڵێك مێش بدەیت هەناسەیان تەنگ ببێ و لە هەوادا هەڵبوەرێن !!

خوێن گەرمی خالید هەروەکو کارەبا دەگەیشتە موجاهیدان ، لە دڵی هەر موجاهیدێك خالیدێکی دروست کرد ، ئەمەش یەکێك بوو لە سیفەتە بیلمەتەکانی ئازایەتی خالید

بەم جۆرە ترسناکترین و توندترین جەنگی هەڵگەرشاوەکان کۆتایی هات و ، موسەیلەمە تێیدا کوژراو کەلاکی کوژراوەکانیان گۆڕەپانی جەنگیان پڕکردو بۆگەنی کرد ، بۆ هەتاهەتایی ئاڵای بانگەوازی درۆزنیان کەوتە ژێرخاك و ڕیسوای دونیاو قیامەت بوون

* * *

لە شاری مەدینە خەلیفەی ئیسلام نوێژی شوکری بۆ خوای پەروەردگار کرد سەبارەت بەم سەرکەوتنەی خوا بۆی ڕەوانە کردن و ئەم قارەمانەتەیەی پێبەخشین

ئیمامی ئەبوبەکر بە هۆی ئەم بیرتیژی و زیرەکییەی خۆی هەستی‌کرد بەم هێزە خراپەکاریە زەبەلاحەی ئەم دیوی سنوور کرد زیانی هەبوو بۆ چارەنووسی ئیسلام و خەڵکەکەی ئەمانەش فارسەکان لە عێراق و ، ڕۆمەکان لە وڵاتی شام بوو

دوو ئیمپراتۆریەتی پیر بوون ، خۆیان گرتبوو لە داوێکی بێ‌هێزی بەخت ئاوا بوو کەوا خەڵکی عێراق و شامیان بە توندترین جۆر ئازارو ئەشکەنجە دەدا ، بەڵکو بەکاریان دەهێنان بە تایبەتی عەرەبەکان بۆ شەڕی مسوڵمانەکان ئەوانەی ئاڵای ئایینی نوێیان هەڵگرتبوو

لێرەدا خەلیفەی پیرۆزی مسوڵمانان ڕێنمایی خۆی دەنێرێ بۆ (خالید) بە سوپاکەیەوە بەرەو عێراق بڕوات

پاڵەوانی ئیسلام فەرمانی خەلیفە جێبەجێ دەکاو بەرەو عێراق بەڕێدەکەوێت ، ئەم چەند لاپەڕەیە جێگای ئەوە نابێتەوە بۆ ئەوەی باسی سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی خالید بکەین ، ئەگەر بچینە ناو ئەم بابەتە سەرت سووڕدەمێنێ لە کاری ئەم قارەمانە ...

خالید کارەکانی خۆی ئاسان دەکات لە عێراق بە ناردنی چەند نامەیەك بۆ فەرمانڕەواکانی کیسرا لە شارەکانی عێراق ئەمەش دەقەکەیەتی :-

بسم الله الرحمن الرحيم

لە خالیدی کوڕی وەلید بۆ فەرمانڕەواکانی فارس

السلام على من اتبع الهدى

(( پاشان ... سوپاس بۆ ئەو خودایەی خزمەتکارەکانی لەبەردەست دەرهێنان و ، موڵك و ماڵی کردن بە غەنیمەو ، فێڵەکانی لاواز کردوون

(( هەرکەسێك نوێژ بکاو ، ڕوو لە قیبلەی ئێمەبکاو ، کوژراومان بخوات ئەوا مسوڵمانە ، ئەوەی لەسەر ئێمەیە بۆ ئەوانیشە ، ئەوەی لەسەر ئەوانە بۆ ئێمەشە

ئەگەر نامەی منتان بەدەست گەیشت ئەو شتانەی لەلاتان پەیمان دراوە بە ئێمە بۆتانی ڕەوانە بکەن ئینجا لە لایەن ئێمە پارێزراو دەبن

(( ئەگەر نا ، بەو خودایەی بێجگە لە ئەو هیچ خوایەکی تر نیە میللەتێکیان بۆ دەنێرین حەز لە مردن دەکەن هەروەك ئەوان حەز لە ژیان دەکەن ... ‎!!!‎))

بە هۆی ئەم هەڵگریانەی کەوا پەرت وبڵاوبوون لە هەموو شوێنێك هەواڵ هات فارسەکان هێزێکی یەکجار زۆریان کۆکردۆتەوە لە عێراق ، خالیدیش کاتی بەفیڕۆ نەدا ، بە هێزەکەیەوە ڕۆیشت بۆ ئەوەی هێزی تاریکی لە ڕەگەوە دەربهێنێت ، بەم جۆرە زەوی بۆ فەراهەم بوو بە شێوەیەکی سەیر ...

سەرکەوتنە یەك لە دوای یەکەکانی لە (ئوبولە تا سدیرو ، نەجەف تا حیرە و ئەنبار و کاظمیە) دەستی پێکرد ، لە هەموو شوێنێك بای مزگێنی سەرکەوتن هەڵیدەکردو ئاڵای ئیسلام بەرز دەکرایەوە هەزاران و بەندەکان دەچوونە ژێر سێبەرییەوە ئەو بەندانەی فارس و ڕۆمەکان دەستیان بەسەردا گرتبوون و توندترین ئازاریان دەدان

ئەم شتە چەند جوانە کاتێك خالید دەستی کرد بە رزگارکردن فەرمانی دا بە هەموو هێزەکانی :- ( ئازاری جوتیاران مەدەن ، وازیان لێبهێنن با کاری خۆیان بە سەلامەتی بکەن ، تەنها ئەو کەسانە نەبێت دەردەچن بۆ جەنگ ، لەم کاتەدا شەڕ بکەن لە گەڵیان )) ...

خالید بە سوپا سەرکەوتووەکەی بەڕێکەوت تاکو گەیشتە کەنارەکانی شام ...

لێرەد دەنگی بانگدەرەکانیان و تەکبیرەکان دەنگیدایەوە

بەڵام دەبێت ڕۆمەکان لەشام گوێیان لەمە بێت ؟؟

ئایا دەبێت تێبینی ئەم (تەکبیر)انەیان کردبێت دنیاخۆری و ڕۆژگاریان لە گۆڕدەنێت ؟

بەڵێ گوێیان لێبوو و ، ترس و لەرز گرتنی و ، بڕیاری جەنگێکی کوێرانەو دۆڕاویان دا !

*    *    *

ئەو سەرکەوتنەی ئیسلام بەدەستی هێنا بەسەر فارسەکان دا لە عێراق بووە مزگێنی سەرکەوتنێکی تر بەسەر ڕۆمەکان لە شام

ئەبوبەکری ڕاستگۆ سەربازگەیەکی تری بۆ ئەم مەبەستە دروست کرد ، هەروەها بۆ فەرمانڕەوایی چەند سەرۆکێکی بلیمەت و لێهاتووی هەڵبژارد ، وەکو ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و عەمری کوڕی عاص و یەزیدی کوڕی ئەبی سوفیان و پاشان معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان

کاتێك هەواڵی ئەم سوپایە گەیشتە ئیمپراتۆری ڕۆم ئامۆژگاری وەزیرو سەرۆکەکانی کرد لەگەڵ مسوڵمانان ئاشتی بسەپێنین و نەچنە ناو ئەم شەڕە دۆڕاوە

لەگەڵ ئەمەشدا وەزیرو سەرۆکەکان سوور بوون لەسەر جەنگ کردن و گوتیان :-

( سوێند بەخوا نابێت بهێڵین ئەبوبەکر ئەسپەکانیشی بۆ لەوەڕ نزیك بێتەوە لە خاکمان ) سوپایەکیان ڕێکخست بۆ جەنگ خۆی دەدا لە دووسەدو چل هەزار جەنگاوەر ...

سەرۆکە مسوڵمانەکان ئەم کارەیان بۆ خەلیفە نووسیەوە بە شێوەیەکی ترسناك ئەبوبەکر گوتی :-

( سوێند بە خوا ئەم نەخشەیەی دایان ناوە لە دژی خالید چارەسەری دەکەین

فەرمان لە خەلیفە دەرچوو خالید بچێت بۆ شام ، بۆ ئەوەی ببێت بە ئەمیری سوپای ئیسلام

لەو ساتەی خالید ئەم فەرمانەی پێگەیشت گوێڕایەڵی کردو ، ( موثەنای کوڕی حارثە )ی لەسەر عێراق داناو خۆی و سوپاکەی ڕۆیشتن بۆ ئەم شوێنی هەڵیانبژارد بوو تاکو گەیشتنە شوێنی مسوڵمانان لە خاکی شام ، ئەوەبوو بە بلیمەتی و ئازایەتی خۆی توانی سوپای مسوڵمانان ڕێك خات و لە ماوەیەکی کورتدا سەنگەرەکان مەحکەم بکات ، لە کاتی پێگەیشتنی هەردوو سوپاکە ، خالید وەستا لە نێو موجاهیدان ئەم وتارەی‌دا پاش حەمدو ستایشی خوای پەروەردگار گوتی :-

( ئەم ڕۆژە ڕۆژەکانی خودا ، نابێت تێیدا شانازی و ستەم بکەین

(( بە دڵسۆزی جیهاد بکەن مەبەستتان خوا بێت لە کارەکانتان ، وەرن لێپرسراوەتی لە نێو یەکتر بگۆڕینەوە ئیمڕۆ یەکێکمان لێپرسراوبین ، بەیانی یەکێکی تر ، یەك لە دوای یەك تاکو هەمووتان لێپرسراوەتی وەردەگرن ))

هەروەها سوپای ڕۆم بە هۆی زۆری چەك و ژمارەی ، شتێك بوو تاکو بڵێیت جێگای ترس بوو سەرەك لەشکرەکانی ڕۆم دەیانزانی کات لە قازانجی مسوڵمانانە هەروەها درێژبوونەوەی شەڕو زۆری جەنگ سەرکەوتن بۆ مسوڵمانان دەڕەخسێنێت ، لەبەر ئەم هۆیە بڕیاریان دا هەموو هێزەکانیان لە یەك جەنگ کۆبوبکەنەوە وا لە عەرەب

مسوڵمانەکان بکەن ئیتر بوونیان نەمێنێت ، ئەمەش جێگای گومان نیە مسوڵمانان بەم ڕۆژەدا هەستیان کردبوو بەم مەترسی‌یە لەگەڵ ئەوەشدا شێوان و ترس نەیگرتبوون

بەڵام ئیمان و بڕواییان لە خزمەتیان دابوون لەم کاتە ترسناکەداو ، بەیانی هیواو سەرکەوتن سینەی داپۆشیبوون !!

هەرچەند ڕۆم بەهێز بوون ، لەبەر ئەوەی ئەبوبەکر شارەزای دڵسۆزیی پیاوەکانی خۆی بوو دەیگوت :- ( خالید بۆ ئەم کارە ) !!

وە دەیگوت :- ( سوێند بەخوا خالید چارەسەری نەخشەو خەیاڵەکانی ئەوانە دەکات ) !!

خالید سوپاکەی ئامادە کردوو ، دابەشی کرد بە چەند (فەیلەق)ێك ، بۆ پەلامارو بەرگری چەند پیلانێکی نوێی دانا ڕێك دەکەوت لەگەڵ پیلانەکانی ڕۆم پاش ئەوەی برا مسوڵمانە فارسەکان لە عێراق هەواڵیان دانیو هەموو تواناکانی جەنگیان بۆ نەخشە کێشابوون

ئەوەی جێگای سەرسوڕمان بوو جەنگ دەستی پێکرد هەروەك ئەوەی خالید نەخشەی بۆ کێشابوو هەنگاو بە هەنگاو هەتا وات دەزانی ئاگادارە بە ژمارەی لێدانی شمشێرەکان لە جەنگ ، مەزەندەو تێبینیەکانی هەڵەیان نەدەکرد ...!!

هەموو ئەو پەلامارانەی ڕۆمەکان دەیان کرد خالید بۆچوونی بۆ هەبوو ، هەروەها هەموو کشانەوەکانی ڕۆم کەوا پێشتر باسی کردبوو ڕوویدا

پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات شتێك خالیدی خەریك کردبوو ، ئەوەش لەوانەیە هەندێك لە سەربازەکانی پشت لە دوژمن بکەن -- بە تایبەتی ئەوانەی تازە هاتبوونە ناو ئیسلام – پاش ئەوەی دیمەنی بە ترسی سوپای ڕۆمیان بینیبوو

خالید تەنها لەیەك شتدا سەرکەوتنەکانی بەدەست دەهێنا ئەویش پشت نەکردن بوو لە دوژمن چونکە وای دەڕوانی ئەگەر دووان یان سێیان لە کاتی‌جەنگ پشت لە دوژمن بکەن ، لەوانەیە پشێوی‌و وورەڕووخاندن بهاوێتە ناو سوپاکە بە گشتی

ئینجا بۆ ئەم مەبەستە ، خالید زۆر توند بووە بەرامبەر ئەو کەسەی چەك فڕێ دەدا لە جەنگ‌و پشت هەڵدەکات

هەروەها لەم شوێنە بە تایبەتی – جەنگی یەرموك پاش ئەوەی سوپاکەی سەنگەریان گرت – داوای لە ئافرەتی مسوڵمانان کرد – بۆ یەکەم جار شمشێری پێدان ، فەرمانی پێکردن لە ڕیزی پشتەوەی مسوڵمانان بوەستن لە هەموو لایەك‌و ، پێی گوتن :-

( هەر کەسێك پشتی هەڵکردو هەڵات ، ئێوە بیکوژن )

پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات – فەرماندەی ڕۆم داوای لە خالید کرد بێتە بەرامبەری هەندێك قسەی لەگەڵ بکات ئینجا خالید بە سواری ئەسپەکەی لە بۆشایی نێوان هەردوو سوپاکە بەرامبەری ( ماهان) سەرکردەی ڕۆم بووەو ، ( ماهان ) بە خالیدی گوت :-

( ئەوەی ئێمە زانیمان تەنها نەبوونی‌و برسی‌یەتی ئێوەی لە وڵاتی خۆتان بەدەرهێناوە ...) (( ئەگەر حەز دەکەن ، دە دینار بدەین بە هەر یەکێکتان و بەرگو

خواردنیشتان بدەین ، پاشان دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتتان ، بۆ ساڵی دوایی هەروەك ئەو بۆتان دەنێرین ))...

خالیدی مەردو قارەمان ددانەکانی لە یەکترداو ، لە ووشەکانی سەرۆکی ڕۆم گەیشت لەم قسە بێ ئەدەبانەی ... بڕیاریدا وەڵامی بداتەوە بە وەڵامێکی شیاو ، پێی گوت :-
( ئێمە نەبوونی و برسیەتی وڵاتمان دەرینەهێناوین هەروەك باسمت کرد ، بەڵکو ئێمە میللەتێکین خوێن دەخۆینەوە ، هەروەك زانیمان هیچ خوێنێك نییە وەکو خوێنی ڕۆم بەتام و لەزەت بێت ، ئێمە بۆ ئەوە هاتووین ) !!

خالید جڵەوی ئەسپەکەی گەڕاندەوە بۆ ڕیزەکانی سوپاکەی ، ئاڵاکەی هەڵگرت و بڵندی کردەوە جاڕی جەنگی دا گوتی ... ( الله أکبر ) ... هەڵکە ئەی بای بەهەشت
سوپاکەی وەکو موشەکێکی نیشانەکراو بە ڕووی دوژمن تەقینەوە
شەڕ دەستی پێکرد لە سەختیدا وێنەی نەبوو ...
ڕۆمەکان بەرەنگاریان بوونەوە لە شێوەی فەیلەق هەروەك چیا
موجاهیدەکان کارێکی وایان پێکردن ، ڕۆم بڕوایان نەدەکرد
مسوڵمانان نەخشەیەکی جەنگی کەم وێنەیان کێشا ، بەرامبەر ئازایەتی و خۆڕاگریشیان عەقڵ ڕادەوەستا

* ئەمەش یەکێکە لەموجاهیدان لە (ئەبوعوبەیدەی کوڕی جەڕاح) - خوا لێی ڕازی بێت - نزیك دەبێتەوە جەنگیش بەردەوامە و ، دەڵێت :-
( من بڕیارم داوە لەسەر شەهادەت ، ئایا پێویستیەکت هەیە لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك پێی گەیشتم پێی ڕابگەیەنم ) ؟؟
ئەبوو عوبەیدە وەڵامی دایەوەو گوتی ( بەڵێ پێی بڵێ :- ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی خوا بەڵێنی پێدابوون بە ڕاستی بەجێمانگەیاند )
کابرا وەك تیرێك لە کەوانە دەربچێت بۆی دەرچوو ، گەیشتە ناوەندی جەنگ کەوا بە پەرۆش بوو بۆ ئەوەی شەهید بکرێت شمشێرەکەی وەشاند ، بە هەزارەها شمشێر لێیان داو ، تاکو شەهید بوو ) !!

* ئەمەش عیکرەمەی کوڕی ئەبی جەهلە .
بەڵێ کوڕی ئەبی جەهل
هاوار دەکاتە سەر مسوڵمانان کاتێك ڕۆمەکان زۆریان بۆ دەهێنن و دەڵێت :-
( من زۆر شەڕم کردووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ پێش ئەوەی خودا هیدایەتم بدات بۆ سەر ئیسلام ، ئایا ئیمڕۆ ڕابکەم لە دوژمنانی خوا ) ؟؟
پاشان هاواری کرد : ( کێ پەیمان دەدا لەسەرمردن ) ؟
کاروانێك لە مسوڵمانان پەیمانیان دا لەسەر مردن ، پاشان لەگەڵیان دەرچوو بۆ ئەم بازرگانی کڕین و فرۆشتنەو ، شەهید بوون - خوا لێیان ڕازی بێت -... !!

* هەندێك لە موجاهیدانی تر تووشی برینداریی سەخت بوون ، ئاویان بۆ هێنان بۆ ئەوەی لێوەیان تەڕ بکەن ، کاتێك ئاویان برد بۆ یەکەمیان ، ئاماژەی کرد بۆ ئەوەی ئاوەکە ببەن بۆ براکەی تری برینەکەی سەختتر بوو و تینووتر بوو ، کاتێك ئاویان بۆ برد

ئەویش ئامـاژەی بۆ تەنیشـتە خـۆی کـرد ، کـاتێك ناوەکـەیان بـۆ ئـەویش بـرد،ئـەویش ئامـاژەی بۆ ئەوەی تەنیشتی کرد

بەم جۆرە ، هەتاکو هەموویان گیانیان دەرچوو لە تینوویتی‌دا ئینجا تەماشا بکەن ئەم یاوەرانە چ گیانێکی لەخۆبووردەیی‌یان هەبووە جەنگی یەرمووك ئەو جەنگەی خالید سەرکردایەتی دەکرد زۆر دیمەنی ئازایەتی و لەخۆبووردەیی نیشان دا

یەکێك لەم دیمەنانە ئەم دیمەنە گیان فیدایی‌و قارەمانیەتی‌یەیە کەوا ئەم توانایە بێ ئەندازەیەی دروستی کرد تێیدا (خالیدی کوڕی وەلید) لەگەڵ سەد موجاهید نەخشەی بۆ دەکێشێت کەوا سەردەکەوێت بەسەر چل هەزار سەربازی ڕۆم ، (خالیدی کوڕی وەلید) هاوار دەکاتە سەر ئەو سەد موجاهیدەی لەگەڵی‌دان و دەڵێت :-

{بەو خوایەی گیانی منی بەدەستە تەنها ئەوەی کە دەیبینن ڕۆم ئارام‌و خۆڕاگری لەبەر ماوە ( من تکا کارم لە خوای گەورە ئەم ڕۆمانە مل کەچ بکات بۆ ئێوە )}.....

سەد کەس شەڕ دەکەن لەگەڵ چل هەزار پاشان سەردەکەون ...!!

ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نی‌یە ؟؟

ئایا سەد موجاهید دڵ‌و دەروونیان پڕ نەبووە لە ئیمان بەخوای گەورەو ؟؟ ئیمان بە پێغەمبەری دەست پاك‌و ڕاستگۆ ﷺ ؟؟

ئایا خەلیفەیان ئیمامی ئەبوبەکر نیە – خوا لێی ڕازی بێت – ئەم ئەبوبەکرەی ئاڵای ئیسلامی بەرزکردەوە لەسەر جیهان ، کاتێك خۆی لە مەدینەی پایتەختی جیهانی نوێیە بەدەستی خۆی مەڕ بۆ بێوەژنان دەدۆشی‌و ، بە دەستی خۆی هەویر بۆ بێباوکان دەشێلێت ؟؟

ئایا سەرۆکیان (خالیدی کوڕی وەلید) نی‌یە کەوا دەرمانی ستەم و زوڵم‌و دەست درێژی‌یەو شمشێری خوایە لەسەر ملی بێبڕوایی‌و نەفامی‌و تاریکی ؟؟

ئایا ئەمانە هەمووی ڕاست نین ؟؟

کەواتە ، هەڵیکە بای سەرکەوتن هەڵیکە بە توندی‌و بە بەهێزی و ئازایەتی (خالید) هەموو سەرکردە ڕۆمەکانی سەرسام کردبوو ، ئەمەش وایکرد یەکێك لە سەرکردەکان ناوی (جرجە) بوو داوا لە (خالید) بکات چاوی بە (خالید) بکەیت لە یەکێك لە ماوەکانی پشوودان لە نێوان جەنگەکە

کاتێك پێکگەیشتن ، سەرۆکی ڕۆمانی قسەکانی ئاڕاستەی (خالید) کردوو گوتی :-

(( ئەی (خالید)

ڕاستم پێ بڵێ‌و درۆم لەگەڵ مەکە چونکە مرۆڤی ئازا درۆ ناکات ئایا هیچ شمشێرێك لە ئاسمان بۆ پێغەمبەرەکەتان هاتۆتە خوارەوە بیدات بە تۆ ، گەیشتبێتە سەر ملی یەکێك ئەوا شکستی پێخواردوو بێ ؟؟ ))

(خالید) گوتی :-(نەخێر ...)

پیاوەکە گوتی :- (ئەی بەچی ناوت لێنراوە شمشێری خوا ؟ )

(خالید) گوتی :- ( خوا پێغەمبەرێکی بۆ ناردووین ، ئی‌وامان هەبوو بە ڕاستی زانی ئی واش هەبوو بەدرۆی خستەوە

من یەكێك بووم لەوانەی بەدرۆم خستەوە تاكو خوای گەورە دڵ‌ودەروونی ڕاكێشام بۆ ناو ئیسلامو هیدایەت دراین بە پێغەمبەرەكەی و موبایەعەمان كرد ... پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی كردم ، پێی گوتم : تۆ شمشێرێكی لە شمشێرەكانی خوا ، بەم جۆرە ناوم لێنرا ... شمشێری خوا ) ...

سەرۆكە ڕۆمانی‌یەكە گوتی :- بۆ (بانگەوازی چی دەكەن ... ؟)

(خالید) گوتی :- (بۆ یەكتاپەرستی و بۆ ئیسلام)

پیاوەكە گوتی : - ( ئەگەر یەكێك ئیمڕۆكە بێتە ناو ئیسلام لە پاداشتو چاكە جیاوازی لەگەڵ ئێوە نی‌یە ؟)

(خالید) گوتی :-( بەڵێ‌و .... زیاتریش)

پیاوەكە گوتی :- (چۆن ئێوە لەپێش ترن ؟؟)

(خالید) گوتی :- ( ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ) ژیاوین‌و ، نیشانەو موعجیزەكانمان بینی ، بە تەواوی ئەوەی بینیمان لێمان بینی ، گوێمان لێبوو لەمەی گوێمان لێبوو بە ئاسانی موسڵمان بووین ....

( بەڵام ئێوە نەبینیوتانەو نەگوێتان لێی بووە ، پاشان بە نهێنی‌یەكان بڕواتان هێناوە ، ئینجا پاداشتان گەورەترو مەزنتر دەبێت ئەگەر نیازو نهێنی‌یەكانتان بە ڕاستی بۆ خوا بێت) ....

سەرەك ڕۆمانی‌یەكە هاواری كرد ، بە ئەسپەكەیەوە بەرەو لای (خالید) هات‌و ، لە تەنیشتی وەستا : (ئەی خالید ئیسلامم فێر بكە !!)

موسڵمان بوو و .... دوو ڕكات نوێژی كرد ، لەم نوێژە زیاتر هیچ نوێژێكی نەكرد ، هەردوو سوپا دەستیان بە جەنگ كردەوە ، (جرجەی ڕۆمانی) شەڕی كرد لە ڕیزی موسڵمانان بۆ بەدواگەڕانی شەهادەت تاكو گەیشت و پلەی شەهیدی وەرگرت

* * *

پاش ئەم هەموو جەنگە كوشندەیە كەوا (خالید) سەركردەی سوپای موسڵمانان دەكات سەركەوتن لەسەر سەركەوتن بەدەست دەهێنێ لە نێوان سوپا درندەی ڕۆم كە لە گەورەیی و بەهێزی نەخشەی بۆ ناكێشرێ بێجگە لە ناخۆشی و ترس ، لەم سات‌و كاتانەدا لەناكاو پۆستەی نامەی خەلیفەی نوێ - گەورەی موسڵمانان ( عومەری كوڕی خەتتاب) دەگاتە جێ ..... تێیدا فاروق سڵاو دەنێرێ بۆ سوپای ئیسلام پرسەی سەرەخۆشی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەبوبەكری صدیق) - خوا لێی ڕازی بێت - دەكات ، پاشان فەرمان دەكات بە دەست كێشانەوەی (خالید) لە سەركردایەتی و دانانی (ئەبوعوبیدەی كوڕی جەڕراح) لە شوێنی

(خالید) نامەكە دەخوێنێتەوە ، بەزەیی بۆ (ئەبوبەكر) هاتەوەو دوعای تەمەن درێژی بۆ (ئیمامی عومەر) كرد پاشان داوا لە هەڵگری نامە دەكات ئەم نهێنی‌یە ئاشكرا نەكات لە لای كەس‌و لە شوێنێكی داناو فەرمانی پێكرد نەگەڕێتەوەو پەیوەندی لەگەڵ كەس نەكات ...

(خالید)ی سەرکردایەتی جەنگەکەی کردو مردنی (ئەبوبەکر) و فەرمانی (عومەر)ی شاردەوە تاکو سەرکەوتنەکە تەواو دەبێ کەوا نزیک بوو بە تەواوی شەڕەکە کۆتایی پێ بێت

ئیتر کاتی سەرکەوتن بەدەست هاتو ، ڕۆم شکستی خوارد قارەمانی ئیسلام (خالید) چووە لای (ئەبو عوبیدە)و سڵاوی سەربازی بۆ سەرکردەکەی بەجێگەیاند ( ئەبو عوبیدە) یەکەم جار وا گومانی برد ئەمە گاڵتەیەکە لە گاڵتەی سەرۆکان کەوا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە چونکە ئەم لەو بڕوایەدا نەبوو پاشان بینی ڕاستەو گاڵتەی تیا نییە ، نێوچەوانی (خالید)ی ماچ کردو ، ئینجا بەچاوی‌خۆی گەورەیی ئەدەب و مەزنی دەروونی (خالید)ی بینی

ڕیوایەتێکی مێژوویی تر هەیە دەڵێن نامەکە بۆ (ئەبو عوبیدە) نێردراوە بەڵام (ئەبوعوبیدە) نامەکەی نیشان نەداوە تاکو جەنگ کۆتایی پێ‌هاتووە

ئینجا شێوەی ناردنی نامەکە بەهەر جۆرێك بێت لە هەردوو لا گەورەیی و مەزنی ئەم پیاوە قارەمانە نیشان دەدا

لە ژیانی (خالید) نەزانراوە هەر هەمووی هەڵوێستی دڵسۆزانەو ڕاستگۆیانە نەبێت ، هەروەك ئەم هەڵوێستە .... ئینجا چ ئەمیر بێ و یاخود سەرباز ... ئەم هەڵوێستەش وای کردووە (خالید) بە سەرکەوتنێکی مەزن بەسەر دەروونی خۆی‌دا زاڵ بێت ، هەروەك ئەم سیفەتە بەرزە لە هەردوو خەلیفەی موسڵمانان ڕویدا بوو ئەمانەش (ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب ) بوون – خوا لێیان ڕازی بێت –

لەگەڵ ئەوەی ناموشۆی نێوان (خالید)و ئیمامی عومەر زۆر بەهێز نەبوو ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پاکی ئیمامی عومەرو دادوەری‌و مل کەچی و مەزنی بێ‌ئەندازەی ، هیچ کاتێك جێگای پرسیار کردن نەبوو لەلای (خالید)

لەگەڵ ئەمەشدا فەرمانی (ئیمامی عومەر) جێگای گومان نەبووە ، چونکە ئەم ویژدانەی فەرمانی بە ئیمام دەدا گەیشتبووە ئەوپەڕی مل کەچی بۆ خوای گەورە لەگەڵ دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و ئیستقامە ، ئینجا ویژدانی بەم جۆرە پاك‌و بێ‌گەرد زۆر کەمە ....

ئەمیری بڕواداران (ئیمامی عومەر) بەهیچ جۆرێك خوانەخواستە مەبەستی خراپ نەبووە بەرامبەر (خالید) ، بەڵام تەنها توندوتیژی لە شمشێرەکەی (خالید) بەدی دەکرد

بەڵگەشمان بۆ ئەمە ئەوەیە کاتێك (ئیمامی عومەر) وای بەباش زانی بە (ئیمامی ئەبوبەکر)ی گوت کەوا (خالید)لابدات پاش کوشتنی (مالك کوڕی نویرە) ، پێی گوت :– (توندی هەیە لە شمشێرەکەی خالید)

خەلیفە (ئەبوبەکر) وەڵامی دایەوە :– ( ناتوانم شمشێرێك بهێنمە خوارەوە پاش ئەوەی خوای گەورە بەرزی کردۆتەوە لەسەر ملی کافران)

لێرەدا (ئیمامی عومەر) نەیگوتووە لە خودی (خالید) توندی هەیە ، بەڵکو توند مەبەستی شمشێرەکەیە

ئەم وشانە لە ڕەوشتی گەورەی بڕواداران کەم ناکاتەوە بەڵکو گەورەییکە بۆ (خالید) (خالید) پیاوی جەنگ بوو لە بێشکەوە تاکو بەردی ئەلحەد پەروەردەو ئاوەهاو گەورەبوونی و ژیانی پێش ئیسلام و پاش موسڵمان بوونی هەر هەمووی قوتابخانەی سوارچاکی و ناخۆشی و زۆرزانی بووە

پاشان چالاکی پێش ئیسلام بوونی و ئەم جەنگانەی دژی پێغەمبەر ﷺ و یاوەرەکانی کردوویەتی و ئەو لێدانەی شمشێرەکانی ئاڕاستەی بڕوادارانی کردبوو کاتی بێباوەری هەر هەمووی ئەمانە ویژدانی (خالید)یان گران کردبوو ئەمجارەیان شمشێرەکەی لە ملی گاوران و کۆڵەگەی هاوبەش پەیداکەران گیر بوو بێهێزی کردن هەروەك بەیادتان دادێت کاتێك یەکەم جار بوو بە موسڵمان هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوت :-

( ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ... داوای لێخۆشبوونم بۆ بکە بۆ هەموو ئەو تەگەرانەی خستبوومە سەر ڕێگای خوا ) ، لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێدا ئیسلام گوناهی پێش خۆی دەسڕێتەوە ، ئەوەبوو (خالید) داوای دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ بکا ئەویش داوای لێخۆشبوونی بۆ کرد لەوەی کە هەردوو دەستەکانی پێش موسڵمان بوونی پێکردووە .... !!

هەروەها کاتێك شمشێر دەکەوێتە دەستی سوارچاکێکی بلیمەت و بێوێنەی وەکو خالیدی کوڕی وەلید پاشان دەستێك دەیجوڵێنێت بەستراوە بە ویژدانێکی گڕگرتوو بە گەرمی و بە پاکی ، پڕ بوو لە گوێڕایەلی تەنها بۆ ئایین و دەوردراو بە دوژمنایەتی و موئامەرات ، زۆر زەحمەتە ئەم شمشێرە واز بهێنێت لە ڕێبازی توندوتیژی بێوێنە

هەروەك بینیمان شمشێری (خالید) بووە هۆی ئەوەی خاوەنەکەشی تووشی ماندووبوون بکات . ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاش فەتحی مەککە ڕەوانەی لای چەند هۆزێکی عەرەبی نزیکی کرد لە مەککە وپێی گوت :- { من بە بانگخواز ڕەوانەت دەکەم ، نەك جەنگاوەر} ، بەڵام شمشێرەکەی بەسەرا زاڵ بوو کاری جەنگاوەری پێگێڕا ، نەیتوانی کاری بانخوازی بکات کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردبوو ، وای کرد پێغەمبەر ﷺ تووشی ئازارو خەم بێت کاتێك بەم کارەی (خالید)ی زانی و ڕووی لە قیبلە کردو دەستی بەرز کردەوە ، داوای لێبووردنی کرد لە خوای گەورە بەم فەرموودەیە :-

{ پەروەردگارا من داوای بێتاوانی دەکەم لەم کارەی (خالیدی کوری وەلید) کردوویەتی }

پاشان ( عەلی کوڕیئەبو طالیب)ی ڕەوانە کرد خوێن وماڵیدانێ ... وەدەڵێن (خالیدی کوری وەلید) خۆی بێتاوان دەکات کەوا (عبداللەی کوڕی حوذافەی سەهمی) پێی گووتوە :- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردوویت بەشەڕ ئەگەر نەهاتنە ناو ئیسلام

بەم جۆرە (خالیدی کوری وەلید) وزەیەکی نائاسایی هەڵگرتبوو ، هەموو هێزو توانای خۆی بەکاردەهێناو بە پەرۆش بوو بۆ تێکدانی جیهانە کۆنەکەی

ئەگەر بینرابایە کاتێك (خالیدی کوری وەلید) بتی (عوززا)ی دەڕوخاند کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ناردبووی بۆ ڕووخاندنی ... کاتێك کوتەکەکەی دەهێناو دەبرد لەسەر ئەم دروست کراوە بەردینە ، دەتگووت شەڕ لەگەڵ سوپایەك بە تەواوی دەکات و سەریان پەل دەدا و کوژراوەکان دەکەونە سەر زەوی بەدەستی ڕاست و چەپ پێیەکانی لێیان دەداو ، هاواری دەکردە سەر پارچە هەڕوون بووەکان :- { ئەی عوززا کوفرت پێدەکەم ، بە پاکت نازانم ، من دەیبینم خوا ڕیسوات دەکا }، پاشان ئاگری بەردا خۆڵەکەی ئینجا هەموو پاشماوەکانی بێباوەری لە تێڕوانینی (خالیدی کوری وەلید) وەکو (عوززا) بوون جێگایان نەدەبۆوە لە جیهانی نوێی کەوا (خالیدی کوری وەلید) لەژێر بەیداخی وەستا بوو ....

ئەگەر ئێمەش لەگەڵ ئەمیری بڕواداران (عومەری کوڕی خەتاب) بڵێین شمشێری (خالیدی کوری وەلید) ئەم تووندو تیژییەی ئەمێنێت دەبێت لەگەڵ ئەمیری بڕواداران بڵێین و دووپاتی بکەینەوە بەم وتەیە :-

{ دەبێت ئافرەتان دەستەوەستان بوەستن بۆ ئەوەی پیاوی وەك خالیدیان ببێت}

ئەم ڕۆژەی (خالیدی کوری وەلید) گیانی پاکی سپارد (ئیمامی عومەر) زۆر زۆر بۆی گریا ، پاشان خەڵك زانیان هۆی گریانی (ئیمامی عومەر) تەنها لەبەر ئەوە نەبوو گیانی لەپێش چاوی وون بووە ، بەڵکو لەبەر ئەوە گریا مردن دەرفەتێکی لەدەست دا ئەگەر هاتوو لە ژیاندا بمابایە بڕیاری دەدا لێپرسراوەتی بۆ بگێڕێتەوە پاش ئەوەی خەڵك زۆر پێی سەرسام بوون و هۆی لابردنی زانرا

بەڵێ پاڵەوانی مەزن ڕۆیشت بۆ شوێنی خۆی لە بەهەشت

ئێستاکە کاتی ئەوەیە پشوو بدات و بحەسێتەوە پیاوێکی وابوو نەیدەهێشت دوژمنانی خوا لەسەر زەوی بحەسێنەوە ، بەڵێ ئێستاکە باجەستەی ماندووی تۆزێك بخەوێت ؟ ئەم پیاوە بوو هاورێکان و دوژمنەکانی بەم جۆرە وەسفیان دەکرد کەوا:-

{ پیاوێك نەخۆی دەخەوێت و ، ڕێگا نادا بە کەسیش خەوی لێبکەوێت }...

خالیدێك ئەگەر خوا دەرفەتی ژیانی بدابایە بەردەوام دەبوو لە ڕوخاندنی هەموو بۆماوە بۆگەنە کۆنەکان و بەردەوام دەبوو لەسەر کارەکەی کە جیهاد لە ڕێگای خواو ئیسلام بوو....

گیانی ئەم قارەمانە مەزنە هەموو کات و ساتێك لەناو دڵانەو لەیاد ناچێت ، بە تایبەتی لەکاتێ کە دەنگی ئەسپ و بریقەی شمشێرو دەنگی گوللە و ئاڵای یەکتاپەرستی دەشەکێتەوە لەسەر سوپای ئیسلام ، (خالیدی کوری وەلید) لە وتەیەك دا دەڵێت :-

{ ئەم شەوەی کەوا بەزاوا دەبم ، یان مزگێنی لەدایك بوونی کوڕێکم دەدەنێ ، لەلام خۆشترە شەوێکی زۆر سارد لەگەڵ پۆلێك لە کۆچکردووەکان بم لەگەڵیان بەیانییەك بەسەر دوژمن دا بدەم }

لەبەر ئەوە ، ناخۆشترین شت لە ژیانی ئەوە بوو بمرێت لەسەر جێگا ، لەکاتێکدا هەموو ژیانی لەسەر پشتی ئەسپەکەی و ژێر بریقەی شمشێرەکەی بەسەر بردووە

ئەم قارەمانە بوو غەزای کرد لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، خەڵکە هەڵگەڕاوەکانی شکست پێخواردو ، عەرشی فارس و ڕۆمەکانی لەگەڵ زەوی کردەیەکو ، بە ئەسپەکەی خاکی عێراق و شامی هەنگاو بە هەنگاو بڕی ، تاکو هەمووی خستە سەر خاکی ئیسلام

لە کاتێك ئەمیر بوو باروناخۆشی سەربازەکانی هەڵدەگرت ، لە کاتێکدا سەرباز بوو گوێڕایەڵی ئەمیرو سەرۆکەکەی هەڵدەگرت

هەروەها گەورەترین کارەسات لە ژیانی(خالیدی کوری وەلید) ئەوەیە (خالیدی کوری وەلید) لەسەرجێگا دەمرێت ......!!

لە کاتێکدا فرمێسك لەچاوە گەشەکانی خالید جۆگەلە دەکاو دەڵێت :-

{چەندەها دیمانەم بینی ، بەرەو پێش ڕۆیشتم ، هیچ شوێنێك نییە لە جەستەم شوێنەواری لێدانی شمشێر یان ڕم یان تیری پێوە نەبێت پاشان وا ئێستا پێویست کراوە لەسەر جێگا بمرم هەروەك چۆن وشتر دەمرێت ، خەو لەچاو ترسنۆکان نەکەوت !!! }

چەند وشەیەك لە شوێنیوا کەس ناتوانێت دەریببڕێت ، بێجگە لەم پیاوە نەبێت لەم کاتەی پێشوازی لە کۆچ کردن دەکات ، دەست دەکات بە وەسیەت کردن ، ئایا دەزانن بۆ خودی (عومەری کوڕی خەتتاب) دەکات !!

ئایا دەزانن چی لە دوای خۆی بەجێدەهێڵێت ؟

وشترەکەی و چەکەکەی !!

هیچی تر نا ، لەم شتانەی کەوا پێویستی خەڵکن وسوودی لێدەبینن !!

پیاوێکی وابوو لە کاتی ژیانیدا خەیاڵی بۆ هیچ شتێك نەدەبرد ، تەنها پەنا بردن بە سەرکەوتن نەبێت بەسەر دوژمنانی خوا دڵی بە هیچ خۆشییەکی دنیا خۆش نەدەبوو هەوڵی بۆ نەدەدا تەنها یەك شت نەبێت ، پێش مردنی هەوڵی بۆداو پێوەی ماندوو بوو ، ئەمەش سەرپۆشەکەی بوو لە جەنگی یەرموك لێی کەوت ، دڵی پێی ناخۆش بوو و خەڵك زۆر لە دوای گەڕان ، کاتێك لێی نائومێد بوو گوتی :-

{ چەند موویەکی سەری پێغەمبەری خوای ﷺ لەناو بوو و دڵم پێی خۆش دەبوو ، سەرکەوتنم بۆ دەهات }

لە کۆتاییدا لاشەی بێگیانی قارەمان هەڵگیرا لەسەر یاوەرەکانی و دایکی قارەمانی کۆچکردوو لەچاوی خەم و فرمێسکەوە ماڵئاوایی لێکرد بەم هۆنراوەیە

| | |
|---|---|
| أنت خير ألف ألف من القــــوم | اذا ما كبت وجوه الرجـال |
| أشجاع ...؟ فأنت اشـجع من ليث | غضنفر يذود عن أشـبـال |
| أجواد ....؟ فأنت اجود من سيل | غامـر يسـيل بين الجبـال |

کاتێك (ئیمامی عومەر) گوێی لەم هۆنراوەیە بوو دڵی گڕی لێهەڵساو ، فرمێسك لە چاوەکانی جۆگەلەی کردو گوتی :-

{ڕاستی گوت سوێند بەخوا وابوو }

قارەمانیان بەخاك سپارد لە شاری (حمص)ی ولاتی شام

یاوەرەکان بە خشوعو مل کەچی‌یەوە وەستانو ، دونیا کڕوکپو مات بوو هیچ دەنگێك نەدەهات تەنها حیلەی ئەسپێك نەبێت ،قەرچ‌وقەڕاسەی پساندبوو و قۆشمەی دەکرد ، هەنگاو بەهەنگاو کوچەکانی شارەکەی دەبڕی لە دوای لاشەی خاوەنەکەی بە بۆن بۆنی دەکردو هەڵدەهات بۆی ...

کاتێك گەیشتە کۆمەڵە بێدەنگەکە کەوا هێشتا لێواری گۆڕەکە تەڕ بوو سەری وەکو ئالا دەهێناو دەبردو دەنگی حیلەی دەهات هەروەکو بڵێیت خاوەنەکی زیندووەو لەسەر پشتێتی‌و عەرشی فارس‌و ڕۆم دەلەرزێنێ‌و ، خەیاڵەکانی بتپەرستی لەناو دەباو. هەموو هێزێکی کوفرو تاریکی لە ڕێگای ئیسلام ڕادەماڵێت ... هات بۆ سەر گۆڕەکەو ، هەردوو چاوەکانی لەسەر لانەدەبردو ، سەری بەرزو نزم دەکردەوە بەرامبەر گەورەو قارەمانەکەی و سلاوی ماڵئاوایی لێدەکرد !!

پاشان ئەم بەستەزمانە بەوەفایە وەستاو نێوچەوانی بەرزکردەوە بەلام چاوەکانی فرمێسکی خۆشەویستی‌بۆ هەڵدەڕشت

بەلام ... ئایا کەس دەتوانێت پاش (خالیدی کوری وەلید) سواری سەر پشتی ئەم ئەسپە بێت ؟؟

ئایا پشتی ڕادەگرێ بۆ کەسێك بێجگە لە (خالیدی کوری وەلید) !!

خوات لەگەڵ ئەی قارەمانی سەرکەوتن خوات لەگەڵ

یادت بەخێر ئەی ئەمری بۆن خۆش‌و کۆڵنەدەر ئەی خالید ؟

لێرەدا لەگەڵ ئەمیری بڕواداران دەڵێین و دووپاتی دەکەینەوە بە چەند ووشەیەکی پرشنگدارو خۆشەویستی

ڕەحمەتی خوا لە باوکی سلێمان لای‌خوا باشترە لەوەی کە تیای بوو ، بەپاکی ژیاو ، بە بەختیاری مرد

٤٢

# ئەبو لوبابە
# بەشیری کوڕی عەبدومونذیر

ئەو بڕوادارەی خۆی فەرمانی لەسەر دەروونی خۆی دا بەسزا ...!!

## ٤٢
# ئەبــو لوبابــە
# بەشــیری کوڕی عبــدولــمونــذیــر

## ئەو بڕوادارەی خۆی فەرمانی لەسەر دەروونی خۆی دا بە سزا !!

تەوبەو پاشەگەزبوونەوە بریتی‌یە لە کاردانەوەیەکی ویژدانی لە لایەن مرۆڤەوە ، ئەمەش لە نێوان بەندەکانی خوا دەگۆڕێ بە گوێرەی پلەی بەگوێ‌کردنی هەستی دەروونی ویژدانی ئەم مرۆڤە

ئینجا ئەم هەستە دەروونی‌یە لە لایەن بڕوادار بەرزترین شوێن و پاکترین پلەی هەیە ، ئەمەش لە هەستی (باوکی لوبابە) – خوا لێی ڕازی بێت – بە جوانترین شێوەو خاوێنترین وێنە بە دیارکەوت ئەمەش ئەگەر ئەوە مانایەك بگەیەنێت ئەوا مانای وایە ئیمانی (باوکی لوبابە) گەیشتۆتە ئەوپەڕی پاکی و بێ‌گەردی هەستی بەسۆز

بەڵێ ئەم یاوەرە بەڕێزە کارێکی هەڵەی کرد بەڵام نەك بە نیازێك ، بەڵکو یەکسەر هەستی بەم هەڵەیە کردو ، بە دەروونی و ویژدانی خۆی داهاتەوە ، هەروەك کۆمپیوتەر ڤایرۆسی کەوتبێتە ناویەوە ، فەرمانی کرد بەخودی خۆی بە سزایەکی توونـد لەسەرخۆی ، دەروونی خۆی گرت بە تۆڵەسەندن ، پاشان چاوەڕێی لێخۆشبوونی کرد لە لایەن خوای بەخشندەوە

خودای گەورەش هەموو کات ئامادەیەو لەلای چاکی گومانی بەندەکانیەتی ، لێبووردن هاتە خوارەوەو بڕیاری لێخۆشبوونی بۆدرا

بەم جۆرە دەروونی ئەبو لوبابە داکەوت و دڵی‌خۆش بوو و سینەی فراوان بوو و گەڕاوە کۆشی بڕوادارە ڕاستەقینەکان پڕ لە لێخۆشبوونی خودای جیهانیان

خوای گەورەش دەفەرموێت :

﴿ الا من تاب و آمن و عمل صالحا فأولئك يبدل الله سيئاتهم حسنات وكان الله غفورا رحيما ﴾

واتە :– تەنها ئەو کەسانە نەبێت پاشگەز دەبنەوەو بڕوا دەهێنن و کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن ، ئەوانە خودا خراپەکانیان بە چاکە بۆ دەگۆڕێتەوە ، وە هەر خوای گەورە بەخشندەو بە بەزەیی‌یە

ئەبو لوبابە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی بەشیر کوڕی عبدولمونذیر کوڕی رفاعە کوڕی زنبەر کوڕی ئومەییە لە نەوەی عەمر کوڕی عەوف دایکی ناوی نوسەیبە کچی زەید کوڕی ضوبەیعەیە

(ئەبو لوبابە) زەینەب کچی خینـدام کوڕی خالیدی هێنا ، دوو منداڵی لێ‌بوو یەکێکیان کچ بوو ئەویتریان کوڕ بوو ، کوڕەکە ناوی (السائب) بوو بەڵام کچەکە ناوی (لوبابە) بوو نازناوی بە کچەکەیە لەبەر ئەوەی ئەویان بە تەمەن گەورەتر بوو هەروەها

دوو برای هەبوون بەناوی (موبەشیر)و (رفاعە) هەردووکیان لەخۆی گەورەتر بوو ، (رفاعە) پەیمانی عەقەبەی بینیو موبایەعەی داو یەکێك بوو لە پێشەنگەکانو ئەم برایەیان بوو مزگێنی ئایینی نوێی‌دا بە برایەکانیو ، ئەوانیش بەدوای کەوتنو ، جەنگی بەدری بینیو لە شەڕی ئوحد شەهید کرا بەڵام هەرچی موبەشیر بوو لە جەنگی بەدر شەهید کرا

(ئەبو لوبابە) لە شارێك پەروەردە بوو لە ناوەندی دۆخێکی کۆمەڵایەتی ، جولەکە بە فێڵو بە سامان لە سەری زاڵ بوونو لەگەڵ کەسوکاری جێگیر بوو لە ناوەدانی (بەنی قریظة) بەمە بوو بە هاوپەیمانو نزیكو دوور هاموشۆی دەرکردن

کاتێك (موصعەبی کوڕی عومەیر) هاتە ناو شاری مەدینە مزگێنی ئیسلامی پێدانو فێری ئایینی کردن ، قسەو بیروڕاکانی لە دڵو دەروونی (ئەبو لوبابە) خۆی گرت ، بەڵام وەکو خۆی مایەوە هەرچەندە لەسەر پەیوەندیو ئەم وەفایە مایەوە کەوا لەمەوپێشیش بەستبووی ، تاکو براکەی (رفاعە) بڕوای هێنا بە خواو پێغەمبەرەکەیو موبایەعەی کرد لە عەقەبەو گەڕاوە بۆ مەدینەو بوو بە پێشەنگی نەتەوەو کەسوکارو هۆزەکەی ، لەم کاتەدا (ئەبو لوبابە) کاروانی بەڕێکەوت بۆ دەریای ئیمانو کۆمەڵی مسوڵمانان

(ئەبو لوبابە) (خوای لێ ڕازی بێت) یەکێك بوو لەوانەی لە پێشەوەی هەموو کەس پێشوازی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی گەیشتنی لە موهاجیر بۆ مەدینە ، ئیتر لەم کاتەوە بوو بە نزیکترین کەس لە پێغەمبەرو ناوی فێنکی کانیاوی لە ئیمانەکەیو زانستو گەورەیی‌یەکەی خواردەوە ، پەروەردە بوو بە ڕەوشتی قورئانو پابەند بوو بە ڕێبازی ئیسلام ...

کاتێك جاڕی بانگهێشتنی جیهاد لێدراو ، پێغەمبەر ﷺ یاوەرەکانی ئامادەکرد بۆ جەنگی بەدرو دەرچوون لە شاری مەدینەو بەرەنگاری کاروانی (ابو سفیان ) بوونەوە ، ئەبو لوبابە مل کەچ بوو بۆ ئەم بانگەو لەگەڵ برا موسڵمانەکانی دەرچوو بۆ ئەم جەنگە .

کاتێك گەیشتنە شوێنێك بە ناوی (الرَوحاء) پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی (ئەبو لوبابە)ی کرد پاشان فەرمانی پێکرد بە گەڕانەوەی بۆ شاری مەدینەو فەرمانی‌دا لە شوێنی ئەو دابنیشێ لەسەر کاروباری خەڵك تاکو خۆی دەگەڕێتەوە

لێرەدا سەرچاوەکانی مێژوو هیچ ئاماژەیەکیان نەکردووە بۆ هۆیەکی دیار لەسەر ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺ ، بەڵکو تەنها هەواڵەکە دراوە بە بێ ئەوەی هچ ئاماژەیەکی بۆ بکەن یان هۆیەکەی باس بکەن و لێی بکۆڵنەوە

بەڵام ئەو سەرچاوانەی دەڵێن کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەوەی خوای گەورە سەرکەوتنی بە دەست هێنا بەسەر دوژمنەکانی‌دا ، فێڵو تەڵەکەی دوژمنانی ڕەوانەی ناو سەنگەرەکانی خۆیان کردەوەو ، غەنیمەو پاشماوەکانی لە کەلوپەلی پێویستی‌یەکانیان کەوتە بەردەست بەشەکانی دابەش کردن بەسەر ئامادەبووان ، بەش وپاداشتی (ئەبو لوبابە)یان وا دانا هەروەك دای دەنێنو ، ئەم فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەویش دەگرێتەوە کە دەفەرموێت :-

{ لقد اطلع الله على أهل بدر فقال : اعملوا ما شئتم فقد غفرت لكم }...

ئەوەی گومانی تێدا نییە هەڵبژاردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ (ئەبو لوبابە) وەکو کاربەدەستێك لەسەر شاری مەدینە ئەو ماوەی خۆی چوو بوو بۆ دەرەوە دووشت دەگەیەنێت :-

**یەکەمیان** :- بڕوایی پێغەمبەر ﷺ بە سیفەت و لێهاتوویی (ئەبو لوبابە) بۆ ئەوەی هەڵسێت بەم کارە ، ئەمەش کارێکی گران و ناخۆش بوو ، سەبارەت بە لێهاتوویی کەمتر نەبوو لە هیچ لێپرسراو و سەرکردەیەکی تر لەبەر ئەوەی سەرکردایەتی خەڵك لە کاتی ئاشتی و هەڵسوڕاندنی کاروباریان و چارەسەری گرفتەکانیان و دەستەبەر کردنی هۆیەکانی ژیانیان ، کارێکە پێویستی بە ژیری و زیرەکی و تاقیکردنەوەی پێشوو هەیە ، بێجگە لە هەموو ئەمانەش خزمەتی پێشووی ئەم پیاوە لەناو میللەتەکەی و سەرمەشقی یان

**دووەمیان** :- خودانەخواستە لەبەر ئەوە نەبووە (ئەبو لوبابە) توانای شەڕی نەبوو بێ یان لە گۆڕەپانی جەنگ ترسنۆك بێت چونکە -خوا لێی ڕازی بێت - بەشداری زۆر جەنگی کردووەو هەر لەهەموو گۆڕەپانەکان جێگاو شوێنی خۆی دیار بووەو ، شەڕێکی وای کردووە شایەدی سوارچاکی و قارەمانیەتی بۆ بدرێت لە ئازایەتی

کەواتە ئەگەر ئەمە ڕێنمایی‌یەك لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو بێت بۆ (ئەبو لوبابە) کەوا کاروباری خەڵکی مەدینە بگرێتە دەست ، تەنها بۆ ئەم کارە بووە کەوا خێری تێدا بووە بۆ ئیسلام و موسڵمانان

بەڕاستی بنەماڵەی عبدالمنذر وەفای ئەم بەیعەی دایان بە پێغەمبەر ﷺ بەدیارکەوت ، کەوا برای گەورەی بەناوی موبەشیر لە جەنگی بەدر شەهید بوو و ، هەروەها هەردوو برای یاوەر (رفاعەو ئەبو لوبابە) پاش ئەوەی براکەشیان شەهید بوو، شەهیدی براکەیان وای نەکرد ئەو دوو برایەدەرنەچن لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە جەنگی ئوحد بۆ جەنگی هاوبەش پەیداکەران ، بەڵکو هەردووکیان سوور بوون لەسەر شەهیدبوون لە ڕێگای خوا ، لە ڕیزی پێشەوەی جەنگ بوون و ، پشتیان نەکرد لە دوژمن کاتێك هەندێك لە خەڵکان پشتیان هەڵکرد ، هەروەها پێغەمبەریان ﷺ لە تیرو شمشێر و ڕمەکان پاراست ، تاکو براکەی تریشی (رفاعە) - خوا لێی ڕازی بێت - ، گیانی خۆی بەخشی ، شەهید بوو لە ڕێگای خوا

هەروەها ئەم ڕۆژەی پێغەمبەر ﷺ دەرچوو بۆ جەنگی (السّویق) ئەبولوبابەی لە مەدینە لە شوێنی خۆی بەجێهێشت

لە ڕۆژی (قریظە)ش جولەکە ئەم پەیمانەی دابوویان لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ شکاندیان ئەوەبوو موسڵمانیان خستە ناخۆشیەکی ترسناك ، لە کاتێکدا قورەیش و هۆزە هاوپەیمانەکانیان (الاحزاب) کەوا بەرامبەر موسڵمانان وەستا بوون تەنها خەندەق جیای کردبوونەوە ، وە (بەنو قریظە)ی جولەکە لە پشتەوەیان پەیمانیان شکاندو خیانەتیان کرد لەگەڵ ئەو بەڵێنەی دابوویان

پاش ئەوەی خوای گەورە پیلانی قورەیش و هۆزە هاوپەیمانەکانی لەسەر لابردن ، ئەم ناخۆشی و تەمەیان لەسەر لاچوو ، پێغەمبەرو یاوەرەکانی گەڕانەوە بۆ مەدینە

(جوبرائیل) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ کاتێك لەماڵەوە بوو فەرمانی خوای پێگەیاند کەوا دەربچێت بۆ شەڕی (بنی قریظە)ی ناپاکو ، تەمبێیان بکات

پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆیەکی توندی دان ، کاتێك نائومێد بوون پیاوێکیان نارد بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بەناوی (شاس کوڕی قەیس) بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بکات پێیان گووت ئەوان ئامادەن ڕازی بن بەمەی (بنو النضیر) پێشتر پێی ڕازی بوو نیە ، پێغەمبەر ﷺ ڕازی نەبوو بەوەی خوێنیان بپارێزیو ئافرەتو نەوەکانیان بداتەوە دەست ، ئاگاداری کردنەوە لەسەر زمانی (شاس کوڕی قەیس) لەسەریان پێویستە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕازی بن

لەم کاتەدا چوونە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوایان لێکرد( ئەبو لوبابە) بێت بۆ لایان و لە کاروبارەکانیان ڕاوێژی پێبکەن - خوا لێی ڕازی بێت - چونکە ئامۆژگاری دەکردنو ماڵو منداڵو خێزانی هەمووی لە لای ئاوەدانی (بەنو قریظە) بوون . هەروەها جولەکە هاوپەیمان بوون لەگەڵ هۆزی ئەوس ئەویش لەوان بوو

پێغەمبەری خوا ﷺ ناردیە لایانو ، کاتێك جولەکە بینییان پیاوەکانیان بۆی هەستانەوەو ئافرەتو منداڵەکانیان بە هەلاتنو گریان و هاوارەوە هاتن بۆ لای ، سکالای ئەوەیان کرد کەوا ئابلۆقەیەکی توند دراون ، بەم جۆرە (ئەبولوبابە) دڵی بۆ سووتانو سۆزی بۆیان هەڵسا

گەورەی جولەکەکان (کەعب کوڕی ئەسەد) گووتی :-

- ئەی (ئەبولوبابە) نێوانی ئێمەو خۆت زانیووە ، ئابلۆقە زۆری بۆ هێناوینو بە فەوتانی داوینو ، موحەممەد ﷺ دەورەمان بەرناداو وازمان لێناهێنێ تاکو نەچینە ژێر فەرمانیەوە ، ئەگەر وازمان لێ بهێنێت خۆمان دەگەیەنینە خاکی شام یان خەیبەر

لە خاکی ئەو نزیك نابینەوەو جارێکی تر لە لای کۆنابینەوە ئایا تۆ چۆنی تێ دەڕوانی ؟؟ ئێمە تۆمان لەسەر خەڵك هەڵبژاردووە ئایا بچینە ژێر فەرمانی موحەممەد ؟

ئەبولوبابە گووتی :- بەڵێ بڕۆنە ژێر فەرمانی ئەگەر نا ( ئاماژەی بۆ قوڕگی خۆی کرد بە ئاماژەی سەربڕین )

* * *

(ئەبولوبابە) - خوا لێی ڕازی بێت - هەستی بە هەڵچوون کردو پەشیمان بۆوە ، گەڕایەوەو گوتی :-

﴿ انّا للّه وانّا الیه راجعون ﴾

کەعب کوڕی ئەسەد گوتی :- چیتە ئەی (ئەبولوبابە) ؟؟

(ئەبولوبابە) گوتی :- ناپاکیم کرد لەگەڵ خواو پێغەمبە ر ﷺ

بەڵێ ئەمەیە حاڵی بڕواداری ڕاستەقینە ، بەسەر هەڵەیەك دا ناڕوات تاکو بەم خلیسکانو لادانو شەپۆلە ئارەزووەدا نەچێتەوە ، بەڵکو بەکاری ئاگادارکردنەوەی ویژدان دەزانێت تەرازووی هەقو ناهەقی تێکەڵ بەیەك بووەو ، بەزووترین کات بە خودی خۆی گوناهەکانی دەسڕێتەوە پاشان گەڕایەوەو چاوەکانی فرمێسکی لێ

دەهاتە خوارەوە و نەیدەزانی بۆ کوێ دەچێت و تووشی بە تووشی پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوو و ، رووی کردە مزگەوت

(ئەبولوبابە) – خوا لێی رازی بێت – هەستی کرد بەوەی هەڵەیەکی کردووە کەوا ئاماژەی کردووە بۆ قورگی بە ئاماژەی سەربڕین ، هەروەك بڵێیت جولەکە بە نیازی ئەوانی زانیووە بەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ سزاو تۆڵەیان لێدەکاتەوە

(ئەبولوبابە) – خوا لێی رازی بێت – ڕۆیشت بۆ مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەستایەوە بە کۆڵەگەیەك (عمود) لە کۆڵەگەکانی کەوا کەوتبووە لای دەرگای (ام سلمە) – خوا لێی رازی بێت – ئیتر پاش ئەم ڕووداوە ئەم کۆڵەگەیە ناونرا بە کۆڵەگەی (ئەبولوبابە)

کاتەکەش زۆر گەرم بوو ، بەستانەوەکەشی – خوا لێی رازی بێت – ، بەزنجیرێکی ئاسنی زۆر قورس بوو و دەیگوت :-

– سوێند بەخوا تامی خواردن و ئاو ناکەم تاکو دەمرم ، یاخود خوا لەسەر ئەم کارەی کردووم لێم خۆش دەبێت ...

هەروەها پەیمانی‌دا بە خوای گەورە جارێکی تر نزیکی ئاوەدانی (بەنی قریظە) نەکەوێتەوە بە هیچ جۆرێك ، نەبینرێ لە شارێك خەڵکەکەی ناپاکی‌یان کردبێت لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی .

(ئەبولوبابە) – خوا لێی رازی بێت – بەوەفا بوو بۆ ئەم دوو پەیمانەی دای ، هەر لە ژێر کۆتەکەوە مایەوە خوای گەورە لێی خۆش بوو ، ئیتر نەیانبینی‌یەوە لە شارێك بە دەگمەن گومانی هاوبەشی و کوفرو دژایەتی خواو پێغەمبەری لێ بکرێت

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم هەواڵەی پێگەیشت و ، ئایەتی خوای گەورە دابەزی :-

﴿ یا أیها الّذین آمنوا لا تخونوا اللّه و الّرسول و تخونوا أماناتکم و أنتم تعلمون ، انّما أموالکم و أولادکم فتنة و اللّه عنده أجر عظیم ﴾

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

– ئەگەر بهاتبایە لام لێی خۆش دەبووم ، بەڵام ئەوەی کردوویەتی ئەوا کردوویەتی من بە دەستی خۆم ئازادی ناکەم تاکو خوای گەورە تەوبەی لێ قبوڵ دەکات

(ئەبولوبابە) – خوا لێی رازی بێت – ماوەی دەشەو و هەندێك بەم کۆت و زنجیرە مایەوە تامی خواردن و خواردنەوەی نەکرد ، هەموو کاتی نوێژەکان خێزانەکەی دەهاتە لای و دەیکردەوە ، پاشان دەگەڕایەوە و دەیبەستەوە بە کۆڵەگەکەوە ، تاکو هێزی لێ بڕاو توانای بە پێ وەستانی نەما و ، لەهۆش خۆی دەچوو

پاشان خوای گەورە تەوبەی (ئەبولوبابە)ی دابەزاند بە قورئان لەسەر پێغەمبەری ﷺ ، ئەمەش لەماڵی – ام سلمە – بوو – خوا لێی رازی بێت –

– ام سلمە – دەڵێت :- گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی لە خۆشی تەوبە پێدەکەنی ، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر بڕواداران بەسۆزو بە بەزەیی بوو ، منیش گوتم :-

– ئەی‌پێغەمبەری خوا ﷺ بەچی پێدەکەنی خوا بە پێکەنینت بێنێت ؟

ئەویش فەرمووی :- تەوبەی (ئەبولوبابە) گیرا کرا - ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە :-
﴿ وآخرون اعترفوا بذنوبهم خلطوا عملا صالحا و آخر سيئا عسى اللّه أن يتوب عليهم ان اللّه غفور رحيم ﴾
گوتم :- مزگێنی پێنەدەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟
فەرمووی :- بەڵێ ئارەزووی خۆتە
- ام سلمه - هەڵسایەوە لەپێش دەرگاکەی و گوتی :-
-مزگێنی - خوا تۆبەی لێ قبوڵ کردوویت
(ئەبولوبابە) هەر کە گوێی لە قسەی (ام سلمه) بوو ئیتر لە کەیفوخۆشیان ئاو لە چاوەکانی هاتە خوارەوە و ، لە هۆش خۆ چۆوە
ئەمە بوو وای کرد(ئەبولوبابە) چەند شەوو ڕۆژ بەرگری ئەم هەموو ناخۆشی و ماندووبوونە بکات ، لە خواردن و خواردنەوە و خۆشی لەش بێبەش بوو ، ژیانی پڕ بوو لە دڵەڕاوکێ و سزای توندی ویژدان ، تاکو مزگێنی لێخۆشبوونی بۆ هات و دڵی حەسایەوە
- نەخێر ، سوێند بەخوا لەخۆمی ناکەمەوە تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە لەشم نەکاتەوە
پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لای و کۆتەکەی لە لەشی کردەوە ، (ئەبولوبابە) گوتی :-
- ئەی پێغەمبەری خوا تەوبەکەم بەمە تەواو دەبێ واز بهێنم لە ئاوەدانی ئەو میللەتەی کەوا لەسەریان تووشی ئەم گوناهە بووم ، ئەمماڵەشم بەجێبهێڵم ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :- وا باشە سێیەکی ماڵەکەت ببەخشی
ئینجا باشتر وایە ئەم بەسەرهاتە بۆخودی (ئەبولوبابە) بەجێبهێڵین و خۆی بۆمان باس بکات دەڵێت :-
- من لە بارێکی مەزن و زۆر گەرم دابووم چەند شەوان خواردن و خواردنەوەم نەخوارد ، گوتم دەبێ لەم حاڵەدابم تاکو ئەم دونیایە بەجێ دەهێڵم یاخود خوا تەوبەم لێ وەردەگرێت ، ئەم خەونەم بە یاد هاتەوە ئێمە (بەنو قريظه)مان گەمارۆدا بوو ، من خۆم بینییەوە لەناو قوڕاوێکی بۆگەنی ڕەش لێی نەهامە دەرەوە ئەوەندەی نەمابوو بمرم لەبەر بۆنەکەی ، پاشان ڕووبارێکی ڕۆیشتووم بینی ، بینم خۆم تێیدا شووشت تاکو پاك بوومەوە ، بینیم بۆنێکی خۆشم بۆ هات ، لێکدانەوەی ئەو خەونەم بە ئەبوبەکردا ، ئەویش پێی گوتم :-
دەکەویە ناو کارێکی بە خەم ، پاشان خوای گەورە ڕزگارت دەکات
ئەم کاتەی کۆت و زنجیر کرابووم ، ئەمەم بە یاد دەهاتەوە و ، هیوام وابوو خوای گەورە تەوبەم بۆ دابەزێنێت ، هەر بەم جۆرە مامەوە تاکو گوێم لە دەنگێك دەبوو لە بەرامبەرم نەمدەزانی چی دەڵێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکردم ، تاکو خوا تەوبەی دابەزاند .چەند ڕۆژێك تێپەڕی (ئەبولوبابە)- خوا لێی ڕازی بێت گەڕایەوە شوێن و جێگای خۆی لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ، لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ هەموو غەزاو جەنگەکانی بینی

کاتێك فەتحی مەککە کرا (ئەبولوبابە) – خوا لـێی ڕازی بێت – لە پێشەوەی ڕیزەکانی هۆزەکەی بوو ( بەنی عمرو کوڕی عەوف) ئاڵاکەی هەڵگرتبوونو ، سەرکردایەتی دەکردن و تەکبیرو تەهلیلی لێدەدا

جێگاو شوێنی لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە جێگا نزیكو پەیوەستەکان بوو بە گەورەیی و ڕێزو دەست پێشخەری چاکە تێی دەڕوانی

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، بە گریانێکی زۆر ماڵ ئاوایی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کاتی بە خاك سپاردنی و ، لە لایەن خوا بارانی ڕەحمەت و ڕازی بوونی بۆ دەباری

(ئەبو لوبابە) هەندێك فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ریوایەت کردووە ، هەروەك کوڕەکەی (السائب) و (عبداللـەی کوڕی عمر) و (سالم کوڕی عبداللـە) و (نافع) و ( عبداللەی کوڕی کەعب ) و (عبدالرحمن کوڕی یەزید) و (عبیداللەی کوری ئەبی یەزید) لە (ئەبو لوبابە) گێڕاویانەتەوە .

بەم جۆرە بۆ سامانی زانستی ئیسلامی بابەتێکی زۆر بەنرخی کۆکردۆتەوە .

کۆچی دوایی (ئەبو لوبابە) لە نێوان شەهادەتی هەردوو خەلیفە (عثمان کوڕی عفان ) و (عەلی کوڕی ابیطالب) دەبێت – خوا لێیان ڕازی بێت ...

لێرەدا مێژووی سیرە دەستەوەستان دەوەستێت دەربارەی ژیانی (ئەبو لوبابە) پاش گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەروەردگار ، هەتا تروسکاییەك لە ڕۆناکییەکانی ژیانی باس ناکات ....

ئایا لەگەڵ سوپای ئیسلامی لە مەدینە دەرچوو بۆ غەزاکردنی ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا ؟

ئایا شەڕی هەڵگەڕاوەکانی کرد ؟ کوانێ جێگای دانیشتنی لە ماوەی ئەم ساڵانەو ؟ چۆن بەڕێی کرد ؟؟ !

ئەم پرسیارانەمان بەبێ وەڵام دەمێنێتەوە !!!

ئەوەی جێگای گومان نییە نابێت یاوەرێکی وەك (ئەبو لوبابە) – خوا لێی ڕازی بێت – ڕازی بێت بە دانیشتن و سەرشۆڕی ، لە کاتێکدا ئیمانی گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە محاسەبەی دەروونی خۆی بکات بە جۆرێکی تووند

کۆتایی داستانەکەمان بەم فەرموودەیە دێنین کە (ئەبو لوبابە) خۆی دەیگێڕێتەوەو دەڵێت :–

– ڕۆژی هەینی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژە بارانەی دەکرد ، پێم گوت :– خورماکە لەسەر جۆخینە ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :–

خوایە باران ببارێنە

گوتم :– خورماکە لەسەر جۆخینە ، هیچ هەورێك لە ئاسمان نابینین

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :–

خودایە بارانمان بۆ ببارێنە تاکو (ئەبو لوبابە) خۆی ڕووت دەکاتەوەو ، سولاوکە بە کراسەکەی دەگرێت ...

هەور لە ئاسمان پەیدا بوو بارانێکی یەکجار زۆر باری پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی پێکردین و (ئەنصار)ەکان لە دەورم دەسوڕان و دەیانگوت :-

- ئەی (ئەبو لوبابە) ئاسمان باران ڕاناگرێت ، تاکو هەڵنەستیت بە ڕووتی سولاوکەی ئاوەکە نەگریت بە کراسەکەت ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی ....

هەڵسام بە ڕووتی بە کراسەکەم سولاوکەی ئاوم گرت باران لێی کردەوە

خوای گەورە لە یاوەری بەڕێز (ئەبو لوبابە) ڕازی بێت .

* * *

## ٤٣

# {( عبداللە )ی کوڕی عەمروی کوڕی عاص }

# بڕوادارێکی خواپەرست و مل کەچ بۆ فەرمانی خوا و پێغەمبەر ﷺ

پیاوێکی مل کەچ و تۆبەکارو گوێ ڕایەڵ ، ئێستاکە پێشەکی قسەکانمانی پێدەکەینەوە ئەمەش :-

(عبداللەی کوڕی عەمروی کوڕی عاص) ە - خوا لێی ڕازی بێت -

بە گوێرەی ئەوەی باوکی مامۆستا بوو لە زیرەکی و زۆرزانی و لێزانی خۆشی مامۆستا بوو شوێنێکی بەرزی هەبوو لە نێو خواپەرستان و زاهیدان و بڕواداره پاکەکان ....

هەر هەموو کاتەکانی خۆی بۆ خواپەرستی تەرخان کردبوو ، بەڵکو هەموو ژیانی دەروونی مەست بووبوو بە شیرینی ئیمان ، وای لێهات شەوو ڕۆژ بەشی خواپەرستیبووو شەونخوونی نەدەکرد

باوکی لە پێش عبداللە هاتە ناو ئیسلام ، هەر لەم ڕۆژەی عبداللە دەستی ڕاستی لەناو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ناو موبایەعەی کردو ، دڵی ڕووناك بۆوە هەروەك بەرەبەیان بە ڕوناکی خواو روناکی خواپەرستنەکانی

بۆ یەکەم جار ڕووی لە قورئان کرد لە کاتێك بە پچڕپچڕی دەهاتە خوارەوە ، ئەوەبوو هەر بەشێك لە قورئان دەهاتە خوارەوە لەبەری دەکرد و لە ماناکەی دەگەیشت ، تاکو تەواو بوو کۆتایی پێهات ، هەر هەموو قورئانی لەبەرکرد

هەروەها (عبداللە) تەنها بەمە نەوەستا لەبەر ئەوەی ئەندێشەی بەهێزەو قورئانی لەبەر کردووەو ، لە سینگی هە ێبگرێت ، بەڵکو لەبەری کرد بۆ ئەوەی دڵی پێی ئاوەدان بێتەوەو پاشان پێی ببێتە بەندەیەکی مل کەچ بۆ فەرمانەکانی ، ئەوەی حەلال بکات کە حەلالی کردووە ئەوەی قەدەغەی کردووە ئەو بیش قەدەغەی بکات ، هەروەها ئامادە بێت بۆ هەر شتێك داوای لێبکات ، پاشان بیری دەکردەوە لە ماناکانی و بە تەرتیل دەیخوێندەوە و بۆی دەچوە ناو باخچە بۆندارەکانی ، دڵەفرکێی دەکرد بۆ ئەو مزگێنییە خۆشانەی دەیدا بە بڕوادارنو ، چاوەکانی پڕ لە گریان دەبوو بە هۆی ئەم ئایەتە ترسێنەرانەی ئاراستەی بەندەی گوناهباری دەکرد !!!

(عبداللە) -خوا لێی ڕازی بێت - دروست کرابوو وەکو بەندەیەکی خواپەرست ، هیچ شتێك لە دنیا نەیدەتوانی خەریکی بکات لەوەی کەوا بۆی دروست بووەو ڕێگای هیدایەتی پێگرتووە

ئەگەر سوپای ئیسلام دەرچووبایە بۆ جیهاد بەرەنگای گاوران بێتەوە ئەوانەی جەنگو دوژمنداریان بۆ ئیسلام دەنایەوە ، (عبداللّه)ت لە ریزەکانی پێشەوە دەبینییەوە بەوپەڕی گیانییەوە داوای شەهادەتی دەکردو بۆی بە پەرۆش بوو !!

بەڵام ئەگەر جەنگ بکوژرابایەوە ، لە کوێت دەبینییەوە ؟؟

یان لە مزگەوت ماڵی خوا ، یان لە میحرابی ماڵەکەی ، بەڕۆژو بەڕۆژوو ، بەشەو شەونخوونی ، زمانی شیرینی هیچ قسەیەکیلە قسەکانی دنیا نەدەزانی ئەگەر حەڵاڵیش بوایە ، بەڵکو ئەم زمانە هەموو کاتێك تەڕ بوو بە یادی خوا و ، مینگەی قورئان خوێندن و ، یان ستایش و حەمدی خوا یاخود داوای لێخۆشبوونی گوناهەکانی دەکرد

بۆ ئەوەی بزانین (عبداللّه) تاکو چ رادەیەك کەوتبووە ناو دەریای گوێڕایەڵی و خواپەرستی ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتە ناو خەڵك و داوای خواپەرستی لە خەڵك دەکرد ، ناچار دەبوو بۆ ئەوەی رادەیەك بۆ خواپەرستی (عبداللّه) دابنێلەبەر ئەوەی لەرادە بەدەر لەناو دەریای خواپەرستی نقووم بوو بوو ... !!

بەم جۆرە ئەگەر ئیسلام یەکێك لە لایەنەکانی ئەوە بوو بێت ژیانی (عبداللّەی کوڕی عەمرو)ی کردبێت بە نموونە ، نموونەی بڕواداریێکی مل کەچ کەوا گەیشتبووە ئەوپەری خواپەرستی و یەکلابوونەوە بۆ خوا ، بەڵام لایەنی دووەمی ئەوەیە ئیسلام سوورە لەسەر ئەوەی ئاستێکی مام ناوەندی وەربگرێت ، تاکو دەروونی مرۆڤ بەردەوام بمێنێتەوە لەسەر خواپەرستیەکەی و هەمووکات بۆی بە پەرۆش بێتو ، جەستەی بڕوادار بە خۆشی و بە ساغی بمێنێتەوە !!!

پێغەمبەری خوا ﷺ بەمەی زانی کە (عبداللّەی کوڕی عمرووی کوڕی عاص) هەموو ژیانی بەسەر بردووە بە یەك ئاست و یەك نزم

هەرکە لە جیهادی رێگای خوا دەگەڕایەوە ، هەموو ڕۆژی تەواو دەکرد لە بەیانی بۆ بەیانییەکەی تر لە خواپەرستییەکی بەردەوام و یەك لە دوای یەك .... نوێژو ڕۆژوو و ، خوێندنەوەی قورئان

پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردو ، داوای لێکرد مام ناوەندی بێت لە خواپەرستی ....

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

{ من هەواڵم دراوەتێ کە تۆ بەڕۆژ بەرۆژوو و ، هیچ ڕۆژێك ناشکێنیت ، و بەشەو نوێژ دەکەی و ، ناخەویت ... !! (( دەتوانی لە هەموو مانگێك سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بیت )).....

(عبداللّه) گوتی من لەوە زیاتر دەتوانم ....

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- دەتوانی لەهەمو هەفتەیەك دوو ڕۆژ بەڕۆژوو بیت ....

(عبداللّه) گوتی :- من لەمە زیاتر دەتوانم

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

{كەواتە دەتوانی بۆ باشترین ڕۆژوو ، ڕۆژووی داود ، ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبوو ڕۆژێك دەیشكاند }

پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە لای و پرسیاری لێ‌كرد :-

(( وام زانیوە تۆ بە شەوێك قورئان دەخوێنیتەوە

(( من دەترسم تەمەنت درێژ بێت ...نەتوانی بیخوێنیتەوە !! لە هەموو مانگێك جارێك بیخوێنەوە ...)) پاشان پێی فەرموو :-

{ من بەڕۆژوو دەبم ، بەڕۆژووش نابم نوێژ دەكەم و ، دەخەوم ... ژن دەهێنم هەر یەكێك لە سوونەتی من لابدات ، لەمن نی‌یە }

(عبداللەی كوڕی عەمرو ) تەمەنی درێژ بوو ، كاتێك پیری تینی بۆ هێناو بێ‌هێز بوو هەموو كاتێك ئامۆژگاری‌یەكانی پێغەمبەری بەیاد دەهاتەوەو دەیگوت :-

(( خۆزگە مۆڵەتەكانی پێغەمبەری خوام قەبووڵ كردبا ))

* * *

بڕوادارێك ئەم تەرزە بڕوادارە بێت زۆر زەحمەتە بیدۆزیەوە لە جەنگێك - چ جەنگ - دوو كۆمەڵی مسوڵمان دەستاڕەكەی بگێڕن

بەم جۆرە كەواتە چۆن قاچەكانی هەڵیدەگرێت لە مەدینە بۆ (صیفین) بۆ ئەوەی شوێنێك لە سوپای معاویە بگرێت و دژی ئیمامی عەلی بوەستێت ؟؟ !

ئەوەی ڕاستی بێ ئەم كارەی (عبداللە) ، پێویستی بە بیركردنەوە هەیە ، ئینجا پاش ئەوەی تێگەیشتین شایانی ئەمەیە ڕێزی لێ‌بگرین

ببینیمان (عبداللە) بە چ جۆرێك پێشوازی كرد لە خواپەرستن بە پێشوازی كردنێك نزیك بوو بە ڕاستی ژیانی بكەوێتە مەترسی ؟ ئەم كارە بوو هەموو كاتێك باوكی پێی خەریك كردبوو ، زۆر سكاڵای دەكرد لە لایەن پێغەمبەری خوا ﷺ

لە جاری كۆتایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ‌كرد بە مام ناوەندی لە خواپەرستن دا هەروەها كاتەكانی خواپەرستی بۆ دیاری كرد لە كاتێكدا باوكیشی ئامادەبوو ، دایەوە دەست ( عەمرووی كوڕی عاص)ی باوكی و بە (عبداللە)ی گوت :-

﴿ افعل ما أمرتك ، وأطع أباك ﴾

واتە :- ئەمە بكە كە فەرمانت پێ‌دەكەم ، گوێڕایەڵی باوكت بكە

لەگەڵ ئەوەی (عبداللە) ، بە ئایین و ڕەوشتەكەیەوە ، گوێڕایەڵی باوكی بوو بەڵام فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی لەم كات و ساتەداو بەم جۆرە كارێكی تایبەتی كرد لەسەر دەروونی

(عبداللە) ژیاو تەمەنێكی درێژی بردەسەر بەڵام ساتێك لە ڕۆژان ئەم عیبارەتە كورتەی لە یاد نەدەچوو

﴿ افعل ما أمرتك ، وأطع أباك ﴾

* * *

کەشتی زەمانە چەند ڕۆژو ساڵی بەڕێکرد .... معاویە لە وڵاتی شام گوێڕایەڵی ئیمام عەلی نەبوو و موبایەعەی نەکرد ئیمام عەلی - خوا لێی ڕازی بێت - ئەم یاخی بوونە بێ مانایەی قبووڵ نەکرد ..... شەڕ لە نێوان دوو چینی مسوڵمان هەڵگیرسا جەنگی (جەمەل) بەسەرچوو و ، جەنگی (صیفین) هاتە پێشەوە ....

(عەمری کوڕی عاص) ڕێگای هەڵبژاردنی لەگەڵ معاویە هەڵبژارد ، هەروەها دەیزانی ئاستی ڕێز لێنان و جێگای بڕوایی لە ئایینەکەی بۆ (عبداللّە)ی کوڕی ، ویستی لەگەڵ خۆی بەشداری جەنگی پێبکاو لایەنی معاویەی پێ بەهێز بکاو خەڵکێکی زۆر لەگەڵی ببات بۆ جەنگ ...... هەروەها ( عەمرو ) زۆر دڵی خۆش بوو بە هاتنی (عبداللّە) لەگەڵ خۆی بۆ جەنگ و ، ئەوەی لە یاد نەدەچوو (عبداللّە) چ کاریگەرییەکی هەبوو لە ڕزگارکردنی شام و ، جەنگی یەرموك ئەو کاتەی خۆیان ئامادەکرد بۆ (صیفین) داوای لە (عبداللّە) کردو پێی گوت :- ئەی (عبداللّە) ، خۆت ئامادە بکە بۆ دەرچوون ، تۆ لەگەڵ ئێمە شەڕ دەکەیت ...

(عبداللّە) وەڵامی دایەوە و گوتی :-

(( چۆن .... ؟ پەیمانم لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە بە هیچ جۆرێك شمشێر دانەنێم لەسەر ملی مسوڵمانێك ؟؟ !!))

( عەمرو ) بە زۆرزانی خۆی هەوڵیدا دانی پێدابنێ کەوا ئەوان دەیانەوێ دەربچن بۆ ئەوەی بگەن بە بکوژەکانی ئیمام عثمان و - خوا لێی ڕازی بێت - تۆڵەی خوێنە پاکەکەی بسێننەوە

پاشان لەناکاو بە کوڕەکەی گوت :-

{ لە بیرتە ئەی (عبداللّە) ، کۆتا پەیمان پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی پێدایت ئەم کاتەی دەستی تۆی لەناو دەستی من ناو پێی فەرمووی :-

گوێڕایەڵی باوکت بکە .... !! ؟

(( من ئێستا بریار دەدەم لەگەڵ ئێمە دەربچیو شەڕ بکەیت )) }

ئیتر (عبداللّە) دەرچوو گوێڕایەڵی باوکی کرد ، واش بڕیاری دابوو شمشێرێك هەڵنەکێشێ و شەڕ لەگەڵ موسڵمانێك نەکات

بەڵام ئەم کارە چۆن بۆی تەواو دەبێت ... ؟؟

ئێستاکە وای داناوە لەگەڵ باوکی دەربچێت بەڵام کاتێك جەنگ دەستی پێکرد چۆن کاتەکانی بەڕێبکات ....... !!

شەڕێکی کوشندەو ترسناك دەستی پێکرد

لێرەدا مێژوونووسەکان ڕای جیاوازیان هەیە ئایا لە سەرەتادا (عبداللّە) بەشداری کردووە یاخود نا !!

ئێمەش لێرەدا دەڵێین :- سەرەتای جەنگەکە کاتێکی کەمی برد ، تاکو شتێك ڕوویدا وای لە (عبداللّە) کرد هەڵوێستێك وەربگرێ بە ئاشکرا دژی جەنگەکەو ، دژی معاویە بوەستێت .... ئەمەش لەبەرئەمە بوو ( عەماری کوڕی یاسر) جەنگی لەگەڵ ئیمام عەلی

دەکرد ، هەروەها (عەمار) جێگای ڕێزی تایبەتی هەبوو لەناو یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ..... زیاتر لەمەش ، کاتی خۆی نیگای لەسەر هاتبوو بە کوشتنی

ئەمەش کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرەکانی لەکاتی کۆچکردنیان مزگەوتیان دروست دەکرد لە شاری مەدینە ، ئەم بەردانەی هەڵیان دەگرت گەورەو لە زەوی چەقیبوون بەهێزترین کەس نەیدەتوانی لە یەك بەرد زیاتر لە شوێنی خۆی هەڵبگرێت

هەرچی (عەمار) بوو لە کەیف و خۆشی‌یان ، هەڵدەستا دوو دوو بەردی هەڵدەگرت ، پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای دەکردو چاوەکانی پڕ بووبوون لە فرمێسك ودەیفەرموو:
{ويح ابن سميه ، تقتله الفئة الباغية}

واتە :- { ئاخ بۆ کوڕی سومەی‌یە ، چینێکی یاخی بوو دەیکوژن }

هەموو یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەی بەشدار بوون لە مزگەوت دروست کردن گوێ‌یان لەم فەرموودەیە بوو ، تا ئێستاش لە یادیانە

(عبداللەی کوڕی عەمری کوڕی عاص) یەکێك بوو لەوانەی گوێی لەم فەرموودەیە بووبوو

لە کاتی دەست پێکردنی جەنگ لە نێوان سوپای معاویەو سوپای ئیمام عەلی ، عەمار بەسەر بەرزایی‌یەك کەوت بە بەرزترین دەنگ هاواری دەکردو هانی شەڕکەرەکانی دەداو دەیگوت :-

ئیمڕۆ دەگەین بە خۆشەویستەکانمان - موحەممەدو یاوەرەکانی -

کۆمەڵێك لە سوپای معاویە هەوڵی‌کوشتنیان داو ، لە هەموو لایەك تیر بارانیان کرد ، بەم جۆرە گواستیانەوە بۆ جیهانی شەهیدە نەمرەکان

هەواڵ وەکو با ڕۆیشت کەوا (عەمار) کوژراوە

(عبداللەی کوڕی عەمر گڕی لێ هەڵساو هاواری کرد :-

- ئایا ئەوە عەمار کوژرا ؟؟

- ئێوە کوشتتان ؟؟

- کەواتە ، ئێوە چینی یاخی‌بووەکانن

- ئێوە شەڕ لەسەر نەزانی و تاریکی دەکەن !!

ئەم قسانە گەیشتە سوپای معاویە هەروەك ئاگر لە پوش بەربدەیت و ، ورەی بەزاندن ، هاواری لەسەر کردن کەوا یاخی بوون ، لەبەر ئەوەی عەماریان کوشت ، لە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ پێش بیستو حەوت ساڵ نیگای بە کۆمەڵێك لە یاوەرەکانی خۆی دابوو کەوا چینێك لە یاخی‌بووەکان دەیکوژن ئەم ووتانەی (عبداللە) گەیشتە معاویە و، ئەویش داوای باوکی (عبداللە)ی کردو ، بە عەمروی گوت :- ( ئایا ئەم شێتەمان لە کۆڵ ناکەیتەوە ؟؟ )

(عبداللە) گوتی :-

- ( من شێت نیم ، بەڵام گوێم لێ‌بوو لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەیگووتە عەمار :- (چینێکی یاخی بووان دەتکوژن)

معاویە پێی گوت :-

( ئەی بۆچی لەگەڵمان دەرچوویت) ... ؟

(عبدالله) گوتی :-

{ لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردووم گوێڕایەڵی باوکم بم ، بۆ دەرچوون منیش گوێڕایەڵم کردووە ، دەنا شەڕ بۆ ئێوە ناکەم }...

ئەوان لەم کاتەی گفتوگۆیان دەکرد لەگەڵ معاویە یەکێك هات ڕێگای هاتنە ژوورەوەی بکوژی عەماری هێنا ، (عبداللەی کوڕی عەمرو) هاواری کرد ( ڕێگای پێبدەو ، مزگێنی ئاگری پێبدە )

معاویە لەگەڵ پشوو درێژی و لێبووردەیی ، هاواری کرد بە توورەییەوە بە (عەمرو)ی گوت :-

گوێت لێ نییە چی دەڵێت ؟

(عبدالله) بە هێمنییەکی خواپەرستانەو بەدڵنیاییەوە گەڕاوە ، معاویەی دڵنیا کردەوە کە ئەوەی گووتووە هەمووی هەقە ، وە ئەوانەی (عەمار)یان کوشتووە هیچ نین تەنها یاخی بوو نەبێت

ئینجا ڕووی لە باوکی کردەوەو پێی گوت :-

- ( ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی گوێڕایەڵی پێ نەکردبامایە ، ئەم ڕێگایەم لەگەڵ تۆ نەدەبڕی)

معاویە و عەمرو ڕۆیشتن سوپاکەیان دەپشکنی ، لە ترسان تۆقین کاتێك هەموو خەڵك گوێیان لەم هەواڵە بوو ، باسی ئەم نیگایەی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد بۆ عەمار :-

عەمرو معاویە هەستیان کرد ئەم کارەساتە لەوانەیە کارەکەیان پێچەوانە بکاتەوە خەڵکەکە لە معاویە هەڵگەڕێنەوە ، بیریان کردەوە تاکو خەڵکەکەیان چەواشە کرد بەم هەواڵەی بڵاوەی کردبوو لەناو خەڵك ، ئەوەبوو پیلانێکیان دۆزیەوە و گوتیان :-

- بەڵێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ڕۆژە بە عەماری گوت : چینێکی یاخیبوو دەتکوژن ... نیگای پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاستە .

ئا ئەوە عەمار کوژرا

- ئایا کێ کوشتی ؟؟

( ئەوانە کوشتیان کەوا بەدەریان نا ، هەڵیان گرت بردیان بۆ جەنگ )..... !!

ئینجا لە کاتی ئاڵۆزی وا لەوانەیە هەر بۆچوونێك بگوترێت بڵاوەی بکات ، بەم جۆرە بیروبۆچوونی معاویە و عەمرو بڵاوەی کرد

هەردوو چینەکە دەستیان بە شەڕ کردەوە

ئیتر (عبداللەی کوڕی عەمرو) گەڕایەوە بۆ مزگەوت و خواپەرستی خۆی

* * *

بەم جۆرە (عبدالله) ژیانی بردە سەر بە ژیانێکی پڕ لە خواپەرستیو مل کەچی

دەرچوونیشی بۆ جەنگی (صیفین) تەنهاو تەنها دەرچوون بوو و ، بەردەوام بەنادڵی مایەوە ، هەر ئەوەندە بوو بە بیری دەهاتەوە تاکو دەگریاو دەیگوت :-

{من و ، صیفین ؟؟}

{من و ، شەڕ کردن لەگەڵ مسوڵمانان ؟؟ }

ڕۆژێکیان ، (عبدالله) لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوون ، حوسەین کوڕی عەلی – خوا لێی ڕازی بێت – بەلایان دا تێپەڕی و سەلامیان لەیەکتر کرد کاتێك تێپەڕی (عبدالله) بە ئەوانەی دەورەی گوت :-

( حەز دەکەن هەواڵتان بدەمێ بە خۆشەویسترین خەڵکی سەر زەوی تا خەڵکی ئاسمان ؟ )

(ئەوە ئێستا بەلامان دا تێپەڕی حوسەین کوڕی عەلی لە کاتی جەنگی – صیفین–ەوە قسەی لەگەڵم نەکردووە ئەگەر بێو لەمن ڕازی بێت ، لە ووشتری سوور پێم خۆشترە !! )

(عبدالله) لەگەڵ (ئەبی سەعیدی خودری) ڕێکەوتن لەسەر سەردانی ئیمامی حوسەین – خوا لێی ڕازی بێت – لێرەدا لە ماڵی حوسەین هەردوو زاتی پیرۆز پێکگەیشتن (عبداللەی کوڕی عەمرو) دەستی بە قسە کرد ، هاتە سەر باسی – صیفین – حوسەین بە گازاندەوە پرسیاری لێکرد :-

{ چی وای لێکردووی لەگەڵ معاویە دەربچیت ؟؟ }

(عبدالله) گوتی { ڕۆژێك عمرو کوڕی عاص لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ شکایەتی لێکردم و پێی گوت :-

{ (عبدالله) هەموو ڕۆژان بەڕۆژوو دەبێو ، شەو بە تەواوی هەڵدەستێتەوە }

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم { ئەی (عبدالله) ، نوێژ بکەو بخەوەو ، بەڕۆژوو بەو بەڕۆژوو مەبەو ، گوێڕایەڵی باوکت بکە }

(( ڕۆژی – صیفین – باوکم سوێندی لەسەر خواردم لەگەڵی دەربچم ، منیش دەرچووم بەڵام سوێند بە خوا شمشێرم هەڵنەکێشاوەو ، یەك ڕمم نەهاوێشتووەو ، یەك تیرم نەهاوێشتووە !! }

لە کاتێك دا (عبدالله) تەمەنی پیرۆزی پڕ لە خێری گەیشتبووە حەفتاو دوو ساڵ و لەناو نوێژدا بوو و ، لەخوا دەپاڕایەوە و ، تەسبیحاتی خوای دەکرد ، دوعای کۆچکردنی یەکجارەکی دەکرد ، بە پەرۆشێکی مەزنەوە دوعاکەی گیرا بوو

بەم جۆرە گەیشت بەو برایانەی لە پێش ئەو کۆچی دوایی‌یان کردبوو ، گیانی پاکی باڵی گرت و مزگێنی دەریشی لە لای خوای بەرزو پەروەردگارەوە بانگی کردو فەرمووی :-

﴿ یا أیتها النفس المطمئنة ، ارجعی الی ربك راضیة مرضیة ، فادخلی فی عبادی وادخلی جنتی ﴾

* * *

٤٤

# ساریەی کوڕی زونەیم

هەڵکری بانکی ( یا ساریە الجبل الجبل ) بۆ ساریە دەبێ کێ بێت ؟!

# ٤٤
# سارىيەى كوڕى زونەيم
# هەڵگرى بانگى (( يا سارية الجبل الجبل ))
# بۆ ساريە دەبێ كێ بێت !؟

ئێمەى موسڵمان ساڵانێكى زۆرە گوێمان لە چيرۆكى (ساريە كورى زونەيم)و جەنگى نێوان فارس و كورد دەبێت ، لەگەڵ بانگى گەورەى بڕوادارن (عومەرى كورى خەتتاب) – خوا لێى ڕازى بێت – بۆى :– { يا سارية الجبل الجبل } لەسەر مينبەرى پێغەمبەرى خوا ﷺ لە شارى مەدينەى منەوەرە ، (ساريە) گوێى لەم بانگە دەبێت لە كاتێكدا لە جەرگەى وڵاتى فارس دەبێت ، ئينجا كارى پێدەكات و خۆى و هاوەڵەكانى ڕزگاريان دەبێت

لەبەرئەوە با بەيەكەوە چەند ساتێك گوێ بگرين لەم داستانەو بتوانين تێيدا كەمێك گفتوگۆ بكەين و هەندێك لە لايەنەكانى ڕوون بكەينەوە ، واز بهێنين و دوور بكەوينەوە لە وێنەى ئەفسانەو هەڵبەستراو ، بە يەكەوە بەرز ببينەوە بۆ پلەى ڕاستى زانستى و بابەتى و ، وا بكەين خەياڵمان بۆ شتى ڕاست و دروست بڕوات بە تايبەتى ئەم ڕووداوە بە نرخ و بە پێزە

ئينجا با بەيەكەوە لە لايەنە زانستيەكە بكۆڵينەوە كەوا هەڵسان بە تاقيكردنەوە لە مەيدانى لێكۆڵينەوەى دەروونى و ڕۆحانى ، هەندى(ساريە كورى زونەيم)ە زانا ڕۆژئاواييەكان پێيەوە ماندوو بوون و سسەلماندويان لە ژێر ناوى (تليباثى – Tlepathy) واتە :– گفتوگۆ ياخود زانستێكە دەروونەكان لە دوورەوە پێى گفتوگۆ دەكەن

بەم جۆرە ئەم تاقيكردنەوەيە بۆ ئێمەو خەڵك بەسە كەوا زاناى پسپۆڕى تايبەت بەم كارانە هەڵساون ئەم ماندووبوونەيان لەسەر ئەستۆى ئێمە هەڵگرتووە ، هەروەها هەندێك لە زانا بێباوەڕەكان پاش ئەوەى هەڵمەت و كارە سەربازييەكانى ئەفغان سەرەسامى كردبوون هەڵسان بە چەند تاقيكردنەوەيەك لەژێر ناونيشانى زانستى (پاراسايكۆلۆجى) هەرچەندە ئەم كارە تايبەت نىيە بە ئێمە ئەم تاقيكردنەوانە گەر سەركەوتن بهێنن ياخود نا !! خوانەخواستە ئيمانى ئێمە لەق ناكات بەم مەسەلەيە ، بەڵكو لايەنە زانستييەكەى زياتر هانمان دەدات بەوەى شەپۆلى هەوا ئەم دەنگە هەڵدەگرێ لە سەروچاوەوە بۆ شوێنى خۆى ، هەر كاتێك با خێراتر شەپۆلەكانى دەنگى گواستراوە بە كاتێكى كەمتر دەگەنە شوێنى مەبەستى خۆيان

ئینجا هەواو !!! باو !!! جوولەو !!! شەپۆلەکان ، هەمووی مل کەچن بۆ یاساو ، ویستی خاوەن یاساو ، لەژێر تێبینییەکانی یاسا دەرناچن

{ یا (سـاریة) الجبـل الجبـل }چەند وو‌شەیەك بوون سەربازو فریشتەکانی خوا گەیاندیانە شوێنی مەبەست ، ئەمەش نەك تەنها بە گەیاندن بەڵکو پاش ئەوەی گەیاندیان ئەوانیش کارەکەیان ڕاپەڕاند و سەرکەوتنیان بەدەست هێناو ڕزگاریان بوو

له دڵێك دەرچوو گەورەی مسوڵمانانی پێتووشی دڵەڕاوکێ کرد کەوا کاریان لەسەر ئەستۆی ئەو بوو ، وە لە زمانێك دەرچوو یادی خواو تەسبیحاتی خوای بەردەوام دەکرد ، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێزی لەم زمانە ناوەو دەفەرمووێت :-

- جعل الله الحق على لسان (عمر ) و قلبه

خودا هەقی لەسەر زمان و دڵی عومەر داناوه

گەیشت بە گوێیەك پێش موسڵمان بوونی جەردەو ڕێگرێك بوو لە جەردەکانی عەرەب ، نقووم ببوو لە ئارەزووەکان و ، دوور بوو لە چاکەو ، پڕ بوو لە هەموو خراپەیەك ، گوێیەك هەر کە گوێی لە ووشەی یەکتاپەرستی بوو باری خاوەنەکەی گۆڕی ، بوو بە نموونەی دڵسۆزی و ئیستیقامە ، گوێیەك تاکو بڵێیت بە هەست بوو وورد بوو لە بیستنی هەواڵ

ئیتر ئەمە بوو کاری بانگدەرو گوێ لێبوو کەوا گواسترایەوە ڕاستەوخۆ بەسەر چیاو دۆڵ و دەشتایی و سەدەها بەڵکو هەزارەها میل

زمانێك تەنها ڕاستی دەگووت و ، گوێیەك گوێی لە هەق بوو ، کەواتە ئەم کارە نە سەیرەو نە جێی سەرسوڕمانە .....

تا ئێستاش مێژووی ئەم چەشنە بڕوادارە پڕە لە شتی سەیرو بێئەندازە ، هێشتان زانست نەیتوانیوە لێی بکوڵێتەوە ، پاشان لە چوارچێوەی ڕاستییەکەی زانستی پێشکەشی بکات و کەوا بووە بەشتێکی بێ بنچینە بەرامبەر مرۆڤ و بووە بە تەگەرەیەك لەم سەردەمی ئێمەدا

هەروەها ئێمەی مسوڵمان لە لایەنی ئیمانیەکەی ئەم بەڵگەمان بەسە ، کەوا مرۆڤێکی بێ دەسەڵات نەزان بەرامبەر خوای دروستکار بتوانێت بە هۆی مانگی دەستکردەوە هەواڵەکان بە وێنەو دەنگەوە لە کیشوەرێك بۆ کیشوەرێکی تر بگوازێتەوە ، ئەم کارە بۆ خوای گەورە ئاسانترین کارە بەبێ دەسگای بێتەل و مانگە دەستکردەکان ئەم کارە بکات ....

ئینجا با بێنە سەر ناوو پەروەردەو بنەماڵەی ئەم یاوەرە بەڕێزی کەوا ناوی (ساریە کوری زونەیم کوڕی عبداللە کوڕی محمیە کوڕی عەبد ......) ە ، پەروەردە بوو بە پەروەردەیەکی جاهیلی بە هەموو ماناو ووشەیەکی جەهالەت ، ئەم پیاوە دوور بوو لە ڕەوشت و هیچ وەزن و کێشێکی بۆ ڕەوشتی بەرز دانەدەنا ، پاشان پیاوێکی مەیخۆرو قومارچیبوو ، زۆربەی کاتەکانی لە یانەی مەیخواردنەوە دەبردە سەر ئەوەندەی عەرەق دەخواردەوە تاکو بیرهۆشی لەسەرەخۆی نەدەما ، کاتێك بەخۆ دەهاتەوە گیرفانی بەتاڵ

بوو نەفلس و درهەمێکی لەناو نەبوو ، پەلاماری کاروانەکانی دەداو دزی دەکرد ، دزیکردن ببووە کارو پیشەی ، لە وەسف کردنیدا دەڵێن پێشبڕکێی لەگەڵ وولاخی دوژمن دەکرد بە پیادەیی ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لاوازیو سووکی جەستەی و خێرا ڕۆیشتنی

ئەمە بو حاڵی (ساریە کوری زونەیم) پێش موسڵمان بوونی

لێرەدا هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی نییە ڕۆژی موسڵمان بوونیو چۆنیەتی موسڵمان بوونی دیاری بکات ، لەبەر ئەوە هەندێك لە سەرچاوەکان شێوەی لێکدانەوەکەیان یەك ناگرنەوە ، بەڵام ووردبینە لێکۆڵەرەوەکان دەتوانن بسەلمێن موسڵمان بوونی کە بەدوا کەوتوو واتە پاش فەتحی مەککە بووە ، هیچ غەزایەکی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نەبینیوە ، لەگەڵ ئەوەی بە یاوەریش دەژمێردرێت ، کەوا خەلیفە ڕاشیدینەکان بە تایبەتی ئیمامی عومەر تەنها یاوەری پێغەمبەریان دادەنا لە ئەمیر لەسەر سوپا ، ئینجا ئەمە بەبێ بەڵگە دەیسەلمێنێ کەوا (ساریە) یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوایە ﷺ

(ساریە) موسڵمان بوو ، بوو بە موسڵمانێکی ڕاست و دروست ، ڕاستی موسڵمان بوونی (ساریە) دیاردەیەکە شایەنی ئەوەیە وانەو پەندی لێوەربگیرێت . پاش موسڵمان بوونی وەسف دەکرێت بە موسڵمانێکی پاكو ڕاستو ئازاو بە غیرەت و بە وەفاو ڕاستگۆو بەڕێزو نان دەر .... سارییەی نوێ و سارییەی کۆن زۆر لەیەك دوورن ، سارییەی نوێ بریتی بوو لە بڕوادارێکی موسڵمانو ، سارییەی کۆن بریتی بوو لە بێباوەڕێکی جاهیلی دوور لە هەموو ڕەوشتێك

ئەوەی ڕاستی بێت ، کاری ئیسلام لەسەر دەروونی ساریە کارێکی سەرسوڕهێنەر بوو بە پلەیەك کەوا ئەم پیاوەی گۆڕی بۆ پیاوێکی نموونەیی تر ، - خوا لێی ڕازی بێت - نموونەیەکی زیندووی هەست پێکراو بوو بە گوێرەی کاری ئیسلام لە دەروونی ئەوەو شوێن کەوتووانی

ئەم پیاوە خاوەن ئەم لەشە سوکەو بێ و بەم خێراییە ڕێگا ببڕێو پەلاماری دوژمن بداو ، بەبێ ئەوەی خۆی بشێوێنێ بۆسە دابنێتەوە و کەس ئاوڕی لێ بداتەوە ، بزانێت کەی پێشدەکەوێت و کەی ڕادەوەستێ ئەگەر ئەمانە سیفەتی بن شایەنی خۆیەتی هەڵبژێردرێت بۆ سەرکردایەتی

سەرەڕای ئەم سیفەتانەی باسمان کرد ساریە - خوا لێی ڕازی بێت - هەر لەو کاتەی سوپای موسڵمانان دەرچوو بۆ سەر دوژمنان خەریکی ڕێکخستنی سوارچاکەکانی بوو تووشی گەورەترین کارەسات بوو لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمنەکانی ، هەموو چالاکییەکی خۆی بەکارهێنا لەم جەنگانە تێیدا بلیمەتی بەرزی ئاشکرای لێبەدیار کەوت لە سەرکردایەتی پیادەکان ، هەروەها هەموو ئەو سەرکردە ناودارانەی کە ساریە لەژێر دەستیان کاری دەکرد بەسەریان دا هەڵدەگووت ، لەبەر ئەوە خەلیفەی بڕوادارن ( عومەری کوڕی خەتتاب ) - خوا لێی ڕازی بێت - هەڵیبژارد بۆ ئەم کارە مەزنە

هەردوو ویلایەتی (فەسا) و (دارئەبجەرد) لە ویلایەتە گرنگەکانی فارسەکان بوون خەڵێکی زۆر لە کوردو فارس تیایدا کۆبووبوونەوەو خۆیان تیادا حەشاردابوو

کاری فەتح کردنی ئەو شوێنانە درایە دەست ساریە بۆ ئەوەی زاڵ بێت بەسەر کۆبوونەوەی کوردو فارس تیایدا ، ساریە بە سوپاکەیەوە بەڕێکەوت بۆ شوێنی مەبەستی تاکو گەمارۆی سوپای فارسیدا ، بۆ ماوەیەك گەمارۆکە بەردەوام بوو . کاتێك فارسەکان نائومێد بوون لە سەرکەوت بەسەر موسڵمانەکان ، داوای پارمەتییان کرد . کوردەکان بە ژمارەیەکی زۆر چوون بۆ یارمەتییان ، ئەمجارەیان لە جیاتی ئەوەی ئەنجامی جەنگەکە بەهۆی گەمارۆکە لە قازانجی موسڵمانان بێت ، موسڵمانان خۆیان گەمارۆ دران

ئەگەر کارەکە بەم جۆرە بەردەوام بوایە بەسەر ساریەو پیاوەکانی سەردەکەوتن

گەورەمان (عومەری کوڕی خەتتاب) – خوا لێی ڕازی بێت – لە دڵەڕاوکێیەکی زۆر دابوو بۆ سوپای موسڵمانە شەڕکەرەکان ، بە پیادە تاکو سنووری مەدینەی منەوەرە دەچوو بۆ ئەوەی چاوی بە مزگێنی دەرێك بکەوێت بەڵکو هەواڵی ئەم موسڵمانانەی پێبێت بۆ ئەوەی ئەم ترسەی لەدڵ دەربچێ و دڵنیابێتەوە ، جاری وا هەبوو لەیادی دەچوو و دەروونی لە لای خۆی نەدەما ئەوەندە دوور دەکەوتەوە شاری مەدینەی لەبەرچاو وون دەبوو پاشان دەگەڕایەوە

هەروەها شەوان ئیمامی عومەر – خوا لێی ڕازی بێت – هەر هەمووی شەونخوونیو بەئاگا بوو

لە ڕۆژێی هەینی لە کاتێك دا ئیمامی عومەر – خوا لێی ڕازی بێت – لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری دەدا لە مزگەوتی مەدینە ، قسەیەکی ئاگادارکردنەوەی دەربڕی کەوا پەیوەندی بە وتارەکە نەبوو ، بە بەرزترین دەنگ هاواری کرد :–

{ یا (سارية بن زنيم) الجبل  الجبل }

بەم جۆرە پەردەی نهێنی بەدیارکەوت بەرامبەر چاوەکانیو ، دوورییە کاتییەکان کورت بوونەوە ، زەوی لەژێر دەستی ئامادەبوو و ، بەهۆی دەروونییەوە سوپای موسڵمانانی بینی بە سەرکردایەتی (ساریە) نزیك بوو بکەوێتە ناو تەڵەی گەمارۆ ، بانگی کردو گوتی :–

{ یا (سارية) الجبل  الجبل }

گیانی ساریە بەئاگا هاتو دەروونی پاك بۆوەو هەموو هەستەکانی لە گوێیەکانی کۆبۆوە  بەم جۆرە گوێی لە بانگ کردنی ئیمامی عومەر بوو لە چیایەکە سوڕایەوەو ڕووبەڕووی کوردو فارسەکان بۆوە لە یەك لادا ، بەم جۆرە خۆیو هاوەڵەکانی شەڕی مانو نەمانیان کرد لە سەنگەری بەرگریدا ، توانیان بەسەر دوژمنەکانیان سەربکەون کەوا لە چەكو ژمارەدا لەوان بەهێزتر بوون ، لەگەڵ ئەوەی دوژمن لە خاکی خۆی جەنگی دەکرد بۆ بەرگری لە وڵاتو نیشتمانی ، لە ئەنجامدا بەسەر سوپای فارسەکان سەرکەوتووندەستیان گرت بەسەر هەردوو ویلایەتی (فەسا)و (دارئەبجەرد) ، گوندو شارەکانیان ڕزگارکردو چوونە ناویەوە

ئەوەی گومانی تێدا نی‌یە سەرکردایەتی بلیمەتی ساریە هێزەکی لەناوچووی حەتمی ڕزگار کرد ، لە کاتێکدا سوپایەکی زۆر بچووك بوو بە گوێرەی گەورەیی مەبەستەکەی‌و زۆری هێزەکانی دوژمن .....

هەروەها مەترسی گەورە بەرەنگاری سوپای (ساریە) دەبوو ، لەبەرئەوەی هێڵەکانی گەیاندن یەکجار دوور بوون لە بنکەکانی پێشەوەی‌موسڵمانان لە (کوفە)و (بەسرا) ئینجا داواکردنی یارمەتی پێویستی بە کاتێکی درێژ هەبوو ، لەبەرئەوە هیچ چارەیکی نەما تەنها خەریك کردنی دوژمنەکانی نەبێت تاکو هەلێکی شیاوی بۆ بڕەخسێ بۆ ئەوەی لە جەنگێکی یەکجارەکی بەرەنگاریان ببێتەوە ، ئەمەش بە ڕێگای جەنگێکی خێرا ، کاتێك ئەم هەلەش ڕەخسا (ساریە) بە فیڕۆی نەدا ، بەڵکو پەلاماری دوژمنە بەهێزە ملهوڕەکەی‌دا ، پەلاماردانی هەڵۆ بۆ سەر نێچیرەکەی ....

بۆ ئێمەیە پرسیار بکەین :– ئایا دەبێت نهێنی سەرکەوتنی (ساریە) بەسەر دوژمنەکانی چی بێت ؟ لە کاتێکدا لەناو جەرگەی خاکیان شەڕیان لەگەڵ دەکات لە دوایی‌شدا هەموو هۆیەکانی جەنگی‌یان لەسەر موسڵمانان بوو ..... !!!

(ساریە) دیار بوو بە ئازایەتی‌یەکی کەسایەتی بێ‌وێنەو بەرەو پێش چوونێك نەیدەزانی گەڕانەوە چی‌یەو ، بەهەنگاو هاوێشتنێکی بێ‌ڕادە هەر کاتێك تەگەرەو کۆسپەشی دەهاتە بەردەم .

سەرکردەیەکی سەربازی زۆر بە توانا بوو بۆ گەیشتن لە سروشتی گۆڕەپانی جەنگ‌و کۆتایی ئەنجامەکەی ، یاخود بە ڕوونکردنەوەیەکی تر لێهاتوو بوو بۆ هەڵبژاردنی خاکێکی یاو بو جەنگێکی شیاو لە کاتێکی شیاودا

کاتێك لە بیابان بوو ئەو کاتەی گەماڕۆی دوژمنی‌دا ، بەڵام کاتێك دوژمن یارمەتی‌یان بۆ هات ، بەژمارەو بەهێز دوژمنان لەسەر موسڵمانان بوون ، لێرەدا لەسەر (ساریە) پێویست بوو شوێنێکی بەرگری شیاو هەڵبژێرێت‌و ، هەڵوێستی بەرگری وەرگرێت لە جیاتی هەڵمەت بردن ، دەشتایی بەجێ‌هێشت و چیای هەڵبژارد ....

ساریە – خوا لێی ڕازی بێت – ، لە بڕیاردانی ڕاست‌و دروست خێرا بوو ، لەگەڵ ئەمەدا دووربین بوو و ، سازی نەدەدا لەسەر دەرفەت ، هەروەها ویستی بەهێزو کەسایەتیەکی زاڵی هەبوو

ئینجا لە پاش ئەم هەریانەش – ئەم یاوەرە بەڕێزە لە تاقیکردنەوە موغامەرە نەزانی‌یەکان سوودی وەرگرتبوو ، هەر کاتێك کارێکی لێ ئاڵۆز دەبوو مێشکی کراوە بوو بۆ دۆزینەوەی فێڵێك ، ش وای لێ‌دەکرد سەرکردەیەکی بە تواناو دەسەڵاتدارێکی سەرکەوتووی لێ دەربچێت

*　　　　*　　　　*

لێرەدا مێژوو بە تەواوی قسە ناکاو بێ‌دەنگ دەبێت لەسەر ڕۆژەکانی کۆتایی ساریە ، هیچ دەربارەی نازانێت ، چی پێشکەش بە موسڵمانان کردووە لە خزمەتکردنی گشتی پاش فەتح کردنی (فەسا)و (دارئەبجەرد) ، هەروەها نازانن کەشتی جیهادو تێکۆشانی بەرەو کوێ بەڕێکەوتووە و ؟ کەی و لە کوێ کۆچی دوایی کردووە ؟ چەند ژ ـا

لە تەمەن ؟ ئەم پرسیارانە  هەمووی بەبێ وەڵام و ، لێکۆڵینەوەیەکە بەبێ روون کردنەوە ، ئێمەی بڕواداریش هەروەکو گوێگرێک لەم مێژووە مەزنە یەك نموونەمان بەسە لە داستانە پاڵەوانیەکانی (ساریە کوری زونەیم) – خوا لێی ڕازی بێت – بۆ ئەوەی بیکەن بە ماموٚستاو سەرمەشقی خۆمان لەم وانە گرنگە بەنرخەی کە پێیدان

ئیتر سەلامی خوا لە (ساریە)ی نەمر بێت ، خوایە هەروەك سەرۆکێکی موجاهید لێی ڕازی بەو ، لە ئێمەش خۆش ببە .....

*　　　　　　　　*　　　　　　　　*

٤٥

# موحەممەدی کوڕی مەسلەمە

## ڕاپەڕێنەری پیلانێکی سەرکەوتوو

## ٤٥

# موحەممەدی کوری مەسلەمە
# ڕاپەڕێنەری پیلانییێکی سەرکەوتوو

یەکێك لەو قارەمانانەی کەوا بڕوای هێنابوو بەخوا بە پێغەمبەرەکەی‌و گیانی خۆی فرۆشتبوو لە ڕێگای خوا بۆ گەیشتن بە بەهەشتێك پانیەکەی ئەوەندەی زەوی‌و ئاسمانە کە تەرخان کراوە بۆ خواپەرستان ئەم قارەمانەش (موحەممەدی کوڕی مەسلەمەیە) - خوا لێی ڕازی بێت -

ئینجا جێگای خۆیەتی هەر کاتێك ناوی بێت لە پەرتووکە سیرەو مێژوویی‌یەکان ماوەیەکی زۆر لەسەری بوەستین و ، بیری لێ‌بکەینەوە و تێبینی لەسەر بنوسین و پەندی لێ‌وەربگرین ....

پاشان بیری لێ بکەینەوە دەبینین مرۆڤێکی لەش بەهێزو جەستە پتەو ، ووره بەرزو ئیمان بەهێزو ، زیرەك‌و دووربین‌و ، سەرۆکێك شیاوی سەرکردایەتی‌و ، سوارچاکێك سەرپەرشتی سوارچاکان بکاو قارەمانێکی ئازاو سوار چاکێکی چاو نەترس ، دێتە پێش چاو ....

پاش ئەو هەموو سیفەتە بەرزانە بەدوای کەسایەتی و هەواڵی ئەم یاوەرە بەڕێزە دابچین - خوا لێی ڕازی بێت - دەزانین موجاهیدێکی لەخۆبردەو ، بڕوادارێکی شۆڕگێڕ بووە ، لە بەرامبەر شۆڕشگێڕی و گیان بازی‌و موغامەرەکانی هەموو فس فس پاڵەوانەکان فێڵەکانیان پووچ دەبێتەوە بەرە بەرە بچووك دەبنەوە تاکو لە پێش چاو وون دەبن

ئێستاش برایان‌و خوشکانی مسوڵمان باتۆزێك گوێ بدەینە ژیان‌و سەربردەی ئەم یاوەرە قارەمانە مەزنە (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)- خوا لێی ڕازی بێت -

سەبارەت بە ژیانی منداڵی : (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە کوڕی خالیدی کوڕی عەدی )- خوا لێی ڕازی بێت - هیچ نازانرێت ، لەبەرئەوەی پەرتووکە سیرەو مێژوویی‌یەکان باسیان نەکردووەو گرنگی‌یان پێ‌نەداوە ، تەنها ئەوە نەبێت ئەوە دەزانین ئەم یاوەرە سوێندخۆری نەوەی (عبدالاشهل) بووە لە خەڵکی مەدینە لە هۆزی ئەوس کاتێك ( موصعەبی کوڕی عومەیر) گەیشتە شاری مەدینەو هەڵگری ووشەی ئیسلام بوو بۆ جەنگ‌و، بانگهێژی دەکردن بۆ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و شوێن کەوتووەکان لە خەڵکی مەدینە لە دەوری (موصعەب) کۆبوونەوە گوێ‌یان گرت لە ووتەکانی وەکو کانیاوێکی تەقیوەو ئاسمانێکی ساماڵ‌و ، ڕوناکی‌یەکی بە تیشك ویژدان‌و گیانیان بەئاگا هاتەوە

تەمەنی (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) ئەو کاتە لە سی ساڵ تێپەڕی نەدەکرد ، گەنجێکی بالأبەرزو ، چاو تیژو ، بازوو بەهێزو ، ڕەش پێست بوو ، هەموو خەڵك ڕێزیان دەنا لە ئازایەتی و قارەمانیەتی ئەم پیاوە

هەروەها کاتێك ووشەی خوای گەورە لە مەدینەجێگیر بوو ، خەڵکی مەدینە بڕوایان هێنا و گەورەی پێغەمبەران ﷺ گەیشتە شارەکەیان ، لە هەموو سوچێك و لایەکی مەدینە خەڵك بۆی هاتنە دەرەوە ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) لە پێشەنگی پێشوازی کاران بوو و ، بەخێرهاتنی ئەم پێغەمبەرەی کردو پەیمانی نوێکردەوە و بەڵێنی ئەم ئایینەی دا

* * *

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) – خوا لێی ڕازی بێت – لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ مایەوە ، خۆشیویست و گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوو و ، خۆی تەرخان کرد بۆ خزمەتی ئاین ، کارکەرێکی دڵسۆز بوو بۆ هەڵگرتنی ئالأی ئیسلام ، ئینجا لەبەر لەبەر ئەم سیفەتە بەرزانە پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی پێداو بووە جێگای بڕوایی

پێغەمبەری خوا ﷺ چەند مانگێك لە مەدینە مایەوە و جێگیر بوو ، لەم کاتانەدا (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) سەربازێکی دەست پاك بوو لەژێر دەستەکانی کارە گرنگەکانی پێدەسپاردو ئەویش بە باشترین شێوە رایدەپەڕاند ، کاتێك بانگخواز جاڕی جیهادی لێدەدا لە ڕیزی پێشەوەی سەنگەرەکان بوو

ئا ئەمەیە قارەمانی ئیسلام لە جەنگی بەدر لەم سەرو لەوسەری گۆڕەپانی جەنگ دێت و دەچێت ، ملی گاوران پەل دەداو ، سوارچاکان لە تۆزوخۆڵ وەردەدا ، باشترین جیهاد دەکاو پاشان لە لایەن خوای گەورە بە مەزنترین پاداشت و ڕەزامەندی پاداشت دەدرێتەوە ، هەروەها لە لایەن پێغەمبەری خواش ﷺ دوعای خێرو هیدایەتی بۆ دەکرێ ...

لە نیوەی ساڵی سێیەمی کۆچی و مانگی ڕەبیعی یەکەم (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) لەگەڵ هەندێك لە برا یاوەرەکانی لە موسڵمانان هەڵدەستێت بە گەورەترین و مەترسیدارترین پاڵەوانیەتی مێژوو بۆیان تۆمار دەکات لە گەشترین لاپەڕەکانی بە پیتی زێڕین ....

( کەعب کوڕی ئەشرەف)ی جولەکە یەکێك بوو لە دانیشتوانەکانی شاری مەدینە و ، شاعیرێکی دەم پیس و جوێن فرۆش بوو ، بەزمانە لووسەکەی و قسەی خراپ و پیسەکانی موسڵمانانی ئازار دەدا ، پیاوێکی دەوڵەمەند بوو هەندێك لە سوودمەندەکان لە دەوری کۆبووبوونەوە کەوا ماڵی پێدەبەخشن و ، ئەوانیش گوێڕایەڵی قسەکانی ئەم جولەکەیان دەکردو بۆی مل کەچ بوون

ئەوەی زۆر دڵی پێغەمبەری خوای ﷺ تەنگ کردبوو جوێنەکانی کەعب بوو ، ئازاری ناموسی موسڵمانانی دەدا ، خەڵکی لە پێغەمبەر ﷺ هان دەدا ، لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانەی باس کرد بەرامبەر برا موسڵمانەکانی ......

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

- کێ هەیە بۆ کوڕی ئەشرەف ، ئەمە لەسەر دوژمنایەتیمان سوورە و قسەمان پێدەڵێت و ، چووە بۆ لای گاورەکانی مەککە کۆیکردوونەتەوە بۆ جەنگ لەگەڵمان

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) گوتی :-

- من ئەم کارەت بۆ ئەنجام دەدەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ....

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

- تۆ بۆ ئەم کارە ، ئەگەر ئەم کارەت کرد پەلە نەکەیت تا ڕاوێژ لەگەڵ (سەعدی کوڕی موعاذ ) نەکەیت .....

پێغەمبەری خوا ﷺ وای پێچاك بوو (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) ئەم کارە ئەنجام نەدا بەبێ بیروڕای (سەعدی کوڕی موعاذ) - خوا لێی ڕازی بێت - لەبەر ئەوەی تاقیکردنەوەی ڕۆژگاری لەگەڵ جولەکە هەیە ، هەروەها گەورەی نەتەوەکەشیەتی لە بیروڕاکانی کار دەکەن و مل کەچن بۆ ئامۆژگارییەکانی

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و هاوڕێکانی ڕۆیشتن بۆ ماڵی (سەعدی کوڕی موعاذ) بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێبکەن بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە سەربازییە گیان فیداییە ئەویش پێی گوتن :-

بڕۆنە لای سکاڵای نەبونی بۆ بکەن ، داوای خۆراکی بە قەرز لێبکەن

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)و هاوڕێکانی (ئەبو نائیلەو عبّاد کوڕی بەشیر و ، حەریث کوڕی ئەوس و ئەبو عبس کوڕی جەبر) کاریان بە ئامۆژگارییەکانی (سەعد) کرد ، ئەوەبوو سێ ڕۆژان مانەوە ، لەم ماوەیەدا نە لە مزگەوت و نە لە شوێنە گشتییەکان نەیان دەبینین ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی پرسین و ، ئەوەبوو ناردیە دوای (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)

کاتێك لە خزمەتی ئامادەبوو پێغەمبەری خوا ﷺ بینی بێ هێزی پێوە دیارەو لاواز بووەو قسەو جووڵە بە هێواشی دەکات ، ئەویش پرسیاری لێکرد دەربارەی ئەو هۆیە

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)ش گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەڵێنێکی وام بە تۆ داوە نازانم ئایا دەتوانم جێبەجێی بکەم ، ئەمە وای لێکردوومە بشێوێم و دڵەڕاوکێ بمگرێ ...

پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیای کردەوە و پێی گوت :-

- ئەوەندەی لە توانات دا هەیە بۆی ماندوو بیت

پاشان دوعای خێری بۆکردو ، ئەم و هاوڕێکانی دڵنیا کردەوە کەوا هەر دەگەن بە ئامانجەکانیان و با بەڵێنەکانی خۆیان بەجێبگەیەنن بە پشتیوان و یارمەتی خوا

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) گوتی :-

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت ئێمە قسەیەك بکەین ( کەعب) پێی دڵخۆش بێ ، بۆ ئەوەی پێی بکەین و بتوانین بیکوژین .

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوت :-

- چۆن دەست پێ دەکەن لەمە ئازادن ...

ڕۆژێك لە ڕۆژان (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و هاوڕێکانی ڕۆیشتن تاکو گەیشتنە (کەعب) لە قەڵاکە کەوا دروستی کرد بوو وبۆ خودی خۆی ، پێیان گوت :-

ئەم پیاوە - واتە پێغەمبەری خوا ﷺ داوای سواڵمان لێدەکات ، ئێمە هیچمان نەما بۆ ئەوەی بیخۆین ، ئێمە بۆ لای تۆ هاتووین داوای قەرزت لێبکەین

کەعب گوتی :-

- بەڵێ ، سوێند بەخوا لێی بێزار دەبن

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) گوتی :-

ئێمە بەدوای کەوتووین حەز ناکەین وازی لێبهێنین تاکو تەماشا نەکەین بزانین کاری بە کوێ دەگات ، ئینجا ویستمان زەمبیلێك یان دوو زەمبیلمان بە قەرز بدەیتێ

کەعب گوتی :-

- کوانێ خواردەمەنیەکانتان ؟!

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) گوتی :-

- بەخشیمانە سەر ئەم پیاوە واتە پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرەکانی

کەعب گوتی :-

ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بزانن ئێوە لەسەر ناهەقن ؟

ئیتر هەر هەوڵیان دا لەگەڵی بون سۆزیان ڕاکێشا تاکو ڕازی بوو ، بەڵام گوتی :-

ئافرەتەکانتان با لە لام بێت واتە ڕەهن بێت

پێیان گوت :-

- چۆن ئافرەتەکانمان لەلات ڕەهن بێت لە کاتێکدا تۆ جوانترینی عەرەبانی و لێت دڵنیا نین ، هیچ ئافرەتێك ناتوانێت لە بەرامبەرت خۆت ڕابگری ؟

گوتی :-

- کەواتە منداڵەکانتان بکەن بە ڕەهن ؟

پێیان گوت :-

- چۆن منداڵەکانمان لەلات بکەین بە ڕەهن خەڵك دەڵێن ئەم منداڵانە بە زەمبیلەیەك یان دوو زەمبیلە ڕەهن کراون ؟ ئەمە ڕیسواییی‌یە بۆ ئێمە ، بەڵام چەکەکانمان دەکەین بە ڕەهن لە لات هەروەك دەزانیت چەند پێویستیمان پێ هەیە !!

- کەعب بەمە ڕازی بوو

ئەم قسەیان پێ گوت بۆ ئەوەی لێیان یاخی نەبێت یان گومان بخاتە کارەکەیان کاتێك بگەڕێنەوەبۆ چەکەکانیان ، پاشان بەڵێنیان دا بۆ گەیشتنی دووەم

لێرەدا خاوەن گفتوگۆ لەگەڵ ( کەعب ) ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) بوو - خوا لێی ڕازی بێت - هەروەها (ئەبو نائلە ) یەکێك بوو لەم یاوەرانەی هاوڕێیەتی کوڕی مەسلەمەی کرد لەم پاڵەوانەتی‌یە لەبەر ئەوەی پەیوەندی‌یەکی بەهێزی لەگەڵ (کەعب) هەبوو چونکە برای شیری بوو ، ئەوەش گومانی لەسەر لابردن (کەعب) دڵنیا بوو لە نیازی چاکیان

*　　　*　　　*

له شەوی چواردەهەمینی ڕەبیعی یەکەم پاش ئەوەی بیست و پێنج مانگ بەسەر کۆچکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و هاوڕێکانی دەرچوو تاکو سنووری مەدینە و خواحافیزی و ماڵ ئاوایی لێکردن تاکو گەیشتنە (ناوچەی غەرقەد) پاشان پێی فەرموون :-

- بەڕێکەون بە ناوی خوا ، پەروەردگارا یارمەتی‌یان بدە

ئەم شەوە مانگەشەو بوو تاکو گەیشتنە قەڵاکە (ئەبو نائلە) بانگی (کەعب)ی کرد ، پاشان یاوەرەکانی تریش خۆیان پێ‌ناساندو ناسینەوە ، بە خێرایی هەڵسا لە نێو جێگاکەی خێزانەکەی ویستی قەدەغەی بکات خێزانەکەی تازە بووك بوو پێی گوت :-

- تۆ پیاوێکی شەڕکەری‌و ، خاوەن شەڕکەر لەم کاتانە دانەبەزن ، من گوێم لە دەنگێك بوو ئەگەر لە کاتی شەویش بانگ کرا بۆ کارێك دەبێت ئامادە بێت

پاشان بەجێیهێشت و چووە لای کۆمەڵەکە زۆر قسەیان کرد ، پاشان ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) بە کەعبی گوت :-

- ئایا دەتوانی ئەی (کوڕی ئەشرەف) لەگەڵمان بێیت بۆ (ناوچەی عەجوز) - (ناوی جێگایەکە لە قەڵاکە نزیك بوو) - ئەوەندەی‌کاتی شەو ماوە قسە بکەین

پێی گوتن :- چۆن حەز دەکەن !!

دەرچوون‌و دەڕۆیشتن ، پاشان (ئەبو نائلە) دەستی بردە بن سەری (کەعب)و بۆنی کردو گوتی :-

- وەکو ئەم شەو بۆنی وا خۆشم نەکردووە ئەم کارەی (ئەبو نائلە) پێی هەڵسا نهێنی‌یەك بوو ئەم کۆمەڵە لەسەری ڕێکەوتبوون ، پاشان بەردەوام بوون لەسەر ڕۆیشتن و قسەیان دەکرد ، دووبارە (ئەبو نائلە) دەستی بردەوە بن سەری (کەعب) بەڵام ئەمجارەیان پرچی‌گرت و گوتی :-

- لە دوژمنی خوا بدەن ....

هەر هەموویان بەلێدانی یەك پیاو لێیان دا ، هاوارێکی لێ‌هەڵسا هەموو خەڵکی قەڵاکەی بە ئاگا هێناو ڕوناکی‌یان هەڵکرد پاشان (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) - خوا لێی ڕازی بێت - شمشێرەکەی خستە نێو سینگی (کەعب) و بەهەموو هێزێکی پاڵی‌دا تاکو لە پشتی دەرچوو ، کەوتە سەر زەوی ، سەری لە لەشی جیاکردەوە و هەڵیانگرت لەناو زەمبیلەیەك و بە خۆشی ڕۆیشتن و گەڕانەوە شاری مەدینە ....گەڕانەوە بە سەری ( کەعب) کاتێك گەیشتنە (شوێنی غەرقەد) تەکبیریان لێدا

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە دەنگی تەکبیریان بوو ئەویش تەکبیری لێداو زانی ئەوانن کوشتوویانە ، پاشان گەیشتنە لای‌و هەواڵیان دایێ بە کوشتنی دوژمنی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموون :- ئەم ڕووانە سپی بوون - واتە ڕزگار بوون لە ئاگر -

گوتیان :- ڕووی تۆش پێغەمبەری خوا ﷺ

پاشان سەرەکەیان فڕێدا پێشی‌و ستایشی خوایان کرد لەسەر کوشتنی

* * *

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) قارەمانێك بوو نەیدەزانی هەڵاتن چیە لە جەنگ هەرچەندە جەنگ توندتر بوایە و دژوار تر بوایە گوڕەپان ڕمو شمشێری تێنەچووبایە ، بەڵکو دەتبینی وەکو چیایەکی چەسپاو نەدەلەرزیو گەردەلوول کاری تێنەدەکرد

ڕۆژی (ئوحد) خۆڕاگر بوو لەگەڵ چەند ژمارەیەکی کەم کەوا چەسپان لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ پاراستیانو خۆیان بە قوربانی کرد ، کاتێك خۆشەویست ﷺ بریندار بوو ، زۆر تینوو بوو ئیمامی عەلی – خوا لێی ڕازی بێت – هاتە لای بە هەندێك ئاو بۆ ئەوەی برینەکەی بشوات ، ئاوەکەی وەرنەگرت ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) لە ڕیزەکان دوورکەوتەوە بە نیازی لەدوا گەڕانی ئاوێکی پاكو بێگەرد ، ئاوێکی شیرین و پاکی هێنا ، خۆشەویست ﷺ ئاوەکەی خواردەوەو ، دوعای خێری بۆ کوڕی مەسلەمە کرد

مسوڵمانان جەنگێکی توندیان لەگەڵ جولەکەکانی خەیبەر کرد ئەوەبوو دەستێکی چاکیان لێوەشاندن ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) برایەکی هەبوو ناوی (مەحموود) بوو ، جەنگێکی یەکجار مەزنی کرد تاکو وای لێهات توندی گەرماو قورسی چەکەکەی تینی لێبری ، ناچار بوور پەنا بباتە بەر سێبەری ئەم قەڵایەی جەنگیان تیادەکرد بۆ ئەوەی تۆزێك پشوو بدات و ماندوو بوونی جەنگی لەسەر لابچێ ، بەردێکی گەورەیان لەسەر قەڵاکە بەرداوە سەر سەری(خوذە) کەی سەری تێك شکاو ، پێستی نێوچەوانی کەوتە سەر ڕووی ، چاوێکی دەرهات ، موسڵمانان پێیان زانی و گواستیانەوە لای پێغەمبەر ﷺ پێستەکەی بۆ بردەوە شوێنی خۆی و بە قوماشێك بەستایەوە ، بەڵام – خوا لێی ڕازی بێت – بە شەهیدی مرد لەبەر گەورەیی برینەکەی ....

کاتێك برایەکە (محەممەد) بە شەهیدبوونی براکەی زانی هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی :–

– ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جولەکەکان برای منیان کوشتووە

هەروەك بڵێت – خوا لێی ڕازی بێت – خەڵکەکە هان بدات بۆ جەنگ ، داوای لێکردن تۆڵەی خوێنی شەهیدان بکەنەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :–

داوای گەیشتن بە دوژمنان مەکە ، داوای ساغو سەلامەتی لە خوا بکە ئێوە نازانن تاقی دەکرێنەوە ، ئەگەر پێیان گەیشتن بڵێن :–

(پەروەردگار تۆ خوای ئێمەو ئەوانی ، گیانی ئێمەو ئەوان لە دەست تۆیە ، خۆت بیانکوژە) پاشان لەسەر زەوی دانیشن ئەگەر ئێوە لەوان بزر بوون هەڵسنەوەو تەکبیر لێبدەن

ئەم وتانە کاری کردە سەر دەروونی (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و کارێکی باشی لێکرد ، دەروونی دامرکایەوە پاش ئەوەی تینی لێهەڵسابوو ، گیانی دڵنیا بوو پاش ئەوەی هەڵچوو بوو

موحەممەد گەڕایەوە دەستی بە جەنگ کردەوەو هەروەها دیمەنی شەهید بوونی براکەی (مەحمود) هەرگیز لە پێش چاو وون نەدەبوو و ساتێك لە خەیاڵی دەرنەدەچوو ، تاکو خوای گەورە سەرکەوتنی ڕەوانە کرد بۆ مسوڵمانان

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) هەموو دیمەنەکانی پاش جەنگی خەیبەری بینی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموویان سوار چاکی گۆڕەپان بوو شکستی نەدەخوارد ، قارەمانێك بوو بەژێر نەدەکەوت نە لە تەبوك و نە لە فەتحی مەککەو نە لە حونەین

پاش کۆچی دوای پێغەمبەری خوا ﷺ ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) بەوەفا بوو لەگەڵ خەلیفەکانی ، لە زەمانی ئەبوبەکر – خوا لێی ڕازی بێت – هەڵسا بە ڕێکخستنەوەی ئەو دەزگایەی دروست کرا (سوپای نەهێشتنی هەڵگەڕاوەکان) پەلاماری کوفرو شیرکیان لادا لەسەر موسلمانانو ، بەشداریەکی مەزنانەی کرد لە گێڕانەوەی ئالأی شکۆداری ئیسلام لە ناوچەکانی (جزیرە)

بەڵام لە زەمانی ئیمامی عومەر – خوا لێی ڕازی بێت – کارەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی ئیسلامی گرتە دەست پاش ئەوەی لە چالاکی‌یە جەنگی‌و سەربازی‌یەکان دوورکەوتەوە ، بوو بە ووردبین‌و سەرپەرشتیکار لەسەر کاربەدەست‌و دەسەلاتدارەکان تێیدا تەقاریری بەرز دەکردەوە بۆ خەلیفە

(موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)– خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێت :–

{پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرێکی پێدام و فەرمووی شەڕ لەگەڵ بێباوەڕەکان بکە ، ئەگەر پەرتەوازە کەوتە نێو موسڵمانان ، ئەم شمشێرە لەسەر بەردێك بشکێنە ، پاشانیش دانیشتووی ماڵی خۆت بە }

حوذەیفەی کوڕی یەمان – خوا لێی ڕازی بێت – دەفەرموێت :–

{ من پیاوێك دەناسم فیتنە زیانی پێناگەیەنێت :ئەوی (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە)یە }

ئینجا پاش ئەوەی ئیمامی (عثمان) شەهید دەکرێ ، (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) لە خەڵك دوورکەوتەوەو دانیشت

ئینجا لەسەر ئەم حاڵەی خۆی مایەوە تاکو لە تەمەنی حەفتاو حەوتساڵیدا کۆچی دوایی کرد

ڕەحمەتی خوا لە قارەمانی گیان فیدا (موحەممەدی کوڕی مەسلەمە) و– خوا لێی ڕازی بێت –

*　　　*　　　*

٤٦

# عبداللّـەی کـوڕی عامیـــــر

## ڕزگارکەری خوراسان و ئەفغانستان

٤٦

# عبداللەی کوڕی عامیر
# رزگارکەری خوراسان و ئەفغانستان

(عبداللّە) لە ساڵی چواری کۆچی لە شاری مەککە لە دایك بووە

(عبداللەی کوڕی عامیر کوری ڕەبیعە) بنەماڵەکەی دەگەڕێتەوە بۆ باپیری پێغەمبەری خوا ﷺ (عبدمناف) ، بەڵام داپیرەی واتە دایکی عامیر کەوا (أم حکیم) نازناوی (البیضاء) کچی عبدالمطلب ، پووری پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەها کوڕی خاڵی گەورەمان (عثمان کوری عفان)ە – خوا لێی ڕازی بێت –

کاتێك خودای گەورە سەرکەوتنی خۆی ڕەوانە کرد بۆ پێغەمبەرەکەی بە ڕزگارکردنی شاری مەککە و سەرکەوتنێکی بێوێنە بەسەر قورەیش و هاوبەش پەیداکەرەکان ، (عبداللەی کوری عامیر)یان بۆ هێنا لە کاتێکدا منداڵێکی بچووك بوو ، بە پێغەمبەریان وت : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەوە کوڕی (سولەمە)یە

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی :– بەڵێ ئەمە کوڕی ئێمەیەو ، لە هەمووتان زیاتر لە ئێمە دەچێتو ، ئەمە بەختەوەرە

نزاکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ (عبداللّە) کارێکی مەزنی کردە سەر چارەنووسی (عبداللە) بوو بە پیاوێکی بە بەرەکەتو پیرۆز بە دیارکەوت لە نێو هاوشانەکانی ، بوو بە بڕوادارێکی دروستو چاکەخوازو دەستپاكو دڵ فراوان و چاوتێر ، بەهەر شوێنێك دا تێپەڕبوایە ئەوا خێرو بەرەکەتی بۆ بەجێدەهێشتن

لەپاش ئەمە (عبداللّە) بەهەر خاکێك دا بڕۆیشتایە ئاوی تیا نەبوایە ، فەرمانی بە هەندێك لە موجاهیدەکانی دەکرد خاکیان هەڵدەکەند ئاوێکی یەکجار زۆریان دەبینییەوە ..

(عبداللّە) لە ماڵێك لە ماڵەکانی شاری مەککە پەروەردە بوو هەموو هۆیەکانی گەورەییو شەڕەفو چاوتێری و دڵفراوانی تیا بوو ، لەبەر ئەوە گەنجێکی سەخیو ورە بەرزو ئازاو بە جەرگی لێ دەرچوو ....

کاتێك (عبداللّە) تەمەنی پیرۆزی گەیشتە بیستوچوار ساڵی کەوا تاکو ئەم کاتە بەشداری هیچ جەنگو جیهادێکی نەکردبوو ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا گەیشتبوو بە هەموو ڕاهێنانێکی سەربازی و ، سیفەتی سەرۆکایەتیو سوارچاکی پێوە دیار بوو

هەروەها بەشێکی زۆری خاکی فارس تا ئەم کاتە ڕزگار نەکرابوو ، لە سەردەمی گەورەمان عومەری کوری خەتتاب – خوا لێی ڕازی بێت – چەند بەشێکی دیاریکراو ڕزگار کرا ، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا چەند هێزێکی کۆکراوەی قین لە دڵ لە دەوڵەتی فارسی خاپوور کراو بە دەستی فارسەکانەوە مابووەوە ئەم هێزانە سات لە دوای سات کۆدەکرانەوە بۆ پەلاماردانی سوپای ئیسلامی لە کاتی ڕۆیشتن و جێگیربوونیان دا

هـەولدان بـۆ زاڵ بـوون بەسـەریان و لـەناوبردنیان و، گێڕانـەوەی فەرمانڕەوای یـە ستەمکارەکانیان بۆ سەر شارو ناوچەو میللەتەکان

لـە پـاش کۆچـی دوایـی ئیمـامی عومـەر – خـوا لـێی ڕازی بێـت – گەیشـتنی بـە پەروەردگاری مەزن ، زۆربەی شارە فارسەکان هەڵگەڕانەوە لە موسڵمانان

کـاتێك (عثمـان کـوڕی عفـانِ) – خـوا لـێی ڕازی بێـت – جڵـەوی فەرمانڕەوایـەتی خەلافەتی گرتە دەست ، (عبداللەی کوڕی عامیر)ی کرد بە کاربەدەست لەسەر بەسرا و فارس ، هەروەها (ئەبو موسای ئەشعەری)ی لابرد لەسەر فەرمانڕەوایەتی بەسرا ، (ئەبو موسای ئەشعەری) هەڵسا وتارێکی بۆ خەڵکی بەسرا داو گوتی :–

گەنجێك دێت بۆ لاتان داپیرەو پوورەکانی بەڕێزن ، ئینجا یاریدەدەرەکانی خۆی بۆ کۆکردەوە

دەبێت ئەمەش بزانین لەم کاتەدا (ئەبو موسا) – خوا لـێی ڕازی بێـت – بـەلادانی لەسـەر کـار دڵگـران نـەبوو و ، خوانەخواسـتە هـۆی لادانـی لەبـەر کەمتەرخـەمی و نەشیاویش نەبوو ، بەڵکو (ئەبو موسا) ڕێزی لە فەرمانڕەوای نوێ ناو هـەموو کـاتێك لەبەرچاوی خەڵك باسی سیفەت و ڕەوشتە بەرزەکانی دەکرد

کاتێك (عبداللە) کاروباری ئەم دوو ناوچەیەی وەرگرت واتە ( بەسرەو فارس ) ئەم گـڕو دوکەڵـە ڕەشـەی کوژانـدەوە کـە لـە زۆربـەی شـوێنەکانی وڵاتـی فـارس و ناوچـە فـەرمانڕەواکانی ڕووی دابـوو، بـە هـۆی ورەو ئەندێشـەو بڕیارەکـانی و چـاکی سیاسـی سەبارەت بە سەرکردایەتی سەربازەکانی و ڕێنمایی و ڕاپەراندنی نەخشەو فەرمانەکانی

ئەم یاوەرە بەڕێزە تەنها کاری نەخشەی جەنگ و غەزایەکان نەبوو خۆشی جوڵە نەکات لەسـەر کورسی دەسـەڵات و پـاڵ بداتـەوە لـە سوچێك لـە سوچەکانی کۆشـکەکەی ، بـەڵکو سـەرکردەی سـەربازەکانی بـوو ، پێشـەنگی سوپاکەی بـوو خـودی خـۆی بـە پێشـیان دەکەوت و ناخۆشی یەکانی دەبڕی ، ئینجا وای لە سەربازەکانی دەکرد زیاتر گەرم بن و بەرگری لە ئیسلام بکەن ....

بەم جۆرە بەردەوام ئەم قارەمانە ئیسلامی یە (یەزدەجەرد)ی لـەم شـوێن بـۆ ئـەو شـوێن دەردەکرد تاکو گەیشتە سەری و کوشتی ، بە مردنـی (یەزدەجـەرد) دەوڵـەتی کیسـرای ساسانی پوکایـەوەو ، وڵاتـی فارس بـە تـەواوی بـۆ موسـڵمانان مـل کـەچ بـوون و ئـاڵای شەکاوەی یەکتاپەرستی لە هەموو ناوچەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەرز کرایەوە

وا باشـە پێش ئـەوەی تێپـەڕین بەسـەر داسـتانی ئـەم یـاوەرە مەزنـە (عبداللـەی کـوڕی عامیر) لە خۆمان بپرسین :–

ئایا چۆن موسڵمان لـەم کاتـە کـورت و کەمـە لـە کاتێکدا ماوەیـەکی زۆر دوور بوون لـە نیشتمان و پایتەختیان – مەدینەی منەوەرە – توانیان ئەم دووری یە دوورو درێژە ببڕن ، هەروەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت بەم جۆرە ئەم ڕێگا باریکە شاخاوی یە ترسناکەیان دەبڕی و ، پاشان دەسەڵات وەربگرنەوە لە وڵاتی شام و میسرو فارس ؟؟؟

لە کاتێکدا چەکەکانیان باشتر نەبوو لە چەکی دوژمنەکانیان ، بەڵکو ئەم چەکانـەی لـە دەست فارس و ڕۆمەکان بوو باشترو بەهێز تر بوون لە چەکی موسڵمانان

ئیتر دەبێت ئەم پرسیارە وەڵامی نەبێت ؟
ئەمەش گومانی تێدا نی یە ئیمان و ورەی بەرز و بیروباوەڕی پتەو و بێگەرد بوو پاڵی بەو موسڵمانانە نا دەست بەسەر سەنگەری دوژمنەکانیان دابگرن لەگەڵ کەمی چەك و تەقەمەنیان کوفرو هاوبەش پەیداکەران لە مەیدانی جەنگ دا هەڵوەرین و کەوتنە سەر زەوی ، هەروەك مێش هەڵدەوەرێت ، ئەوەی هەڵات رزگاری بوو و هەروەك چوار پێ بۆی دەرچوو ، ئەمەش گەورەترین سەرکەوتن بوو بۆ هەڵاتووەکان گیانیان لە دەست نەدا !! هەروەك شاعیر دەڵێت :-

ان هذي القلــوب وهی دماء قد تفل الاسیاف وهی حدید

ئەوەی گومانی تیا نی یە کەوا مێژوو تاکو ئێستا ناوی ئەم سەرکردە مەزنانەی بەدەست نەهێناوە وەکو ئەوەی مێژووی کۆن بە دەستی هێناوە نموونەی پێشەنگیان (عبداللەی کوڕی عامیر) - خوا لێی ڕازی بێت - رزگارکەری خوراسان و ئەفغانستان و ، نموونەی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) و (نوعمانی کوڕی موقرین) - خوا لێیان ڕازی بێت - کەوا ئەم سەرکەوتنانەیان بەدەست هێنا لە (قادسیەو نەهاوەند) ، هەروەها خالیدی کوڕی وەلید - خوا لێی ڕازی بێت - کەوا گەورەترین شکستی هێنا بە سوپای ڕۆم لە جەنگی یەرموك .....

* * *

ئێستاش دەگەڕێینەوە بۆ پێداچوونەوەی قسەکانمان ، دەڵێین :-
کاتێك (عبداللەی کوڕی عامیر) گەیشتە بەسرا بەفەرمانڕەوایەتی خوای گەورە ڕێگای ئاسان کرد بۆ هەڵبژاردنی سەرکردەو یاریدەدەرەکانی لە باشترین ئەندام و خاوەن توانای بەرز لە خووڕەوشت و ئایین و ئازایەتی بە دڵسۆزی و ڕاستگۆیی هاوکاریان کرد لە گۆڕەپانی جیهادو خۆڕاگری دا ، تاکو خودای گەورە لەسەر دەستیان وڵاتێکی زۆر ئازاد کرد
کاتێك خەڵکی فارس یاخی بوون لە گوێڕایەڵی یەکێك لە سەرکردەکانی عبداللە ، ئەویش (عبداللەی کوڕی مەعمەر) بوو ئەوە بوو شەڕی لەگەڵ کردن تاکو شەهید بوو ، (عبداللەی کوڕی عامیر) بە پەلەو خێرا سوپایەکی گەورەی ڕێکخست لە بەسرا بۆ فارس لە پێشەوەیان (عثمان کوڕی ابی العاص) و ، لە لای ڕاستیان ( ئەبو بەرزەی ئەسلەمی) و ، لە لای چەپیان (مەعقیل کوڕی یەسار)و ، سەرکردەی سوارچاکان (عیمران کوڕی حوصەین) بوو
ئینجا گەیشت بە هەڵگەڕاوە ئاژاوەگێڕەکان کەوا خوێنی سەرۆکەکەی خۆیان ڕشتبوو لە شوێنێك پێی دەڵێن (اصطخر) کەوا شارێکی سەختوپتەوی فارسەکان بوو و شورەی بەهێزی هەبوو ، ژمارەیەکی زۆریان لێکوشتن و ، پاشان چوونە ناویەوەو گەیشتن بە شکست خواردووەکان و کەوتنە دوایان و سەرکەوتن بەسەریان و، هەموو شارە هەڵگەڕاوەکانیش مل کەچ بوون و ، ئاژاوەکە کوژایەوە

تێناپەڕین بەسەر ناوی ئەم سەرکردانەی کەوا لەگەڵ (عبدالله) بوون لەم هەڵمەتەی کە پێی هەڵسا ، تاکوچاوێك بەم تێبینی‌یە گرنگە بنەخشێنین ، ئەمەش چەند ناوێکی بەرزن لە مێژووی ئەم فەتحانە بە پرشنگدارترین و پاکترین ناو دەژمێردرێن

هیچ گومانەکیش نی‌یە سەرکردایەتی (عبدالله) بەڵگەیەکی ئاشکرایە لەسەر مەزنی کاروباری و بەرزی فەرمانەکانی .... کاتێك گەڕاوە بەسرا ، دووبارە خوراسان بۆ جارێکی تر ئاگری ئاژاوەیان هەڵکردەوە ، (ئەحنەف کوڕی قەیس) هاتە لای و پێی گوت :-

ئەی ئەمیر :- دوژمنانت لەبەرت هەڵدێن و ، لێت دەترسن و ، وڵات فراوانە ، بەڕێکەوە خوا بەسەرت دەخات و ئایینەکەی خۆی سەربەرز دەکات

(عبدالله) گوێی لە ووتەکانی (ئەحنەف) بوو و هەموو ئەندامەکانی لە مانای ئەم ووشانە گەیشتن ، پاشان بەڵێنی بڕیاردانی‌دا بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە ، پشت بەخوا

* * *

(عبداللەی کوڕی عامیر) لەگەڵ سەربازەکانی بەڕێکەوت بۆ نیشاپور ، لە پێشەوەیان (ئەحنەف کوڕی قەیس) بوو کەوا ناسرابوو بە ئامۆژگاری و قسەی هەق ، پاش ئەوەی بە دوژمنان گەیشتن ، سەربازەکان بەرگری‌یان لە خۆیان کرد لەناو شورەکانیان و دەرگایان لەسەر خۆیان داخست ، بۆ ماوەی مانگێك ئابلۆقەیان دان و بارمەتی و خواردنیان لەسەر بڕین و ، پاشان پەلاماریان دان و دەرگاکانیان کردەوە ، خەڵکەکە سەریان بۆ شۆڕکردن و ، مل کەچیان بوون

پاشان دەستی بە ڕۆیشتن کرد لە خاکی فارس بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و ، وانەیەکی چاکیان دا بە هەڵگەڕاوە و ئاژاوەچی‌یەکان ، تاکو هەمووکارێکیان بۆ ئاسان ، هەموو دەسەڵاتێکیان گەڕاوە ژێر دەوڵەتی ئیسلام ، پاش ماندووبوونێکی زۆر سەرکەوتنیان بەدەست هێناو ، گەورەترین و توندترین ناخۆشی‌یان چەشت لەگەڵ موجاهیدەکان لەژێر شەوانی تاریك و درێژو ناخۆش

* * *

کاتێك ئەم سەرکەوتنە مەزنە بۆ (عبداللەی کوڕی عامیر) کۆتایی هات پێیان گوت :-

ئەم سەرکەوتنانەی خوا بۆ تۆی ڕەخساند بۆ کەسی تری نەڕەخساند

ئەویش گوتی :- منیش ئێستا سوپاسی خوا دەکەم ، هەر لەم شوێنە ڕوو لە حەجی ماڵی خوا دەکەم

پاشان ئیحرامی لە (نیشاپور) بەست و فەرزی حەجی بەجێگەیاند و ، زیارەتی شاری مەدینەی کرد ، لەگەڵ گەورەمان (عثمان کوڕی عفان) کۆبۆوە وەکو قسەکەرێك و ئامۆژگاری وەرگرێك ، هەروەها ماڵێکی زۆریشی بەخشی بەسەر هەژاران .

(عبداللەی کوڕی عامیر) - خوا لێی ڕازی بێت - بڕوادارێکی ئیمان پتەوو لەخواترس و پاك و سەخی و لێبووردەو بێفیز بوو .... بەم جۆرە سوپاسی خوای گەورەی دەکرد لەگەڵ ماڵبەخشینی و سەخاوەتی و ، مل کەچ و ، ئامادە بوو بۆ

گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خواو پەرستنی خوای گەورە ڕاستی فەرمووە کە دەفەرموێت :-

﴿لئن شكرتم لازيدنكم ﴾

وا ڕێکەوت ئامادە بێت لە کاتی ئاژاوەی شەهیدکردنی خەلیفەی موسڵمانان (عثمان کوڕی عفان) - خوا لێی ڕازی بێت - بەزمان و شمشێر بەرگری لە خەلیفەی موسڵمانان کرد بەڵام ویستی خوا تەواو ببوو ئەوەی ڕویدا ڕویدا

(عبداللەی کوڕی عامر) - خوا لێی ڕازی بێت - پیاوێکی ورە بەرزو شوێن دیارو زۆر حەزی لە ئاوەدان کردنەوە دەکرد ، هەروەك مێژوونووسەکان دەڵێن :- (عبداللەی کوڕی عامر) بڕیاری دابوو نێوانی عێراق و حیجاز بگەیەنێت بە چەند گوندی ئاوەدان و ئاوی ڕۆیشتوو ، هەروەها ڕێگای کاروانەکان خۆش بکات ، ئەوە بوو هەندێك لەم بڕیارانەی ڕاپەڕاند ، سێ لقی لە ڕووبارەکان هەڵکەند ئەمانەش - ڕووباری بەسرەو ڕووباری (ام عبدالله) و ڕووباری (أبله) بوون ، پاشان باخچەیەکی زۆری لەبەرچاندن و ، کانیاوی زۆری دروست کرد لە ڕێگای شار ، هەروەها لە (عرفه) چەند حەوزێکی دروست کردو ئاوی بۆهێنان ، بەم جۆرە زیاتر بە (عبدالله) پەیوەست بوون و زیاتر خۆشیان ویست ، تاکو جارێکیان (معاویه) پرسیاری کرد لە (قوبەیصەی کوڕی جابر) :-

- کێ دەبینن ببێت بە خەلیفە لەدوای من ؟

قوبەیصە گوتی :- گەنجێکە بە شەرم و نەرم و سەخیە ئەویش ( کوڕی عامر)ە

(معاویه) پێی گوت :- ئەم کارەی بە تۆ سپێردرا بوو تەسلیمی بکەرەوە تووڕە مەبە (واتە ویلایەتی بەسرا) .

عبدالله گوتی :- جێبەجێم کرد

- ئەو موڵك و ماڵەی لە (عرفه) لە لاتە بیگێڕەوە بۆ من .

عبدالله گوتی:- جێبەجێم کرد

پاشان (عبدالله) گوتی :- منیش سێ پرسیارت لێدەکەم ئەی گەورەی بڕواداران ، تۆش بڵێ جێبەجێم کرد

من کوڕی (هیند)م .

(عبدالله) پێی گوت :-

- ئەو ماڵەی لە (عرفه) هەمە بۆم بگێڕەوە

معاویە گوتی

- ئەو ماڵەی لە (عرفه)یە بۆ تۆم گێڕایەوە ....

(عبدالله) پێی گوت :-

- کچەکەتم لێ مارە بکە کەوا (هیند)ە

معاویە گوتی :- جێبەجێم کرد ...

(عبدالله) پێی گوت :-

لە پیاوەکانم پرسیار مەکەو بە دوای کاروبارم دامەچۆ ...

معاویە گوتی :- جێبەجێم کرد ...

(معاويه) كەيف خۆش بوو بەوەی (عبدالله) ببێت بەزاوای لەبەر ئەوەی دەیویست (عبدالله) هەموو كات لەپێش چاوی بێت ، لەترسی ئەوەی نەوەك چاوی لە خەلافەت بێت

بەڵێ (عبدالله) ئەم پیاوە بوو لەسەر زمانی خەڵك ناوی دووبارە دەبوویەوە و ، هەروەك پاڵێوراوێك بۆ خەلافەت پاش (معاويه) ، بە پێشەخۆیان دەخست و ڕێزیان لێدەنا وایان تێدەڕوانی كەوا دەشێت بۆ سەركردەی ئیسلامو موسڵمانان

ئینجا براو خوشكە موجاهیدەكان ئەگەر پیاوێك ئەمە شوێنو سیفەتی بێت جێگای خۆیەتی لەنێو سەرۆكو ڕاگەیاندنەكانمان باسی لێوە بكەین و ، خوورەوشتو سیفەتەكانی بكەین بە نموونەو سەرمەشقی خۆمان هەروەها شیاوی ئەمەشە – خوا لێی ڕازی بێت – ناوی تۆمار بكەین لە تۆمارگەی نەمرەكانو شیاوی ئەمەشە بگات بە بەهەشتی نەعیم ، بەهۆی ئەم جیهادو خواپەرستیەی

كاتێك كار بە تەواوی جێگای خۆی گرت لە لایەن (معاويه) ، (عبدالله)ی لەسەر بەسرەو خوراسانو سوجوستان لابردرا ، ماوەیەك ژیا تاكو تەمەنی پیرۆزی گەیشتە پەنجاوچوار ساڵان گەیشتە ئەجەلی نووسراوی خۆیو بە پەروەردگاری خۆشەویستی گەیشت لە (طائف) بە خاك سپێردرا

خوای گەورە لە پاڵەوانی ئیسلام یاوەری بەڕێز (عبداللەی كوڕی عامر) ڕازی بێت

*　　　*　　　*

## ٤٧

# ئەبو ئومامەی باهیلی
# قارەمانی گۆڕەپانی سوارچاکی و زانست

کەسایەتی ئەم قارەمانەی کەوا ئێستاکە قسەی بۆ ڕەخساندووین و باسی لێوە دەکەین جیانەکرێتەوە بە دوو سیفەتو، دوو ناوی ئاشکرا وایان کردووە ئەم پیاوە بخەنە ناو لیستی قارەمانان ، کەوا مێژوویان بۆ نووسراوە ، ئێمەش بە گوێرەی توانا نوکی قەڵەمی بۆ دەخەینە کارو ، ڕووداوەکانی ژیانی لە سەرەتاوە تا کۆتایی باس دەکەین ، کەواتە ئێمە کەوتینە ناو ڕووداوێك بەرامبەر لوتکەیەکی بەرزی سەرکەش و مەشخەڵێك لە مەشخەڵەکانی سوارچاك و زانست وەستاوین

ئەم دوو سیفەتەش ئەمانەن :-

یەکەمیان :- بوونی (ئەبو ئومامە) - خوا لێی ڕازی بێت - بە پاڵەوانێك کەوا سەرکردایەتی سوپایەکی درادەست پاش سوپای سێسەرکردە لە جەنگی (موئتە) - عبداللەی کوڕی ڕەواحەو زەیدی کوڕی حاریثە و جەعفەری کوڕی ئەبو طالب - (خوا لێیان ڕازی بێت) هەروەها پاش سوپای (ئوسامەی کوڕی زەید - خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕی خۆشەویستی بەرەنگاری ڕۆمەکان بوو بە بەرەنگارییەك تێیدا هێزو شکۆمەندی ڕۆمی شکاند ، بەهۆی سوارچاکییەکەی سەرکەوت بەسەر ئیمپراتۆریەتە ئەفسانەکەی ڕۆم و سوپاکەی کەوا زەمانێك بوو ترس و سامیان لەسەر عەرەب پەیدا کردبوو ، (ئەبو ئومامە) - خوا لێی ڕازی بێت - خزمەتێکی پڕشنگداری سوپای ئیسلامی کرد کەوا جەنگی وڵاتی شامی کرد ، موجاهیدی موسڵمان تێیدا هەستی بە عیزەت و هێز کرد ، ڕۆژێك لە ڕۆژان هەستی بە کەمترین ترس و سام نەکرد لە بەرەنگاربوونەوەی سەربازی ڕۆمانی

دووەمیان :- بوونی (ئەبو ئومامەی باهیلی ) - خوا لێی ڕازی بێت - بەشەرع ناس و فەرموودەناس کەوا زانست و شەرعی خوای لە پاکترین سەرچاوە وەرگرت ، لەدەمی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا هوشیاری کردبۆوەو تێیگەیاندبوو بەچاکترین شێوە ، بێجگە لەمەش باسی پێغەمبەری خوای ﷺ دەکرد بە کۆتا ڕادەی دەم پاکی و دڵسۆزی

بەم جۆرە ئەم یاوەرە بەرێزە - خوا لێی ڕازی بێت - پاڵەوانێکی دیاری گۆڕەپانی شمشێرو سوارچاکی بوو . ئیتر مێژووش باسی سوارچاکی و قارەمانیەتی (ئەبو ئومامە) دەکات ...

(صودەی کوڕی عەجلان) (ئەبو ئومامە) بە بیست ساڵ پێش کۆچی لەدایك بووە ، (ئەبو ئومامە) لەگەڵ هۆزەکەی (بەنی باهیلە) دەهات بۆ کاتە وەرزییەکان گوێی دەگرت لە هەواڵ و دەنگ وباسی موسڵمانان ، لێرەدا هەڵوەستەیەکی دەکردو گوێی بۆ ڕادەگرتن بە هەموو هەستەکانیەوە ، وای تێدەڕوانییە ئەم ئایەتانەی بەر گوێی دەکەوێت خێرێکی زۆری تیا بێت .. لەبەر ئەوە دەروونی زۆر بە پەرۆش بوو موحەممەد ﷺ ببینێت و دیداری بکات و گوێی لێ ڕابگرێ

کاتێك هەواڵی جەنگی بەدرو ئەنجامەکانی گەیشتە میللەتەکەی ، (ئەبو ئومامە)ی هان دا بۆ ئەوە بێتە مەدینەو موسڵمان بێت ... ئەوە بوو چووە لای پێغەمبەری خواو ﷺ ، موسڵمان بوونی خۆی ئاشکرا کرد ، کاتێکیش جەنگی ئوحد هاتە پێشەوە (ئەبو ئومامە)و ئەوانەی لەگەڵی بوون چەسپان بە خۆڕاگری مانەوە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ قارەمانێکی بێوێنەو سوارچاکێکی ئازاو لە ریزی پێشەوەی جەنگ بوو ، سوارچاکانی دەترساندو ، جەنگاوەرە ئازاکان لە بەرامبەری رایاندەکرد

رۆژی (ئوحد) جەنگێکی تێکۆشەرانەو ئازایانەی کردو ، بەرامبەر پەلامارو شاڵاوی بێباوەران وەستاو بە وەستانێکی پڵنگ ئاسا ، پاشان ئاوڕی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەدایەوەو پێی دەگوت :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ داوای شەهادەتم بۆ بکە لە خوا

پێغەمبەریش ﷺ پێی دەفەرموو :-

- خودایە بیانپارێزەو غەنیمەتیان بۆ وەدەست بهێنە

بەم جۆرە (ئەبو ئومامە) دەمایەوە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ پارێزگاری لێدەکردو هێزی شمشێرو رمو تیرەکانی لەسەر لادەبرد تاکو جەنگ کۆتایی هاتو ، هاوبەش پەیداکەران کاتی گەڕانەوەیان بۆ مەککە ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ (ئەبو ئومامە)و یاوەرەکانی تر کەوتبوونە دوای گاوران تاکو (حمراء الاسد) لە دووری چەند فەرسەخێك لە شاری مەدینە ...

کاتێك رۆژی حودەیبیە هات - خوا لێی رازی بێت - رۆیشت بۆ مەککە بۆ ئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ قورەیش بکات ئەوەبوو سێ رۆژ لە کاتی خۆی دواکەوت موسڵمانان وا گومانیان برد تووشی بە تووشی خراپەیەك بووە لە لایەن قورەیش ، یاوەرەکانی پەیمانیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر مردن لە پێناوی رزگارکردنی (عثمان کوری عفان) موسڵمان خوا لێی رازی بێت - ئەم بەیعەتەش لە ژێر دارێك بوو ، ناویان لێنا بەیعەی شەجەرە ، پێشیان دەگووت (بیعة الرضوان) ، پاشان ئەم ئایەتەی خوای گەورە هاتە خوارەوە :-

﴿ لقد رضي الله عن المؤمنين اذ يبايعونك تحت الشجرة ﴾

(ئەبو ئومامە) گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، من یەکێکم لەمانەی موبایەعەم دای لە ژێر دارەکە ...

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-

{ انت مني ، وانا منك } واتە :- تۆ لەمنیو ، منیش لە تۆم

* * *

پێغەمبەری خوا ﷺ سوور بوو لەسەر گەیاندنی بانگەکەی بە هەموو خەڵك ، ئەوەبوو هەندێك لە یاوەرەکانی ئەوانەی شارەزاییان هەبوو لە ئیسلام هەموو لەشی گرتبوونەوە ناردنی بۆ سەر میللەتەکانیان بانگیان بکەنو فێریان بکەنو لە ئاین شارەزایان بکەن ئەگەر ئیستجابەیان بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ هەبوو

ڕۆژێك داوای (ئەبو ثومامە) کرا بە نیازی ئەوەی بگەڕێتەوە ناو هۆزەکەی خۆیو بانگیان بکات بۆ پەرتووکی خواو وازبهێنن لە بت پەرستیو ، هیدایەت بدرێن بۆ ئایینی پاکی ئیسلام ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێنمایو ئامۆژگاری کردو ، دوعای تەوفیقی بۆ کرد ...

(ئەبو ثومامە) پشتوپەناو یارمەتی لە خواوە بۆ دەرچوو لەگەڵ ئەو ڕووناکییە ئیسلامییەو قورئانەی لەناو دڵی هەڵیگرتبوو ، شانازی دەکرد بەو پلەو جێگایەی لە لای پێغەمبەری خوا ﷺ پەیدای کردووەو بووە بە جێگای بڕواییو خۆشەویستو هەڵبژێردراوی خۆی

لە ڕێگادا ئەو نانەی هەڵیگرتبوو تەواو بوو ، چەند ڕۆژێك بەبێ نان ڕۆژی بردە سەر ، کاتێك گەیشتە ئاوەدانی هۆزەکی برسیەتی تینی گەورەی بۆ هێنا بوو ، چووە لای هەندێك لە برایانی هۆزەکەی (باهیلە) خوێنیان دەخوارد ، بە بەخێرهاتنێکی گەرم پێشوازییان لێکرد بە پەرۆشەوە بە یەکتر گەیشتن ، پاشان داوایان لێکرد لەگەڵیان خواردن بخوات ، (ئەبو ثومامە) پێی گوتن :-

- من هاتووم قەدەغەتان بکەم لەم جۆرە کارانە

ئەم وەڵام دانەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەم هەڵوێستەو ڕادەی شارەزایی لە ئایینیو ڕاستی بڕواو ئیمانەکەی ، برسیەتی نەیتوانی بەسەری زاڵ بێتو مل کەچی بکاتو ، گوێی نەدا بە ئازاری سکی

لە نێو میللەتەکی هەڵسایەوەو بانگیکردن بۆ پەرتووکی خوای گەورەو ئیسلام ، بیروباوەڕو پەروەردەو شەریعەتی بۆ ڕوون کردنەوە ، تاکو هەموویان موسڵمان بوون

* * *

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد (ئەبو ثومامە) لەنێو هۆزی خۆی بوو وکۆچی دوایی پێغەمبەری نەبینی

ئەو کاتەی هەندێك هۆز لە ئیسلام هەڵگەڕانەوە (ئەبو ثومامە)و هۆزەکەی خۆڕاگریان نواند ، نەك تەنها بە ئەوەندە بوەستن ، بەڵکو پاڵیان دا سوپای شەڕکەرو بەرگریان لە ئایینی خواو شەریعەتەکەی ، ئەوەبوو بەشداری زۆربەی جەنگەکانیان کرد لە هەموو جەنگەکانیش بەڕاستی ئیمانەکەیانو هێزی بازوویان خۆڕاگریان نواند

تاکو فیتنە کوژایەوەو ، کارەکە کۆتایی هات بە تێشکانی هەڵگەڕاوەکانو بەسەریان زاڵ بوو ، خەڵکەکەیان گێڕایەوە ژێر سێبەری خۆشیو نیعمەتی ئیسلام ...

کاتێك خەلیفەی موسڵمانان - ئەبوبەکری صدیق - خوا لێی ڕازی بێت - ئالاکانی سوپای ڕێکخست بۆ فەتح کردنی شام ، بەشی (ئەبو ثومامە) لە سوپای (یەزیدی کوڕی سوفیان) بوو لەگەڵ سوپاکە ڕۆیشتن بەرەو ئەردەن تاکو نزیك بوونەوە لە (عەقەبە) هەواڵ هات کەوا ڕۆمەکان هێزەکانیان کۆکردۆتەوە لە دۆڵی (عەقەبە) لە دووری چەند فەرسەخێك لەوان

(یەزید) سەرکردە سەربازیەکانی خۆی کۆکردەوە لەم کارەیان کۆڵیەوە ،پاشان بڕیاریان کردە یەك پاش ڕاوێژکردن کەوا هێزێك لە موجاهیدان ئامادەکراو بن بە

تواناییەکی چاك بۆ ئەوەی ڕووبەڕووبینەوە بەرامبەر ڕۆم و پاشان موجاهیدەکانی تر پێیان بگەن هەروەك بە هانا هاتنەك ، ئەمەش کار بکاتە هێزی دەروونی دوژمنەکانیان و بێهێز بن .

(یەزید) (ئەبو ئومامە)ی هەڵبژارد بۆ ئەم کارە گران و مەزنە گرانی یەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی یەکەم جار - پاش سوپای (ئوسامەی کوڕی زەید) کەوا هەڵسا بە هەندێك پێکدادان لەگەڵ ڕۆم - هێزێکی ئیسلامی دەگات بە هێزی ڕۆمەکان و جەنگیان لەگەڵ دەکات ....

هەروەها ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کەوا هەڵبژاردنی (ئەبو ئومامە) دووربینییەکی زۆری تیایە لەگەڵ مانایەکی قووڵ ، ئەگەر (یەزید) بڕوای بە توانا و بلیمەتی ئەو نەبووایە ئەم کارەگران و ناخۆشەی پێ نەدەسپارد

ئەم پیلانەش دوو شت لەخۆیەوە دەگرێ و سێیەمیان بۆ نییە :- ئەمەش سەرکەوتن یان شکست هێنان

ئەگەر سەرکەوتوو نەبووایە - خوانەخواستە - ئەوا وورەی موسڵمانان بەگشتی و بە هەموو سوپاکەیان کاری لە جەرگەی هێزیان دەکرد کەواتە ، بڕوایی هۆی سەرەکییە لە هەڵبژاردن و (ئەبو ئومامە)ش جێگای خۆی بوو هەڵبژێردرا هەر ئەو کاتەی (ئەبو ئومامە) لە سوپای (یەزید) جیابۆوە بە هێزەکەیەوە فەرمانی پێدرا ئەوە بوو ورەی موجاهیدانی بەرز کردەوە و گیانی ئازایەتی و خۆڕاگری پێدان و ڕاستی ئەم کارەی کە پێی سپێردرا بوو بۆ ڕوون کردنەوە و ، پاشان ئەنجامی سەرکەوتنی جەنگەکەی بە ئەوان بەستایەوە

کاتێك گەیشتن بە سوپای ڕۆم هەڵمەتێکی بەهێزی موجاهیدە چاونەترسەکانی بۆ بردن و دەروونی شڵەژاندن ، لە سەنگەرەکانیان لایبردن و ، شکستی بە ڕۆمەکان خوارد و نزیك بووە لە (غەززە) ....

(ئەبو ئومامە) نەیدەهێشت دوژمنەکانی پشوو بدەن نە لە ڕۆیشتن ونە لە دانیشتن ، کەوتبووە دوایان تاکو دەرفەتی کۆبوونەوە و ڕێکخستن و گەڕانەوەی هێزیان نەبێت ، لێرەدا بەرەنگاریان بۆوە و شکستیەکی بێوێنەی پێ خواردن و ، کۆمەڵەکانی پەرتەوازە کردن و ژمارەیەکی بەدیل گرتن

بەم جۆرە ورەی موجاهیدە قارەمانەکان بەرز بووەوە و ، هەواڵی ئەم سەرکەوتنە مەزنە گەیشت بە (یەزیدی کوڕی ئەبو سوفیان) کەیف خۆش بوو بەمە و ، دڵی پێ گەشایەوە ... هەروەها ئەم هەواڵە گەیشتە هەموو سوپا ئیسلامیەکان بە گشتی و بووە هۆی توانا و پشتیان بەهێز بێت

ئینجا ئەمەش یەکەم بەیەکگەیشتن و یەکەم سەرکەوتن بوو ، مەترسی دەوڵەتی ڕۆمی لە دەروونی موسڵمانان لابرد و ، ورەی شکاندن و ، دەسەڵاتیان لەسەر خاکی شام بەباچوو و سێبەریان کەم بووە ...

پاش ئەم سەرکەوتنە (ئەبو ئومامە) - خوا لێی ڕازی بێت - گواسترایەوە لای سوپای (ئەبو عوبەیدەی جەڕراح) ڕزگارکردنی (قەورەس)ی لەگەڵ بینی

پاشان لە خاکی شام مایەوە و ، هەر جەنگێك بانگی بکردبایە بۆی ئامادە بوو ، خوێنی بۆ دەڕشت ...

(ئەبو ئومامە) - خوا لیّی رازی بێت - تەنها سوارچاکێك نەبوو لە گۆڕەپانی جەنگ ، بەڵکو سوارچاکی گۆڕەپانی زانستیش بوو

ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو مامۆستایەك نەیناردە سەر میللەتێکی بۆ ئەوەی بانگیان بکاو لە ئاینی شارەزایان بکات ....

فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕایەوە ، هەروەك باسی لیّدەکەن ناسرا بوو بە دەم پاکی و ڕاستگۆیی ، ڕاستی گووتوە ئەو کەسەی بەسەریدا هەڵدەداو دەڵێت :-

قسەی دەکرد هەروەك پیاوێك ئەوەی گوێی لیّبوو بە شوێنی خۆی دەگەیاند ...

کۆمەڵێك موسڵمان هاتنە لای ئەویش پیّی گوتن :-

- هاتنتان بۆ لای من ڕەحمەتە بۆ ئێوەو بەڵگەیە لەسەرتان ، لە پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیوە زیاتر بترسێت لە درۆو دەمارگیری لەسەر ئەم ئوممەتە ، ئاگاداربنەوە لە درۆو دەمارگیری ، بزانن ئەمە پێویست کراوە پێتان ڕابگەیەنین ، دووبارە پێمان ڕاگەیاندن ئەوەی بە ئێوەمان ڕاگەیاند ئێوەش بە خەڵکی ڕابگەیەنن

ژمارەی ئەو فەرموودانەی لە پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕاوەتەوە دەگاتە دووسەدو حەفتا فەرموودە

کاتێك نێوان (عەلی کوڕی ئەبو طالب - خوا لیّی رازی بێت -و ، معاویەی‌کوڕی ئەبو سوفیان) ناخۆش بوو (ئەبو ئومامە) وەستا لەتەك (ئیمامی عەلی) بە هەموو هێزو توانایەکی‌یەوە مافی (ئیمامی عەلی) لە خەلافەت بە ڕاست دادەناو بەرگری لیّدەکرد ، هەروەها وازی نەدەهێنا بە بیروڕا دەربڕین ، بەڵکو بەشداری کرد لە تەك (ئیمامی عەلی) لە جەنگی (صیفین) ، دەربارەی ئەم ڕۆژە دەڵێت

{(صیفین)م بینی ، ئەوان واتە لایەنی (ئیمامی عەلی) بریندارییان نەدەکوشت و بەدوای هەڵاتوودا نەدەڕۆیشتن و تالانی کوژراویان نەدەکرد }

کاتێك دەسەڵات درا دەست (معاویە)و موسڵمانان پاش شەهید بوونی (ئیمامی عەلی) - خوا لیّی رازی بێت - موبایەعەیان دا ( معاویە) (ئەبو ئومامە) لە خەڵك جودا بۆوەو خەم و پەژارە دەروونی داگرت و ، پیری هێزی لە لەشی بڕی ماوەیەك لە (میسر) ژیا ، پاشان ئەوێ‌ی بەجێهێشت و ڕووی لە (حیمص)ی سوریا کرد ، لەم شوێنە مایەوە تاکو پاش تەمەنێکی درێژی پڕ خێرو بەرەکەت کەوا تەمەنی دەگەیشتە سەدو شەش ساڵ ،ساڵی‌هەشتاو شەشی کۆچی کۆچی دوایی کرد

ئەگەر (ئوسامەی کوڕی زەید - خوا لیّی رازی بێت - یەکەم کەس بوو بێت ورە بدات بە موسڵمانان بۆ هەڵمەت بردنە سەر ڕۆم ، بەمە خاوەنی گەورەیی یەکەمە بۆ فەتح کردنی شام ، (ئەبو ئومامەی باهیلی) - خوا لیّی رازی بێت - خاوەنی گەورەیی پاش ئوسامەیە لە خۆڕاگری موسڵمانان بە کردار بۆ لەناوبردنی ڕۆم

خوای گەورە لە یاوەری بەڕێزو ، سەرکردەی نەبەردو ، پاڵەوانی کۆڵنەدەرو ، شەرع ناس و فەرموودەناس (ئەبو ئومامەی باهیلی) ڕازی بێت

* * *

٤٨

# حوسەین کوڕی عەلی

بەهاری دڵی پێغەمبەرو ﷺ
کەورەی گەنجەکانی
خەڵکی بەهەشت

## ٤٨

# حوسەین کوڕی عەلــی
# بەهاری دڵی پێغەمبەرو ﷺ
# گەورەی گەنجەکانی خەڵکی بەهەشت

پاش ئەوەی ساڵێکی تەواو تێپەڕی بەسەر لەدایك بوونی حەسەن - خوا لێی ڕازی بێت - ، ماڵی (ئیمام عەلی) ڕووناك کردەوەو ڕووی فاطمـەی گەشاندەوە - خوا لێی ڕازی بێت - حەسەن هەموو خۆشەویستی چاودێری بە چاوی خۆی بینی . بۆ جاری دووەم فاطمـەی زەهرا هەستی بە ژانی منداڵ بوون کرد

لە باخچەیەکی پیرۆز منداڵێکی تر چاوی گەشی بە ژیان هەڵێنا . بە لە دایك بوونی دایكو باوکی زۆر کەیف خۆش بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەر کە گوێی لە هەواڵی لەدایك بوونی ئەم منداڵە خۆشەویستە بوو ڕووی پیرۆزی گەشایەوەو بەخێرایی ڕۆیشت بەرەو ماڵی کچە خۆشەویستەکەی - خوا لێی ڕازی بێت - ئەمکۆرپە پیرۆزەی لەسەر خۆی داناو پاشان پرسیاری کرد :-

چ ناوێکتان لێ ناوە ؟

(ئیمام عەلی) - خوا لێی ڕازی بێت - وەڵامی دایەوە :- ناوم لێناوە (حەرب)

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی -

بەڵکو ناوی (حوسەین)ە کەوا گەورەی گەنجەکانی خەڵکی بەهەشتە

ئەم منداڵە منداڵێکی زۆر جوانو ئاکار دڵگیر بوو، ئەم ناوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی هەڵبژارد ، پێشتر خەڵك ئەم ناوەیان لە منداڵی خۆیان نەنابوو

ئەم (حوسەین)ەی هەموو دەوروبەرەکەی پیرۆزو بەڕێز بوون

باوکی گەورەی بڕواداران (ئیمام عەلیکوڕی ئەبو طالب کوڕی عبدالمطلب کوڕی عبدمناف کوڕی قصی) قورەیشی هاشمی‌یە - خوا لێی ڕازی بێت -

دایکی زەهرا کچی پێغەمبەری خوا ﷺ گەورەی ئافرەتانی جیهان - خوا لێی ڕازی بێت - باپیرەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشەویستی خواو ڕەحمەت بۆ ئادەمیزاد و گەورەی هەموو پێغەمبەران جگە لەمانەش (حوسەین) خۆشەویستو بەهاری دونیاو قیامەتی دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ هەروەها کونیەشی باوکی (عبداللە) بوو

(ئیمامیحوسەین) - خوا لێی ڕازی بێت - لە ڕێکەوتی پێنجی مانگی شەعبانی ساڵی چوارەمی کۆچی لەدایك بووە هەر لە منداڵی‌یەوە فرچك کراوە بە خۆشەویستی پێغمبەرو ﷺ چاودێری دایکیو سۆزی باوکی هەر کە تەمەنی گەیشتە حەوت ڕۆژ پێغەمبەری خوا ﷺ دوو کاوڕی بۆ کوشتەوە (وەکو وەلیمە) پرچی تاشی . بە کێشی پرچەکەی زیویان بۆ کڕیو بەخشی‌یان بەسەر هەژاران (حوسەین) - خوا لێی ڕازی بێت - زۆر بە پێغەمبەری خوا ﷺ باپیرەی دەچوو . ئەمپێچوونەش هەیبەتو

جوانی‌یەکی یەکجار مەزنی پێبەخشیبوو ، جگە لەمەش ڕازابۆوە بە سیفەتی جوان‌و خووڕەوشتە بەرزەکان ....

پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو کوڕەکچی بەڕێزی لەباوەش دەگرت‌و بە خۆشەویستی‌یەکی بێ ئەندازە لە خۆی نزیك دەکردنەوەو ، سۆزو بەزەیی بۆیان دەجولاو یاری لەگەڵ دەکردن ، هەر کاتێك چاوی پێیان دەکەوت ڕووی پیرۆزی گەش دەبۆوە ، قسەی خۆشی زۆر بۆ دەکردن ....

(ئەبو ئەییوبی ئەنصاری) دەگێڕێتەوەو دەڵێت :

{چوومە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن‌وحوسەین لەسەرسینگی گەمەو یاری‌یان دەکرد }...

گوتم :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشت دەوێن ؟

فەرمووی :- چۆن خۆشم نەوێن ئەوانە بەهاری دڵمن لە دونیا

بەڕاستی ئەمە جوانترین‌و گەورەترین دەربڕینی پێغەمبەری ئازیزە ﷺ بۆ خۆشەویستی هەردوو حەسەنەکانە لە خۆشەویستی و ڕێز لێنانە .... هەر کاتێك سۆزی بۆ هەڵستابا دەیفەرموو هەردوو کوڕم بۆ بانگ بکەن

جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو بینی حەسەن‌و حوسەین زۆرانبازی دەکەن ، پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی دەبردو دەیفەرموو :

- دەی حەسەن ...

(ئیمام عەلی) - خوا لێی ڕازی بێت - گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا بەسەر (حوسەین)ی هان دەدەی ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی بردو پاشان فەرمووی :-

ئەمە جوبرەئیلە دەڵێت :

- دەی (حوسەین) .

جارێکی تر پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لە گریانی (حوسەین) دەبێت بە خێرایی چووە ماڵی کچەکەی (فاطمە) - خوا لێی ڕازی بێت - پێی فەرموو :-

((حوسەین ژێر بکەرەوە ... ئایا نازانی گریانی ئازارم دەدا ؟ ))

ئەمانە چەند نموونەیەك بوون بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی پێغەمبەر بۆ (ئیمام حوسەین) ، ئەمەش جێگای سەرسوڕمان نی‌یە لەبەرئەوەی ئەم دوو گوڵە کوڕی خۆشەویسترین کەسی بووە ئەمانەش : بەڕێز (فاطمە)ی کچی بەهاری دڵی‌و، (ئیمام عەلی) - خوا لێی ڕازی بێت -

پێغەمبەری خوا ﷺ چەندجار مزگێنی بەهەشتی داوە بە حەسەن‌و حوسەین هەروەك دەفەرموێت :-

{ الحسن والحسين سيدا شباب أهل الجنة }

واتە :- حەسەن‌و حوسەین گەورەی گەنجەکانی خەڵکی بەهەشتن

بەم جۆرە حەسەن‌و حوسەین پەروەردە بوون لەنێو دایك‌و باوکێکی مەزن بە چاودێری‌یەکی تەواو ، بە ئاگابوون لەسەر پەروەردەیەکی ڕێك‌وپێك ....

ئەم دوو خونچەیە – خوا لێیان ڕازی بێت – گەورە بوون لە نێو کۆمەڵگای مەدینەو ڕێنمایی پێغەمبەرو ﷺ ، فێرکردنی دایکی – خوا لێی ڕازی بێت – لەگەڵ پەروەردەی باوکی کەوا دەستی دەگرتن لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا ﷺ دەیسووڕاندنەوە گوێیان دەگرت لە فەرموودەو ئامۆژگاریی و پەندەکانی ، هەستونەستیان لەسەر ڕەوشتە بەرزەکانی و ڕێنمایی یە مەزنەکانی و هیدایەتە ڕوناکەکانی بۆوە ، ئەم دەوروبەرە جوان و مەزنە کاری لێکردن و ، پەروەردە بوون لەسەر خواپەرستی و جیهادکردن لە ڕێگای خوا

ئەوەی جێگای سەرسوڕمان نی یە (ئیمام حوسەین) هەر لە منداڵی یەوە قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد بەماناو تێگەیشتنەوە ، پەروەردە بوو بە بەندەیەکی خواپەرست و لەخواترس و بەرێزو ئازاو قسەزان و پێشەوایەکی مەزن و فەرموودەیەکی زۆری لە باپیرەو دایك و باوك و براکەی حەسەن و کۆمەڵێك لە یاوەران گێڕاوەتەوە ، لەبەر ئەوە (ئیمام حوسەین) بە زانایەکی شەرع ناس و لەخواترس دادەنرێت

(ئیمام حوسەین) بەناوبانگ بوو بە دانایی لەچارەسەرکردنی ئەو گیروگرفتانەی دەهاتە پێشیان و بەناوبانگ بوو بە منداڵێکی بەخووڕەوشت لە هەڵس وکەوت لەگەڵ یەکێك کە لەخۆی گەورەتر بوایە ....

حەسەن و حوسەین ڕۆژێکیان ئەعرابی یەکی بەتەمەن دەبینن دەست نوێژ بەکەموکورتی دەشوات دەیانویست کەموکورتی یەکانی بۆ ڕاست بکەنەوە بەبێ ئەوەی هەستی بریندار بکەن یاخود ئازاری بدەن بە وشەیەك ئاڕاستەی بکەن بەبێ نیاز

حوسەین بە زیرەکی خۆی ڕێگەیەکی دۆزی یەوە لەگەڵ حەسەن چوون بۆ لای ئەعرابی یەکە بە ئەدەبێکی بەرز بە ئەعرابی یەکەیان گوت :-

ئەی مامە ، تۆ لە ئێمە بەتەمەن تری ، ئەوە برامە دەڵێت :- دەست نوێژی تۆ لە دەست نوێژی من چاکترە .... منیش دەڵێم :- دەست نوێژی من لە دەست نوێژی تۆ باشترە ، تۆ دەکەین بە حەکەم لەم کارەمان ئێستا دەست نوێژ دەشۆین تۆ حوکم لە نێوانمان بدە ، پیرەکە ڕازی بوو .

حەسەن بە پێش کەوت بە چاکترین دەست نوێژ ، دەست نوێژی شوشت ، پاشان حوسەین هاتە پێشەوە ، ئەویش بە باشترین دەست نوێژ دەست نوێژی شوشت ، پاش ئەوەی تەواو بوون ئاوڕیان لە ئەعرابی یەکە داوەو پێیان گوت :-

کامەمان دەست نوێژمان باشتر شوشت ؟

بەڵام ئەعرابی یە زیرەکەکە لە ئەدەبە جوانەکەیان گەیشت و ، پێی گوتن :-

{سوپاس بۆ ئێوە باشترین دەست نوێژتان فێرکردم ، ڕاستی گووتوە ئەوەی ناوی لێناون – ال البیت – واتە بنەماڵەی پێغەمبەری خوا ﷺ }

(ئیمام حوسەین) – خوا لێی ڕازی بێت – ڕوویەکی بە هەیبەت و پرشنگداری هەبوو ، زۆر مل کەچ بوو ، ڕێزی لە میوان دەگرت و، دەیبەخشی بە پێویست و ، بەهانای لێقەوماو دەهات ، ڕۆژێك کەنیزەیەك هاتە لای و چەپکێك لە ڕەیحانەی بە دیاری بۆ هێنا ئەویش ئازادی کردو ، پێی گوت : ( تۆ ئازادی لە ڕای خوا )

پێیان گوت : چەپکێك لە ڕەیحانی پێشکەش کردی ئازادت کرد ؟

(ئیمام حوسەین) گوتی : بەم جۆرە پەروەردگارمان پـەروەردەی کردووین هـەروەك دەفەرموێت :

﴿ واذا حییتـم بتحیـة فحیـوا بأحسـن منها أو ردوهـا ﴾ سورة النساء

ئـەم زاتـە پـیرۆزە لـەخوا نزیـك دەبـووە بـە خواپەرسـتیو کـردەوەی چـاك هەروەك دەگێڕنەوە (ئیمام حوسەین) سوور بوو لەسەر چوونی بۆ حەجی مـاڵی خـوا ئەگەر بە پیادەش بوایە

(ئیمام حوسەین) ڕەوانبێژێکی کەم وێنە بوو ، ئاسانترین دەربڕینو جوانترین ووشە لـەناو ڕستەکانی بـەدی دەکـرا ، لەگـەڵ بـیرورای ئاشکراو ڕاسـتو دروسـت هیـچ گرانییەك لە مانای ووشەکانی نەبوو لەبەر ئەوە پێویستی بە ڕوونکردنەو نەبوو، لەبەر ئەوە چەند دێڕێك لە هۆنراوەکانی دەکەین بە نموونە بۆ ئەم ڕاستییە :-

لئن کانـت الدنیـا تعـد نفیسـة فـدار ثواب الله اعلـــى واجـمل
وان کانـت الابدان للمـوت انشئـت فقتل امرىء بالسـیف في الله افضـل
وان کانـت الامـوال للتـرك جمعها فـما بـال متروك به الـمرء یبخـل

هەروەها نموونـەش لەسـەر سەخێتیو دڵفراوانـی ئـەم پیـاوە ، ڕۆژێـك بـەلای چـەند هـەژارێك دا دەڕوا نانیـان دەخـوارد ئـەوانیش هـەروەك نـەریتی عـەرەب بانگیـان کـرد ، ئـەویش ڕۆیشـت لـەلایان دانیشـتو لەگـەڵیان دەسـتی کـرد بـە نـان خـواردن ، پاشـان پێی گوتن :-

{ قد اجبتکم فأجیبوني } واتە :- دەعوەتتان کردم هاتن بۆ دەعوەتتان ئێوەش وەرن بۆ دەعوەتم ..... بەم جۆرە بانگیکردن بۆ نان خواردن لە ماڵەوە

ئەم جۆرە زیرەکیو شـەرع ناسـیو زمان ڕەوانـیو ئـەم سیفەتە بەرزانـەی هـەموو لـە باوکی بەڕێزی فێر بووبوو ...

هەروەها بە نسبەت ئەم ڕێزەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم بنەماڵەی ناوە ئەوەیە هەروەك دەگێڕنەوە کاتێك ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە :-

﴿ انما یرید الله لیذهب عنکم الرجس أهل البیت ویطهرکم تطهیرا ﴾ سورة الاحزاب

پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای (أم سلمه) بـوو ... پاشـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـانگی (ئیمـام عەلـیو فاطـمەو حەسـەنو حوسـەین)ی کـرد - خـوا لـێیان ڕازی بێـت - قوماشێکی هێناو بەسەری دادانو پاشان فەرمووی :-

{ پەروەردگارا ئەوانە بنەماڵەی منـو نزیکی منـن ، پەروەردگارا خراپەو پیسـییان لەناو لاببەو بە باشترین شێوە پاکیان بکەرەوە }

ساڵ لە دوای ساڵ دەڕۆیشت چەندەها کارەساتو هەواڵی جەرگ بڕی لەگەڵ خۆی هـەڵگرتبوو ، پاش ئـەوەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەحەجی ماڵئاوایی گەڕایـەوە بەسـەر مینبەر کەوتو سوپاسو ستایشی خوای گەورەی کرد و پاشان فەرمووی :

{ ئەی خەڵکینە . خوا بەندەیەك لە بەندەكانی سەرپشك كرد لە نێوان دونیاو قیامەت ، ئەویش گەیشتنی بەخوای هەڵبژارد }

بەم جۆرە موسڵمانان تێگەیشتن لە پێشەوەی هەموویان ئەبوبەكری صدیق كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەجەلی نزیك بۆتەوە لەبەرئەوە ترسان ، ئەبوبەكر گوتی :- خۆمت بەقوربان دەكەم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ

پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو نەرمی ئەی ئەبوبەكر .

بەم جۆرە كاتی گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هات و گەیشت بە پەروەردگاری مەزن

ئیتر هەواڵی كۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ كارەساتێكی گەورە بوو موسڵمانانی هەر هەموو لەهۆش خۆ برد بەڵام پاشان ئەبوبەكر خەڵكەكەی سارد كردەوەو دڵی دانەوە

حوسەین تووشی خەمێكی گەورە بوو ، زۆر خەمی خواردو چاوەكانی پڕ بووبوو لە فرمێسك بۆ باپیرەی ﷺ ، بەم جۆرە لەخەم ڕاهات - خوا لێی ڕازی بێت - هەر لە منداڵی یەوە تەمەنی پیرۆزی لە حەوتساڵان تێپەڕی نەكردبوو

كارەسات لە دوای كارەسات ڕووی تێكرد هێشتا شەش مانگ بەسەر كۆچی دوایی باپیرەی ﷺ تێپەڕی نەكردبوو جارێكی تر دڵی پڕ لە خەم بووەوە بە خەمێكی گەورەتر ، ئەمجارەیان دایكی خۆشەویستی فاطمە - خوا لێی ڕازی بێت -گەشتی پڕ لە خێری كرد بۆ لای پەروەردگاری و گەیشت بە باوكی ﷺ

بەم جۆرە ئیمام حەسەن و ئیمام حوسەین هەر لە منداڵی یەوە دەگەیشتن بە كارەسات دوای كارەسات . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی دڵیان پتەو بێت و وورەیان بەرز بێت بۆ بەرگەگرتنی گیروگرفت و كارەساتی لەمەش گەورەتر - انشاء الله - لە دوایی دێینە سەری

كەسایەتی (ئیمام حوسەین) زۆر لایەنی هەیە یەكێك لەمانە جیهادی بەردەوام لە پێناوی خوای گەورەو ڕێگای هەق ئەم سیفەتەش نوێ نەبوو لەسەری كەوا لەسەری پەروەردە بووبوو ، لەگەل ئەم بارودۆخەی لەناوی گەورە بووبوو

باپیرەی ﷺ گەورەترین قارەمانی مەیدان بوو ، كاتێك شەڕ گەرم دەبوو قارەمانان پەنایان بۆ دەبرد ، كاتێك كەسیش لە دەوری نەدەما بە تەنها دەمایەوەو دەچەسپا و دەیگوت :-

{ أنـا النبيّ لا كـــذب } .....

هەرچی باوكی بوو (ئیمام عەلی) - خوا لێی ڕازی بێت - گەورەی گەنجان و . خاوەنی غیرەت و وورەی پۆڵایین . نەدەترسا هەرچەندە جەنگ توندو گەرم بوایەو دوژمن بەهێز بوایە كەواتە (ئیمامی حوسەین)ی یەكێك بوو لە لقی ئەم دارە پیرۆزەو ڕەگە بەهێزو پتەوە

هەموو جارێك دایكی خۆشەویستی هەر لە منداڵی یەوە باسی جەنگەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ كە باوكی بوو بۆ دەگێڕایەوە لەگەڵ ئەم قۆناغانەی بانگهێشتنی ئیسلامی

پێیدا ڕۆیشتووه هەروەها باسی ئازایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و(ئیمامی عەلی) بۆ دەرکرد لەگەڵ ئەم هەموو ناخۆشی‌یانەی بینیویانە لە پێناوی خوای گەورە

(ئیمامی حوسەین) هەر لە منداڵی‌یەوە تەمانای بەشداری جەنگی هەڵگەڕاوەکانی دەکرد ، بەڵام هێشتا منداڵ بوو ، هەروەها هەر لەم تەمەنەوە بەهۆی بیرتیژی و دوور ڕوانین و هوشیاری پەندو ئامۆژگاری گرنگی لەم ڕووداوانە وەردەگرت ئینجا پاش ئەم هەمو کارەساتانە چۆن حوسەین پەروەردە نابێت بە پەروەردەیەك گەورەترین ئەرك لەسەر شانی خۆی دابنێت

کاتێك تەمەنی پیرۆزی گەیشتە تەمەنی گەنجی و پیاوەتی ، دەگەڕا لە مەیدانی شەڕو جەنگ ، گەنجێك بوو نەیدەزانی ڕابواردن و ئارەزوو مانای چی‌یەو ، پەنای نەدەبردە بەر ژیانی هێمنی و نەرمی و پێی دڵخۆش نەدەبوو ، حەزی بە ژیانی دونیای بێ‌نرخ و ئارەزووە کاتی‌یەکانی نەدەکرد

ئەم زاتە گەورە بوو لەسەر لەبەرکردنی قورئان و شارەزایی لە ئایین و ، چوونە خوارەوە لە زانستە ئایینی‌یەکان و، لەم بڕوایە دابوو کەوا جیهادکردن لە پێناوی خوا گەورەترین و مەزنترین هیوایەتەو لە هەموو واجبەکان واجب ترە !!

(ئیمامی حوسەین) حەزی دەکرد لە شریقەشریقی چەك لە پێناوی هەق و ، ئامادەبوو بۆ هەر داواکردنێك بۆ جیهادی ڕێگای خوا

کاتێك جڵەوی خەلافەت درا دەست (ئیمامی عومەر) – خوا لێی ڕازی بێت – زۆر ڕێزی لە باوکی حەسەن و حوسەین دەنا لەبەر نزیکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەروەك (جەعفەر کوڕی محەممەد) لە باوکی دەگێڕێتەوە :- ( ئیمامی عومەر) گەورەی بڕوادارن – خوا لێی ڕازی بێت – چەندی بە (ئیمامی عەلی) ببەخشی‌بایە ئەوەندەشی بە (ئیمامی حوسەین) دەبەخشی ، کە پێنج هەزار بوو

زوهری دەگێڕێتەوە :- (ئیمامی عومەر) جل‌وبەرگی‌دا بە منداڵە یاوەرەکان ، لەمانە جل‌وبەرەگەکان بۆ حەسەن و حوسەین نەدەبوو ، ئەوەبوو ناردی‌یە یەمەن جل‌وبەرگی بۆ هێنان پاشان گوتی :- ئێستا دڵم داکەوت

کاتێك خەلیفەی سێ‌یەم (ئیمامی عثمان) هات – خوا لێی ڕازی بێت – فەتحی ئیسلامی گەورە بوو ، خەلیفە موسڵمانانی داوا کرد بۆ فەتحی (صربستان) حەسەن وحوسەین لەم بانگە دوانەکەوتن ، بەڵکو لە موجاهیدە پێشەنگەکان بوون بەشداریان لەم جیهادە کرد لێرەدا ئازایەتی و قارەمانیەتی (ئیمامی حوسەین) بەدیار کەوت کەوا موسڵمانان سەرکەوتنیان تیادا بەدی هێنا ، جارێکی تر لە فەتحی (قسطنطنية) (ئیمام حوسەین) لەگەڵ حەسەن و عبداللە کوڕی زوبەیرو عبداللە کوڕی عەباس و گەورە یاوەرەکانی وەك ئەبو ئەیوبی ئەنصاری و ئەوانی تر بەشدارییان کرد – خوا لێیان ڕازی بێت –

هەروەها لە جەنگی ئیفریقاش بەشداری کرد ، بەم جۆرە (ئیمامی حوسەین) نەیدەزانی پشوودان مانای چی‌یەو چۆکی نەدەدا و تامی لێ وەرنەگرت

هەر لە منداڵی‌یەوە فێری سوارچاکی و سواربوونی ولاغ و ڕۆیشتنی خێراو جوڵانەوەی بەردەوام و چالاکی بوو ، نەرم بوو بەڵام نەك لەکاتی بێ‌هێزی ، بەهێزیش بوو نەوەکو لەکاتی توندی

پاش ئەوەی فیتنەو ئاژاوە لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم (ئیمامی عثمان) – خوا لێی ڕازی بێت – دەستی پێکرد ئەوەبوو ئاژاوەچی‌یە جوولەکە قین لە دڵەکان کەوا خۆیان لەژێر پەردەی ئیسلام شاردبۆوە دەورەی ماڵی (ئیمامی عثمان)یان گرت نەیانهێشت بچێتە دەرەوە ، (ئیمامی عەلی) – خوا لێی ڕازی بێت – یەکسەر حەسەن‌و حوسەینی ڕەوانە کرد لەگەڵ کۆمەڵێك گەنجی موسڵمان بۆ بەرگری کردن لە ئیمام

ئینجا بە ڕاستی حەسەن‌و حوسەین بەشداری‌یان کرد لە بەرگری‌کردن لە خەلیفە، بەڵام ئاژاوەچی‌یەکان توانیان خوێنی پاکی (ئیمامی عثمان) بڕێژن بە ناهەق

پاش شەهیدکردنی (ئیمامی عثمان) ، جڵەوی خەلیفایەتی درا دەست (ئیمامی عەلی) خوا لێی ڕازی بێت – ئەوەبوو زۆربەی یاوەرە بەڕێزەکان لە هەموو ناوچەکان موبایەعەیان کرد

پاش ئەوەی (ئیمام عەلی) جڵەوی خەلیفەی موسڵمانانی پێسپێردرا ، ئیمام دەیویست فەرمان بکات بە گوێرەی ئەو ڕێبازەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەبوبەکرو عومەر – خوا لێیان ڕازی بێت – گرتبوویانە بەر ، ئەوەبوو کۆسپەوناخۆشی زۆر هاتە پێش بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم کارە

ئاژاوە گەورە بوو تاکو گەیشتە خۆبەستانی چەکداری ، جەنگێکی دژوار لە نێوان (ئیمامی عەلی)و – خوا لێی ڕازی بێت – نێوان معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ڕوویدا

(ئیمامی حوسەین) بەشداری جیهادی کرد دژی چینی یاخی‌بوو ، شەڕێکی یەکجار مەزنی کرد لە جەنگی جەمەل و جەنگی صیفین هەروەها لەناوچەی نەهرەوان بەشداری جەنگی هەڵگەڕاوە دەرچووەکانیشی کرد

پاش پێنج ساڵ جیهانی ئیسلامی تووشی گەورەترین کارەساتی دڵتەزێن بوو بە ڕووداوی شەهید کردنی (ئیمامی عەلی) – خوا لێی ڕازی بێت – ئەمەش بە هۆی هەڵگەڕاوەی تاوانبار (عبدالرحمن کوڕی مولجەم) لە ڕێکەوتی حەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی چلی کۆچی

دووبارە (ئیمامی حوسەین) – خوا لێی ڕازی بێت – تووشی ئەم کارەساتە خەمگینە بوو سەر لە نوێ دڵی بریندار بووەوە لە پاش شەهید بوونی (ئیمامی عەلی) خەڵك موبایەعەیان دا بە (ئیمامی حەسەن) – خوا لێی ڕازی بێت – (ئیمامی حوسەین) یەکێك بوو لەمانەی موبایەعەی کرد پشتی گرت هەنگاو بە هەنگاو ....

کاتێك (ئیمامی حەسەن) – خوا لێی ڕازی بێت – بۆ کوژاندنەوەی ئاژاوە هاتە خوارەوە بۆ خیلافەتی (معاویە ) (ئیمامی حوسەین) لەگەڵ ئەم بیروڕایە نەبوو ، بەڵام ئیمامی حەسەن) خۆی لێ تووڕە کرد گوتی :- { من لە تۆ باشتر دەزانم دەربارەی ئەم کارە }

(ئیمامی حوسەین) بێ دەنگ بوو ڕازی بوو بە نادڵی

ڕۆژێك ئیمامی حەسەن‌و حوسەین گفتوگۆیان دەکرد ، ئیمام حەسەن بە ئیمامی حوسەینی گوت :-

{خۆزگە هەندێك لەم توندیەی دڵی تۆم هەبوایە } (ئیمامی حوسەین)یش بە ئیمام حەسەنی گوت :- { خۆزگە هەندێك لەم نەرم‌و نیانیەی تۆم هەبوایە }.

# شۆڕشی ئیمامی حوسەین بەرامبەر ستەمی سەپێندراو

(ئیمام حوسەین) - خوا لێی ڕازی بێت - تەماشای جیهانی ئیسلامی کرد ، بینی خەلافەتی ئیسلام لە بەیعەو ڕاوێژەوە دەگۆڕێ بۆ نەریتی پاشایەتی پشتاوپشت و دەیانەوێ ئەم نەریتە بەزۆر بخەنە سەر ئوممەتی ئیسلام

مێژوو وا بۆمان دەگێڕێتەوە (معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان) دەیویست لە دوای خۆی بەیعەت بدا لە کوڕەکەی (یەزید) ، خەڵکی شام ئەم داوایەیان وەرگرت بەڵام زۆربەی یاوەرەکان وەکو (عبداللەی کوڕی زوبەیر و عبداللەی کوڕی عومەر و عبداللەی کوڕی عەباس )- خوا لێیان ڕازی بێت - ڕازی نەبوون

ئاڵای ئەم شۆڕشە مەزنە (ئیمامی حوسەین) - خوا لێی ڕازی بێت - هەڵیگرت - ئەم حوسەینەی نەیدەزانیترس چییە چ ترسیسەرۆك و چ ترسی ستەمکار نە زێرو نە زیو هەڵینەدەخەڵەتاند ئەم حوسەینەی لە دوای ڕاستی دەگەڕا بۆ ئەوەی خوی پێوە بگرێ و لەگەڵی ڕاوەستێ و شۆڕشی بۆ بکات ئەوە بوو (یەزیدی) سەرخۆش دانیشت لەسەر دەسەلاتو ، جیهانی ئیسلامی هەموو شێواند ، ئینجا پێویستەو واجبە دەبێ ئەم بێشەرعییە لەسەر ملی موسڵمانان لابدرێ کەواتە دەبێت کێ ئەم ئاڵایە هەڵبگرێ ؟

(ئیمامی حوسەین) - خوا لێی ڕازی بێت - تەماشای کرد خۆیشیاوی ئەم کارەیە

باشە چۆن دەبێ حوسەینی کوڕی عەلی بێدەنگ بێت لەسەر دەسەلاتێك دروستکراو بێ لەسەر بنچینەی سوودی کەسایەتی و قازانجی خۆیی ، بێدەنگ بێت لەسەر ئەم ستەمە کۆمەلایەتییە تێیدا دەوڵەمەند دەوڵەمەندتر ببێ و هەژاریش هەژار تر ....

لە کاتێکدا (ئیمامی حوسەین) بیری دەکردەوە لەم کارەو چۆنی ڕاپەڕێنێ ، نامەیەکی بۆ هات لە خەڵکی ( کوفە )ی عێراق داوای بەیعەتیان لێکرد (ئیمامی حوسەین) بۆ ئەوەی دڵنیا بێت لەم کارە (موسلیم کوڕی عەقیل)ی ڕەوانە کرد بۆیان بۆ ئەوەی نیازی دڵی خەڵکەکە بزانێو هەواڵی بۆ ڕەوانە بکاتەوە بەوەی بینیویەتی (موسلیم کوڕی عەقیل) وەڵامێکی دڵنیاکەرەوەی بۆ ناردەوە

ئەوەبوو (ئیمامی حوسەین) بەخۆیوماڵەوەیو خزمەکانیو هەندێك لە یاوەرەکان بەڕێکەوتن ، لەبەرئەوەی (ئیمامی حوسەین) نەیدەویست دەسەلات بکەوێتە بەر دەستی خۆی بەڵکو دەیویست کاروباری موسڵمانان چاك بکات ، ئەوەبوو ئاڵای هەقی هەڵگرت ... بەڵام فێڵو تەڵەکە لە هەموو شوێنەکان جێگای خۆی گرتبوو دەورەی لە (ئیمامی حوسەین) و کۆمەڵەکەی دابوو ....

بۆ یەکەم جار (عبیداللەی کوڕی زیاد) (موسلیمی کوڕی عەقیل) دەکوژێت پاشان نێردراوی دووەمی (ئیمامی حوسەین) کە ناردبووی بۆ کوفە ئەویش شەهید دەکەن

(ئیمامی حوسەین) بینی سوپایەکی یەکجار زۆر دەورەی دەدەن لە ڕێگای بۆ کوفە

(ئیمامی حوسەین) بە کوشتنی (موسلیمی کوڕی عەقیل)ی زانیو ، بۆی ڕوون بۆوە شتێکیان بۆ دروست کردووە بە شەو

لێرەدا حوسەینی بەڕێز کوڕی بەڕێز و قارەمانی کوڕی قارەمان چی بکات ؟
هیچی لەپێش نەما بێجگە لە خۆڕاگری لەسەر ئەم ڕێبازەو ، خۆ قوربانیکردن لە ڕێگای هەق ، ئەمەش باشترین چارەسەرەو لەم ڕێگایە چاکتر نییە
(حوڕ کوڕی یەزید) یەکێك بوو لە پیاوەکانی (عبیداللەی کوڕی زیاد) گوتی :-
( ئەی حوسەین کوشتن چاوەڕێت دەکات)
حوسەین پێی گوت :-
ئایا بە کوشتن دەمترسێنی ؟ پاشان ئەم دێرە هۆنراوانەی گوت :-

| | |
|---|---|
| سأمضی و ما الموت عار علی الفتی | اذا ما نوی خیرا و جاهد مسلما |
| و آسی الرجال الصالحین بنفســـه | و خالف مثبورا و فارق مجرما |
| فان عشت لم أندم و ان مت لم ألم | کفی بك ذلا أن تعیش و ترغما |

بەم جۆرە (حوڕ کوڕی یەزید) دڵنیا بوو کەوا حوسەین لە قسەی خۆی نایەتە خوارەوەو دەیەوێت بەرگری لە مەسەلەکەی بکاتو بڕوای پێ هەیەو ژیانی خۆی بۆ داناوە
دوژمنانی خوا و پێغەمبەرەو ئیسلام دەورەیان لە (ئیمامی حوسەین) و یاوەرەکانو بنەماڵەکەی دا لە کەربەلا ....کاتێك (ئیمامی حوسەین) بینی ولاخەکانی کوڕی زیاد بازنەیەکیان لە دەورەی دروست کردووە ، سوپای دوژمن لە هەموو لایەك دەورەیان داوە ، ئیمام چووە بەرامبەر سەرۆکی سوپاکەو پێی گوت :-
یان وازم لێبهێنن سەر هەڵبگرم بۆ شوێنێك لە شوێنەکان جیهاد بکەم لە پێناوی خواو ، یان بگەڕێمەوە بۆ مەدینە ...بەلام کۆمەڵەکە رازی نەبوون بەڵکو دەیانەوێت جەنگی لەگەڵ بکەنو دەیانەوێ (ئیمامی حوسەین) بکوژن بەهەر جۆرێك بێت
لەم ساتانەدا (ئیمامی حوسەین) ئەم دێرەی هۆنراوانەی خوێندەوە :-

| | |
|---|---|
| یا دهر اف لك من خـــلیـل | کم لك بالاشراق والاصیل |
| من صاحـب و ماجد قتیل | والدهــر لا یقنـع بالبدیل |
| و الامر في ذاك الـی الجـلیل | و کلٌ حـیَ سالك سبیـــلی |

بەم جۆرە دوژمنە ستەمکارەکان شەڕیان بەسەر (ئیمامی حوسەین) سەپاندو ئاویان لێ قەدەغە کردن دەیانویست لە تینوییتییان بیکوژن دەستیان کرد بە تیر هاوێشتن بۆیان ، یەکێك لە منداڵە خۆشەویستەکانی ئیمامیان لەژێر دەستی کوشت
چاوەکانی (ئیمامی حوسەین) پڕ بوو لە فرمێسك !!
ئەوەبوو دوژمنان دەستیان کرد بە پەلاماردانو شەڕکردن
(ئیمامی حوسەین) تەماشای ئافرەتو منداڵەکانی دەکرد ، بەلام چارەی چییە ؟ تازە ترس نازانێ مانای چییە ؟

غیرەت وەکو خوێن لە دەمارەکانی دەسوڕێتەوە پەلاماری بۆ دوژمن برد گەورەترین ئازایەتی نواند لەسەر ڕووی زەوی دەیبینی یاورەکان و خزمەکانی یەك یەك دەکەونە سەر زەوی ، هەر هەموویان وەکو شێر گەڕانەوەیان نی یە

موجاهیدەکان هەر هەموویان لەگەل حوسەین شەهید کران ، هەڤدە کەس لە بنەماڵەی (ئیمامی حوسەین) شەهید کران (ئیمامی حوسەین) بە تەنها مابۆوە شەری بەتەنها دەکرد – دوژمنەکانی لەسەری کۆمەڵەیان کردو بە تیرو ڕم لە هەموو لایەك لێیان دا تاکو شەهید بوو کەوتە سەر زەوی ، پاش ئەوەی سی وسێ برینی تێکەوت نیتر خاکی کەربەلا سوور هەڵگەڕا بەخوێنی پاکی ئاڵی(ئیمامی حوسەین) – خوا لێی ڕازی بێت –

یاوەری بەڕێز (عبداللەی کوڕی عومەر) – خوا لێی ڕازی بێت – دەڵێت :-

{ قەت ئەم بینیووە لێقەوماوێك منداڵ و بنەماڵەو یاوەرەکانی بکوژرێت وەکو حوسەین وورە بەرزو ئازا بێت ، سوێند بەخوا نە ئێستاو نە دوایی پیاوی وام نەبینیووە }

(عەقیلەی کوڕی هاشم) ئەم دیمەنە دڵتەزێنەی خوشکی ئیمامی حوسەین (زەینەب) دەبینێت ، هاواری دەکرد پڕ بە دەنگی :-

{ وامحمداه وامحمداه ... صلى عليك الله هذا هو الحسين بالعراء مرمل بالدماء ، ممزق الاعضاء و بناتك سبايا و ذريتك مقتلة }

واتە – { هاوار موحەممەد هاوار موحەممەد – درودی خوای لەسەر بێت – ئەوە حوسەینە لە بیابان لە خوێن سوور بووەو لەشی پارچە پارچە کراوەو کچەکانت بەدیل گیراون و بنەماڵەت هەموو کوژراون }

ئیتر دەنگی گریانی زەینەب ئەم ناوچەیەی داگرتبوو دەشت و بیابانی هێنابووە گریان (ئیمامی حوسەین) لە ڕێکەوتی ( دەی موحەڕەمی ساڵی شەست و یەکی کۆچی) ، لە تەمەنی پەنجاو چوار ساڵی شەهید کرا ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ و هەموو موسڵمانان

شەهیدکردنی (ئیمامی حوسەین) تاکو ئێستا کاردانەوەیکی مەزنی هەیە لە دڵی موسڵمانان بەڵام بەداخەوە زۆر لەڕێ بزربووەکان شتی ئەفسانەو گوناهیان لەگەل تێکەڵ کردووەو ڕاستی یەکانی ئەم یاوەرە خۆشەویستەیان لە یادی خەڵك بردۆتەوە

بەڵام ئەوەی جێگای دڵخۆشی یە دوژمنانی (ئیمامی حوسەین) بوون بە خۆڵ و بۆگەن بوون ، بەڵام یادی حوسەین و خۆشەویستی حوسەین لە دڵی هەموو موسڵمانانی جیهان هەر ماوەتەوە تاکو ڕۆژی قیامەت لەبیری ناکەین ، لە دوایی دا لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە بمان گەیەنێت بەم پیاوچاکەو شەهیدە بەرزە

* * *

٤٩

# ئەسماءی
# کچی ئەبوبەکر
## خاوەن دوو پشتێن

ئەو ئافرەتەی پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتە سەد ساڵ نە ددانو کاکیلەیەکی کەوتو نەبیروهۆشی لەدەست دا

## ٤٩

# ئەسماءی کچی ئەبوبەکر
# خاوەن دوو پشتێن

## ئەو ئافرەتەی پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتە سەد ساڵ
## نە ددان و کاکیلەیەکی کەوت و نە بیروهۆشی لەدەست دا

یاوەری ئەمجارەمان گەورەیی و ڕێز لە هەموو لایەك دەیگرێتەوە
باوکی یاوەرو ، باپیری یاوەرو ، مێردی یاوەرو ، کوڕی یاوەر
ئەم گەورەیی و شانازی و شەرەفە بۆ ئەم بەسە

باوکی ناوی ئەبوبەکر هاوڕێی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانیداو ، خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ پاش کۆچی دوایی

باپیرەی ناوی (باوکی عەتیق)ە باوکی ئەبوبەکرە

خوشکی ناوی (عائیشە)یە دایکی موسڵمانان پاکترینی ئافرەتانە ...

مێردی ناوی (زوبەیری کوڕی عەوام) حەواری پێغەمبەری خوا ﷺ ، کوڕی ناوی (عبداللەی کوڕی زوبەیر) – خوا لە ئەم و لە هەمووان ڕازی بێت –

ئەسمای کچی ئەبوبەکر ئەم قارەمانەیە بەستراوە بە ڕووداوی کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ و دایکێکی نموونەیی وایە پیاوی مێرخاس و قارەمانی بێوێنەی لێدەرچوو کچی پیاوێکە لە کاتێکدا خەلیفەی بڕواداران بوو دەیفەرموو :- چی تیایە ئەگەر کاتژمێرێك پێم تۆزاوی بێت لە ڕێگای خوا

(ئەسماء) پاش ئەم حەڤدە ژن و پیاوە موسڵمان بوو و هاتە ناو ئیسلام ، بە یەکێك لە موسڵمانە سەرەتاییە یەکەمەکان دادەنرێت – خوا لە هەمووان ڕازی بێت –

(ئەسماء) چاوکراوە بوو بۆ ئایینەکەی و سوور بوو لەسەر شارەزا بوونی ، تاکو شەست و پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕاوەتەوە

(ئەسماء) بە بڕواداری و دەست و دەم پاکی پەروەردە بوو ، باشترین بەڵگەش ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە ماڵی ئەبوبەکر بە نیازی کۆچ کردن ، (ئەسماء) و عائیشەش لە لایەن بوو ، لەم کاتەدا پێغەمبەر بە ئەبوبەکری گوت :- ئەمانە بڕۆن لە لامان ئەبوبەکر وەڵامی دایەوە و گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەمانە هەردووکیان کچی منن

لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ناڕەزایی دەرنەبڕی، ئەمەش نیشانەی ئەوەبوو (ئەسماء) و عائیشە) ئەم کاتە گەیشتبوونە ئاستی لێپرسراوەتی

هەردەم لەم کاتەوە (ئەسماء) ڕێگای قارەمانیەتی و بەرخۆدانی گرتەبەر ، ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکر لە مەککە دەرچوون بە نیازی کۆچ کردن ، گاورەکانی مەککە بە دەرچوونی پێغەمبەریان ﷺ زانی ، ئەبو جەهل – نەفرەتی خوای لێبێت –

وەکو مانگا سەری هەڵگرت و بە پەلە ڕووی لە ماڵی ئەبوبەکر کرد ، لە دەرگای داو (ئەسماء) دەرگای ماڵەوەی لێکردەوە ، پرسیاری لە (ئەسماء) کرد – کوانێ باوکت ؟ کەی دەرچوون ؟ بۆ کوێ دەرچوون ؟

(ئەسماء) بە هێمنی وەڵامی دانەوەو گوتی :– هیچ نازانم !

بەخۆ گیف کردنەوە گوتی :– سوێند بەلات و عوززا ئاشکرای نەکەی ئازارت دەدەم

هەروەکو جاران وەڵامی دایەوە :– هیچ نازانم ، چیت نەکردووە بیکە

ئەم ستەمکارە گاورە هەتا شەق گرتی لە بناگوێی پیرۆزی (ئەسماء)ی داو گوارەی گوێی لەگەڵ قرتا ، خوێنی ئاڵی پاك لە گوێی هات

بەڵام نەکاری لێکردو نە کۆڵی پێدا

پاش کەمێك باوکی ئەبوبەکر (ئەبو قحافە) هەردوو چاوەکانی کوێر بوو هاتە لایان ، پاش ئەوەی زانی بووی بە کۆچ کردنی کوڕەکەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوتن :– ئەی (ئەسماء) ، وا گومان دەبەم باوکت ماڵی کوێر کردونەتەوەو ماڵەکەی هەموو لەگەڵ خۆی بردووە ، هەروەك ئەوەی دەروونی خۆی کاول کردووەو نیوەی بەجێهێشتووە "

ئەوەی باپیرەی (ئەسماء) ئاماژەی بۆ کردبوو ڕاست بوو ، ئەبوبەکر هەموو ماڵەکەی لەگەڵ خۆی بردبوو بۆ خزمەتی ئیسلام ، بەڵام ئەم کچە ژیرە بە خێرایی بەهۆی بیرە تیژەکەیەوە بیری لە فێڵێك کردەوە بۆ دوو هۆی سەرەکی :– یەکەم جار بۆ ئەوەی دڵی باپیرە بەتەمەنەکەی بداتەوەو دووەم نەوەکو یارمەتییان بدات ، لەبەر ئەوەی (ئەسماء) حەزی نەدەکرد یارمەتی لە گاور وەربگرێت چونکە هێشتا باپیرەی نەبو بوو بە موسڵمان

(ئەسماء) بە دزی هەندێك وورده بەردی کۆکردەوە لەناو کیسەیەك و بە قوماشێکی ئەستوور داپۆشی گوتی :– نەخێر ئەی باپیرە باوکمان ماڵێکی زۆری بۆ بەجێهێشتووین وەرە تەماشاکە بزانە چەند ماڵی بۆ بەجێهێشتووین ، دەستی گرت و لەسەر کیسەکەی دانا ، باپیرەش دڵنیا بوو گوتی :– ئەگەر ئەوەندە ماڵەی بۆ بەجێهێشتبن بەشتان دەکا

هەروەها (ئەسماء) ناو براوە بە خاوەن دوو پشتێن لەبەر ئەوەی ڕۆژی کۆچ کردنە مەزنەکە خواردن دروست دەکات بۆ پێغەمبەر ﷺ و باوکی لەگەڵ گۆزەیەك لەناو ، لەکاتێکدا هیچ شتێکی بەدەست نەدەکەوت خواردن و ئاوەکە پێ ببەستێتەوە ، پشتێنەکەی دەکات بە دوو لەتەوە ، بە لەتێکیان خواردنەکە دەبەستێتەوە بە ئەوی تریان ئاوەکە ، ئینجا لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ دەکات خوا ئەم پشتێنەی خواردن و ئاوەکەی پێ بەستا بوو بۆی بگۆڕێتەوە لە بەهەشت ، بەم جۆرە لەم ڕۆژەوە نازناوی (ذات النطاقين) خاوەن دوو پشتێنی پێبەخشرا

هەروەها (ئەسماء) لەگەڵ بردنی خواردن و ئاوەکە هەواڵی گاورەکانی قوڕەیشی بۆ دەبردن دەربارەی لەدوا گەڕانیان و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەیان ، ئینجا ئەم هەڵسوکەوتەی ئەم ئافرەتە یاوەرە پێی هەڵساوە نازایەتی و زیرەکی و بەهێزی و چاونەترسی ئەم ئافرەتە بەدیار دەخات کە توانیویەتی لەم شەوە تاریکە ئەم کارە ئەنجام بدات

(ئەسماء) مێردی بە (زوبەیری کوڕی عەووام) کرد کەوا یەکێك بوو لە دە هەڵبژاردراوەکانی بەهەشت – خوا لێی ڕازی بێت – گەنجێکی هەژار بوو هیچ

خزمەتکارێکی نەبوو بۆی هەڵبستێت بە خزمەتکردنی ، یان ماڵێك بتوانێت خێزانەکەی پێ بحەوێنێت تەنها ئەو ئەسپە نەبێت کەوا سواری دەبوو

زوبەیر باشترین و چاکترین ئافرەتی‌موسڵمانی خواست خزمەتی‌دەکردو ولاّخەکەی ئالیك دەداو چاودێری دەکرد و ناوکە خورمای بۆ دەکرد بە عەلەف ، تاکو خوای گەورە وای کرد زوبەیر بو بە دەوڵەمەندترینی یاوەرەکان

کاتێك هەلیان بۆ ڕەخسا بۆ ئەوەی کۆچ بکەن بۆ مەدینە بۆ پاراستنی ئایینەکەیان ، (ئەسماء) کاتی منداڵ بوونی نزیك بووبوو ، ئەمەش نەبووە هۆی ئەوەی ئەم ئافرەتە موجاهیدە لەم کۆچە دوا بکەوێت پاش گەشتێکی درێژ ، ئەوە بوو هەر کە گەیشتنە (قباء) عبداللەی کوڕی زوبەیر لە دایك بوو

موسڵمانان تەکبیرو تەهلیلەیان لێدا ، لەبەر ئەوەی یەکەم منداڵ بوو لە شاری مەدینە لە کۆچکردووەکان هاتە سەر دونیا

(ئەسماء) هەڵیگرت‌و بردی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە باوەشی داینا ، هەندێك خورمای تەڕکرد بە دەمی پیرۆزی خۆی خستیە ناو دەمی (عبدالله) بەم جۆە یەکەم شت چووە ناو دەمی (عبدالله) لیکی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو

* * *

(ئەسماء)ی کچی ئەبوبەکر هەندێك لە سیفەتی چاکەو بیرتیژی‌و سیفەتی بەرزی وای لێ کۆببوەوە مەگەر تەنها لە هەندێك پیاو ئەم سیفەتە پەیدا بووبێ

دڵفراوانی‌و سەخاوەتی گەیشتبووە ئاستێك لە کاتی نموونەی سەخاوەت نموونەیان پێ دەهێنایەوە :- هەروەکو (عبدالله)ی کوڕی بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت :-

نەمبینیوە لە ژیانم وەکو ئەم دوو ئافرەتە پوورم عائشەو دایك‌و (ئەسماء) سەخاوەت تر ، بەلاّم سەخاوەتی‌یەکەیان جیاوازی هەبوو

هەرچی پوورم بوو شتی لەسەر شت کۆدەکردەوە تاکو دەگەیشتە ڕادەیەك بۆ ئەوەی دابەشی بکات بەسەر خاوەن پێویست‌و هەژاران بەلاّم دایکم شتێکی نەدەهێشتەوە بۆ بەیانی

ئینجا ئەگەر مێژوو ئیمڕۆ هەموو هەڵوێستەکانی (ئەسماء) لەیاد بکات ، ئەوا بیرتیژی‌و خۆڕاگری‌و هێزی بڕواداریەکەی لە یاد ناکات کاتێك گەیشت بە کوڕە شیرینەکەی لە کۆتا بە یەکگەیشتنیان

ئەمەش ئەو کاتە بوو کەوا (یەزیدی کوڕی معاویە) مرد ، بەیعەتی خەلافەتی درا بە (عبدالله کوڕی زوبەیر) ، ئەوە بوو حیجازو میسرو عێراق‌و خوراسان‌و زۆربەی ولاّتی شام بۆی مل کەچ بوون

بەلاّم ( بەنی ئومەیە) ماوەی پێنەدا تاکو سوپایەکی گەورەیان بۆ ڕەوانە کرد بە سەرکردایەتی (حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی) ، لە نێوان هەردوو سوپا جەنگێکی دژوار ڕوویدا و (عبداللەی کوڕی زوبەیر) قارەمانێکی بێ وێنەی نواند هیچ سوارچاکێکی ئازا شانی لە شانی نەدەدا

بەلاّم لایەنگیرەکانی سات لە دوای سات پشتیان تێدەکردو وازیان لێدەهێنا ئەوەبوو پەنایان بردە بەر ماڵی خوای پیرۆز ، خۆیان و پیاوەکانی پارێزگاری خۆیان دەرکرد لەم شوێنە پیرۆزە

چەند ساتێك پێش شەهید بوونی چووە لای دایکی خۆشەویستی (ئەسماء) کەوا ئافرەتێکی پیری بەساڵاچوو بوو چاوەکانی لە دەست دابوو - پێی گوت :-
السلام علیك ئەی دایکە ورحمە اللە وبرکاتە
ئەویش وەڵامی دایەوە :-
وعلیك السلام ئەی عبداللە - چی وای لێکردوویت لەم کاتو ساتەدا بێی بۆ ئێرە ئەو بەردانەی مەنجەنیقەکانی حەجاج دەیهاوێتە سەر سەربازەکانت لە حەوشی کەعبە ماڵەکانی مەککە دەهێنێتە لەرزین ؟ !
عبداللە گوتی :- هاتووم ڕاوێژت پێ بکەم
ئەویش گوتی :- لە چ شتێك ؟ - ڕاوێژم پێ دەکەیت ؟!
عبداللە گوتی :- خەڵکەکە بەجێیان هێشتووم چوونەتە ناو لەشکری حەجاج ئینجا چ لەبەر ماڵی دونیا بێت یان لەترسان تاکو نزیکەکانو و منداڵەکانیشم بە جێیان هێشتووم ، تەنها چەند کەسانێکی کەم لە پیاوەکانم لە دەورە ماوە ، ئەوانیش تەنها دەتوانن کاتژمێرێك یان دوو کاتژمێر بەرگە بگرن ئەوانیش ئارامیان نامێنێتو نێردراوەکانی (بەنی ئومەمیە) لەگەڵم ڕێکدەکەون لەسەر ئەوەی هەر شتێکم بوێت لە دونیا پێم ببەخشن بەرامبەر ئەوەی من چەك دابنێمو موبایەعەی (عبدالملك کوڕی مەروان) بکەم ، ئینجا ئامۆژگاریت بۆم چییە ؟
(ئەسماء) دەنگی بەرز کردەوەو گوتی :-
ئەم کارە کاری خۆتە ئەی (عبداللە) ، تۆ کاروباری خۆت چاکتر دەزانیت ئەگەر تۆ بڕوایت وایە لەسەر هەقیتو ، داوای هەق دەکەیت ، ئارام بگرەو خۆڕاگر بە هەروەك هاوڕێکانت ئارامیان گرت کەوا لەژێر ئاڵاکەت کوژران بەڵام ئەگەر تۆ نیازت دونیا بوو بێت تۆ خراپترین بەندەیو خۆت بە فەوتان داو، کەس‌وکارەکانیشت بە فەوتان دا
عبداللە گوتی :- بەڵام من ئیمڕۆ کوژراوەو هیچ چارەسەری نییە
(ئەسماء) گوتی :- من لە مردن ناترسم ، بەڵام لەوە دەترسم خۆت بدەیتە دەست حەجاج بە ئارەزووی خۆت ، (بەنی ئومەمیە) گاڵتە بە سەرت بکەن
عبداللە گوتی :- من لە مردن ناترسم . بەڵام لەوە دەترسم ئەتك بە جەستەم بکەن
(ئەسماء) گوتی :- پیاو لەپاش مردن ناترسێت ، کاوڕی کوژراوە کەوڵکردن ئازاری پێناگەیەنێت
ڕوخساری (عبداللە) لە کەیف خۆشییان گەشایەوەو گوتی :-
بەڕاستی دایکێکی پیرۆزیو ، سیفەتت بەرزو پیرۆزە من کەهاتم لەم ساتو کاتەدا تەنها بۆ ئەوە بوو کە گوێت لێبگرم لەوەی کە گوێم لێبوو ، سوێند بەخوا نە بێهێز بوومەو نە بێ وورە ، خوا خۆی ئاگادارە من کە هەڵنەستاوم بۆ ئەم کارە خۆشەویستی و ئارەزووی دونیای لەناو بێت بەڵکو لەبەر تووڕەیی خوا بۆ ئەوەی دژی خراپە بوەستم
ئەوا ئێستا دەڕۆم بۆ ئەو شتەی تۆ پێت خۆشە ، ئەگەر کوژرام خەمم بۆ نەخۆیت و کارم بدە دەست خوا
:- من خەمت لێدەخۆم ئەگەر تۆ لەسەر ناهەق بکوژرێیت
(عبداللە) گوتی :- لەم بڕوایەدا بە کەوا کوڕەکەت لە ژیانی بە ئەنقەست خراپەیەکی نەکردووە ، وە کارێکی بێشەرعی نەرکردووەو ، لە فەرمانی خواش لای نەداوەو .

غەدری لە کەس نەکردووەو، دەستی ستەمی بۆ هیچ موسڵمانو خاوەن کیتابێك درێژ نەکردووە ، وەهیچ شتکێش لە لای من لەمە چاکتر نی‌یە بێجگە لە ڕەزامەندی خوای گەورە نەبێت

ئەم قسانە ناکەم بۆ ئەوەی خۆم پاك بکەمەوە ، خودا لەمن ئاگادارە ، تەنها بۆ ئەوە ئەم قسانەم کردووە بۆ ئەوەی ئارامی بخەمە ناو دڵتەوە

(ئەسماء) گوتی :- ستایش بۆ ئەو خودایەی کەوا لەسەر کارێکی خواش پێ‌ی خۆشە ومنیش پێم خۆشە لێم نزیك بەوە ئەی کوڕم بۆ ئەوەی بۆنت بکەم و دەستم بە جەستەت بکەوێت لەوانەیە ئەمە کۆتا پێکەیشتنمان بێت

(عبدالله) پڕی دا دەستو پێ‌ی دایکی و تێروپر ماچی کرد ، ئەویش لووتی‌دەگێڕا بەسەر ملو دەموچاوی (عبدالله) بۆنی دەکردو ماچی دەکرد ، دەستە پیرۆزەکانیشی دەگێڕا بەسەر جەستەی ، پاشان دەستی لێ‌هەڵگرتو گوتی :-

ئەمە چی‌یە لەبەرت کردووە ئەی (عبدالله) ؟!

(عبدالله) گوتی:- ئەمە زرێ‌یە

(ئەسماء) گوتی : ئەمە چ جل‌وبەرگێکە بۆ یەکێك شەهادەتی مەبەست بێت

( عبدالله) گوتی :- بۆ ئەوەی لەبەرم کردووە ئازارت لەسەر هەڵبگرمو ، دڵت ئارام بگرێت

(ئەسماء) گوتی :- لەبەری بکەوە ، بۆ ئەوەی بە غیرەت تر بیتو زیاتر پەلامار بدەیتو لەشت سووك بێت ، بەڵکو لە جیاتی ئەم چەند شەرواڵێك لەبەر بکە ، تاکو ئەگەر شەهید بوویت عەورەتت بەدیار نەکەوێت

* * *

(عبدالله) زرێ‌کەی داکەندو، شەرواڵەکانی لەبەرکردو ، ڕۆیشت بۆ حەوشی کەعبە بۆ بەردەوام بوون لەسەر جەنگو دەیگوت :- ئەی دایکە لەسەر دوعاکردن سارد نەبیت

(ئەسماء) دەستە پیرۆزەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو دەیگوت :-

پەروەردگارا بەزەییت پێ بێتەوە بە برسیەتی و تێنوویەتی‌یەکانی بە تاوەکانی لە تاریکایی شەوداو خەڵکیش لە پرخەی خەودا بوون

پەروەردگارا بەزەییت پێ بێتەوە بەم کارە چاکانەی لەگەڵ دایكو باوکی دەکرد

پەروەردگارا من ئەمەم دا دەست تۆو ، ڕازیم بەمەی بەسەری دەهێنی ، لە تۆڵەی ئەمەنەش ئارامیم پێ ببەخشە ...

هێشتا ڕۆژئاوا نەبوو بوو هەر ئەم ڕۆژە (عبداللەی کوڕی زوبەیر) گەیشت بە پەروەردگاری لە پاش شەهید بوونی (عبدالله) ، (ئەسماء) نزیکەی بیست ڕۆژ ژیا ئەویش گەیشت بە پەروەردگاری ، لە کاتێکدا تەمەنی گەیشتبووە نزیکەی سەد ساڵ ، لەگەڵ ئەمەشدا نە ددانێكو نە کاکیلەیەکی نەکەوتبوو و، بیروهۆشیشی لەدەست نەدابوو

سەلامی خوا لە یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەسماء)ی کچی ئەبوبەکری صدیقو کوڕە یاوەرە شەهیدە سەربەرزەکەی

* * *

٥٠

# حوبابی کوڕی مونــذر
# خاوەن بیروڕای دروست

هەندێـك لـە خـەڵکی سـاویلکەو سـادە وای بـۆ دەچـن کـە جەنگـە جیهادی‌یـەکان لـە مێژووی ئیسلام بریتی‌یە لە وڵاخ و شمشێرو هـاوارکردن ، موجاهید تەنها هـاواری (اللـه اکـبر) بکاو ، پاشان خۆی بهاوێتە ناو جەنگ .

لەگەڵ ئەوەی کەرەستەی جەنگاوەرە موجاهیدەکان بریتـی بوو لـە شمشێر ڕمو وڵاخ پێش ئەمەش بڕوایەکی بە تین .

هـەروەها ڕێکخسـتن و نەخشەکێشـان و ئامـادەکردن ، بنچینــەو کۆڵەگــەی گرنگــن ، هـەروەك هونـەری جـەنگی و ئیسـتراتجیەتی سـەربازی دەوڵەتــەکان لـە چـەرخی نـوێدا بایەخ و گرنگی‌یەکی یەکجار زۆری پێدەدەن ، ئەم بیروبۆچوونانەش لە مێژووی جیهاد پارچەیەکەو لێی جیا نابێتەوە ...

ئینجـا هـەر سـوپایەك یـان پۆلێـك دروسـت کـرا بێـت ئـەوا پشـتی بەسـتووە بـە نەخشەکێشان و لێکۆڵینەوە . هەر کاتێکیش لە چەرخی ئەمڕۆماندا چاوێك دەخشێنرێت بەم جەنگانە پاش بەسەر داڕۆیشتنی چواردە سەدە بە وەستانێکی سەر سوڕمان و بەرێز دەوەستین بەرامبـەر ئـەم هـێزو توانایـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ و یـاوەرە بـەرێزەکان بەخشیویانە لە پێناوی خوا

قارەمانی ئەمجارەمان (حوبابی کوڕی مونذیر) – خوا لـێی ڕازی بێـت – یەکێکە لەم مێشـك کۆمپیوتەرانـەو نەخشـەدانەرە بەرێوبەرانـە ، هـەر جـەنگێکی بینـی بێـت ئـەوا بۆچوونە چاکەکان و بیروڕ بەهێزە ستراتیجی‌یەکانی ئەم جەنگەی لەگەڵ بـووە ، لەبـەر ئەوەی جێگـای سەرسـوڕمان نی‌یـە ئەگـەر مێـژوو بیناسـێ و نـاوی بـهێنێ بـە (خـاوەن بیروڕای دروست)

ئینجـا لەبـەر ئـەوە پێویسـتە بزانـین (حوبـاب) کێیـەو ؟ کـەی موسـڵمان بـووە و ؟ جیهادەکانی کامانەن و ، ؟ هەڵوێستەکانی چین ؟ چۆن ژیانی کۆتایی پێهاتووە ؟

هۆزی (خەزرەج) هۆزێك بوو لایەنی بەرامبەریان لەگـەڵ هـۆزی (ئـەوس) لـە (یەثـریب) دروست کردبوو سەبارەت بە پلەو پایە دەسـەڵات ، هەرچەندە یـەکێکیان ژمارەی زیـاتر بوو لە ئەوی تریان ...

یەکێك لە سەرۆك و دەم ڕاستەکانیان (عمرو کوڕی جەموح) بوو ، لەگەڵ ئـەوەی کـوڕی (عمرو) کە ناوی (معاذ کوڕی عمرو) بوو موسڵمان بووبوو لە بەیعەی (عەقەبە) موبایەعەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ کردبـوو ، بـەڵام هـەر لەسـەر هاوبـەش پـەیداکردن و مـل هـوڕی مابووەوە ، ئەوەکو هۆزەکـەی ئەنگی لـێبگرن لەبـەر ئـەوە دەرچـوو لـە ئـایینی بـاوك و باپیرانی ...

ئەم هۆکـارەش کـارێکی گشـتی بـوو لـه دەروونـی گـەورەی جاهیلی یـەکان و قورەیشی یەکان ، بە هەموو توانایەکیان سوور بوون لەسەر دەست گرتن بە ڕێبازی باوك و باپیرانیان ، تاکو ئەگەر پەرستراوەکانیان بت و دارو بەرد بوایە ...

جگە لەمانـەی کـە باسمـان کـرد دەسـت گرتنیـان بـە ئـاییـنی کۆنیـان ، لەبـەر ئـەوە بـوو ئـەوەك پلەوپایـەو دەسـەڵاتیان لەدەسـت بچێـت ، چونکـە وا گومانیـان دەبـرد موحەممەد ﷺ دەیەوێت دەسەڵاتیان لەبەر دەست دەربـهێنێ و ئـەوان لـێ‌ی بێ‌بەش بن و بەسەریان زاڵ بێت ، ئینجا لەبەر ئەم هۆیە دوژمنداریان بۆ دەناوەو ، دەوەستان بەرامبەر بانگەوازەکەی ...

(عمر کوڕی جەموح) هەروەك نەریتی گەورەکان بتێکی لەماڵەوە هەبوو ، ناوی لێنابوو (منـاة) بـە گـەورەو پـیرۆزی دەزانـی و لـێ‌ی نزیـك دەبـۆوە ، بـەیانیان و ئێـواران لـێ‌ی دەپاڕایەوە ... وای لێهات کوڕەکەی گاڵتەی بەوبتە دەکرد کەوا باوکی بـۆی دەچـووە ژوورەوەو دەیپەرست و لـێ‌ی نزیـك دەبـووەوە ، شـەوێك لـە شـەوان کوڕەکـەی لەگـەڵ (موعاذ کوڕی جەبەل) – خوا لێیان ڕازی بێت – لە بتەکە دەچنە ژوورەوەو هەڵیدەگرن و فڕێ‌ی دەدەنە ناو چاڵێکی زبڵ و پیسایی بۆ بەیانی (عمرو) دەڕوا بـۆ لای (منـاة) نایبینێتەوە و هاوار دەکات :-

– خاکتان بەسەر ئەوە کێ دەستی بردووە بۆ خواکانمان ئەم شەوە ؟

پاشان هەڵسا لە دوای گەڕاو لەناو چاڵێك بینی‌یەوە بە هەڵگەڕاوەیی ، هەڵیگرتەوەو شووشتی و پاکی کردەوەو بۆنی لێدا ، پاشان بردی لە شوێنەکەی خـۆی داینـاوە ، وەستا لە ئاوەدانی‌یەك کەوا خەڵك کۆمەڵەی کردبوو بە تووڕەیی‌یەوە گوتی :-

– بەڵام سوێند بەخوا ئەگەر دەمزانی کێ وای بەمە کردووە ڕیسوای دەکەم .

*　　　　*　　　　*

ئەم کارە چەندبارە بووەوە بەهۆی – خوا لێیان ڕازی بێت – تا وای لێهات (عمرو) ڕێگای لەبەرچاو تەسك بوو نا ئومێد بو ڕۆژێك هەڵسا شمشێرەکەی لەملی بتەکە ناو پێ‌ی گوت :-

– سوێند بەخوا من نازانم کێ وات پێ دەکات هەروەك دەبینرێت ، ئەگەر خێرت پێوە مابێت بەرگری لەخۆت دەکەیت ، ئەمە شمشێرە لەگەڵت ...

پاشان نووست وکەوتە پرخەی خەو ...

دووبارە هـەندێك لـە گەنجـەکانی (بـەنی سـەلمە) (معـاذ کـوڕی عمـرو) و(معـاذ کـوڕی جەبەل) هاتنەوە بۆ لای بتەکە شمشێرەکەیان لە ملی کردەوەو پاشان سەگێکی تۆپیویان هێنا لێکیـان بەسـتانەوە بـە پـەتێك شـۆڕیان کردنـەوە نـاو بـیرێك کـەوا زبـڵ و پیسـایی خەڵکیان تێدا کۆدەکردەوە ... پاشان ڕۆیشتن ...

کاتێك (عمرو) بۆ بەیانی چووە لای بتەکەی ، لە شوێنی خۆی نەمابوو ، لەدوای گەڕا تـاکو لـەناو بیرەکـە بـە هەڵگـەڕاوەیی دۆزی‌یـەوە ، سـەری بەسـترا بوو لـە سـەگێکی تۆپیـو و ئەویش بە گاڵتەوە بەرامبەری وەستا و گوتی :-

والله لـــو كـنت الـها لم تكـــن أنت وطب وسط بئر في قرن

أف لـملقـاك الـهـا مـســـتـدن الآن فتشـناك عـن سـوء الغـبن

الـحمـدلله العـليّ ذى المنـــــن الواهــب الـرزاق ديــان الدّيـــن

هو الـذى لله أنقذني من قبل أن أكـون فـي ظلـمه قبر مرتـهـــن

بأحمــد الـهادي النبــي المرتهــن

بەم جۆرە ویژدانی (عمرو کوڕی جەموح) زیندوو بووەوەو بە ئاشکرا موسڵمان بوونی خۆی بڕیـار داو هۆزەکەشـی لەگـەڵی بـوون بـە موسـڵمان ئەوانـەی ڕێزیـان لـێدەناو گوێڕایەڵی بوون .

لەم کاتوساتەدا (حوباب کوڕی مونـذیر کوڕی جەموح کوڕی زەید کوڕی حەرام کوڕی کـەعب کـوڕی غنـم کـوڕی کـەعب کـوڕی سـەلەمەی خـەزرەجی) بـوو بـە موسـڵمان و ئیسلامیش باوەشی بۆ کردەوە .

(حوباب) کوڕە برای (عـەمرو کوڕی جـەموح) بوو گـەنجێك بوو تەمـەنی خۆی لە سی ساڵان دەدا ، زۆر ڕای لـە کەسایەتی خۆی بوو ، سـەرفراز بـوو بـە بیروڕاکـانیو ، زۆر دەمارگیری هۆزایـەتی هـەبوو ، زوو هـەڵدەچوو ، خوێـن گـەرمو چـەپووك بـوو . ڕێـزی لە سـەرۆکی هۆزەکـی دەناو ، لەبـەر ئـەوە بـە موسـڵمان بوونـی (عمـرو کـوڕی جـەموح) ئەویش بوو بە موسڵمان ، هـەروەها لـە دەروونـی خۆی هیوای وابوو مـامی زووتـر ئـەم کارە بکات ...

(حوباب) پێش کۆچکردن موسڵمان بوو ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە شاری مەدینـە ، ڕۆژی ئاییـنـە پتەوەکـەی هـەڵات لەسـەر ناوچـەکانی ، بیـنـرا پـاش ئـەوەی نەدەبینراو ، بریسکایەوە پاش ئەوەی تاریکی دایگرتبوون ، حوبـاب - خـوا لـێی ڕازی بێت - یەکێك بوو لەم کۆڵەکانەی پشتی پێدەبەسترا و بیروڕای لـێوەردەگیرا و جێگـای بڕوایی بوو و یەکێك بوو لە نزیکە دڵسۆزەکان .

لە کاتی خوێندنەوەی سیرەو پەرتووکە مێژووییەکان کەسایەتی یـاوەری قارەمـان (حوبـاب کـوڕی مونــذر)مـان بۆ دەردەکـەوێت ، کەسـایەتیەك خـاوەن ئاسـتێکی بـەرز لـە نەخشەی جەنگی ستراتیجی سەربازی .

کـاتێك پێغەمبــەری خــوا ﷺ ڕۆژی بــەدر خــەڵکی ئامـادە دەکـرد بـۆ ڕێگرتـن لـە کاروانەکانی (ئەبو سوفیان) (حوباب کوڕی مونـذر) یەکێك بوو لـە پێشـەنگەکان ، کـاتێك گەیشـتنە (بـەدر) ، لـە نزیـك ئاوەکـە خسـتیان حوبـاب هاتـە لای پێغەمبـەری خـوا ﷺ پێیگوت :-

- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا ئەم جێگایە خوا دایبەزاندووەو بۆ ئێمە نییە قسەی لێ بکەینو کەموکورتی تێدا بکەین یان ئەمە بیروڕاو جەنگوفێڵە ؟

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- بەڵکو ئەمە بیروڕاو جەنگوفێڵە ؟

حوباب گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم جێگایە جێگا نی‌یە ، بەڵکو فەرمانمان پێبکە هەڵسین تاکو هەموو بیرەکان دەکەونە پشتمان و پاشان هەمو بیرەکان پڕ بکەنەوە تەنها یەك بیر نەبێت ، پاشان حەوزێکی لێ‌هەڵێنەو شەڕ لەگەڵ دوژمنان دەکەین ، ئێمە لێی دەخۆینەوەو ئەوان لێی بێ بەشن تاکو خوا بەلایەکمان دەدا

- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- چاکترین بیروڕات دا

پاشان ئەم کارەیان کردو ، لە ئاکامی ئەم کارە ، گاوران تووشی تینوێتی‌یەکی بێ ئەندازە بوون ، (ئەسوەدی کوڕی عبدالاسدی مەخزومی) یەکێك بوو لە پاڵەوانەکانی قورەیش هەوڵی‌دا بگاتە حەوزەکەو بیڕوخێنێت ، ئینجا جەنگ دەستی پێ‌کردو ، جەنگێکی زۆر دژوار ، موسڵمانان ژمارەیان کەم بوو ، ژمارەیان ئەدەگەیشتە سێ‌سەد جەنگاوەر ، تەنها یەك ئەسپیان لەگەڵ بوو لەگەڵ حەفتاو دوو ووشتر ، بەڵام گاورەکان ژمارەیان لە هەزار جەنگاوەر زیاتر بوو ، خۆیان ئامادە کردبوو بۆ جەنگێکی سەخت ، مل هوڕی باڵی بەسەردا کێشابوون‌و ، دڵڕەقی‌و غروریش زاڵ بوو بەسەریاندا

کاتێکیش جەنگەکە توونـد بـوو ، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە سـووچێك لـە خـوا دەپاڕایەوەو دەیفەرموو :-

- پەروەردگارا سەرکەوتنت کەوا بەڵێنت پێ‌داوم ، پەروەردگارا ئەگەر ئەم کۆمەڵە لەناو ببرێت کەس نامێنێت بتپەرستێت لەسەر زەوی لە دوای ئەمڕۆوە

بەردەوام خۆشەویستمان ﷺ لەپاڕانەوەدا بوو تاکو خەوێك بردی‌یەوە ، پاشان ڕووی لە یاوەرەکـان کـردو هـانی‌دان‌و دڵنیـای‌کردن‌و بـەڵێنی سـەرکەوتنی پـێ‌دان لەگـەڵ بەهەشتێك کەوا خوای گەورە بەڵێنی بە بەندە بڕواداره ڕاستگۆیەکان داوە

موسڵمانان هەڵسان بە ڕاست زانینی گومانی پێغەمبەر ﷺ بۆیان ، هەڵسان لە بەرەو ڕووی گاورەکان‌و شەڕێکی توونديان لەگەڵ کردن ، بە گیانێکی پڕ بڕوایی و پاداشت و توانایەکی ئیسلامی نەیان دەزانی‌نەرمی‌و وەستان چی‌یە ، تاکو گاورەکان شکستیان خواردو موسڵمانان سەرکەوتن ، سەرکەوتنیشیان لە بـەدر نیشـانەی جیـاوازی نێـوان هەق‌و ناهەق بوو

حوبـاب لەگـەڵ لایـەتی بـیروڕای چـاك‌و ڕاوێژپـێ‌کردنی قارەمـانێکی بێ‌وێنـەو سوارچاکێکی پێشەوەی جەنگ بوو ، پاڵەوانێك بوو نەیدەزانی هەڵاتن و پشت تێکردن چی‌یە ؟ ئەوەبوو لە گۆڕەپانی جەنگ دەچەسپا هەرچەند کارەساتی گەورەو خوێن ڕژان‌و کوشتاری گەورەی تیا کرابایە

هیچ کاتێك لە جەنگ دوا نەدەکەوت‌و ، لە بانگەوازێك بێ ئاگا نەدەبوو ، هەر کە بانگدەر جاڕی جیهادی لێ بدابا ( حوباب) یەکەم کەس بە پیری‌یەوە دەهات‌وپێشەنگی موجاهیدان بوو ، لە پێشەوەی ڕیزەکان

لە ڕۆژی خەندەق خۆڕاگر بوو لەگەڵ خۆڕاگرە ڕاستگۆیەکان بەرگری کرد لە سنووری بڕواداران‌و ، لە جەنگی ئوحدیش لەگەڵ چەند موجاهیدێکی کەم چەسپا لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ لە زۆربەی جەنگەکان ئاڵا هەڵگر بوو ، ئەمەش هەر لەبەر ئەوە بوو شایانی هەڵگری ئەم ئاڵایە بوو بۆ ئەوەی بەرگری لێ‌بکات ، لەبەر ئەوەی

ئەم ئالآیە نیشانەی سوپا بوورو ، ئەو کەسەی هەڵیدەگرت دەبوایە لە پێناوی بمرێت‌و خوێنی بۆ بڕێژێت هەروەها ڕۆژی (خەیبەر) سەرکردەی گشتی سوپا پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، چوار سەر لەشکری لەم سوپایە دروست کردبوو

پێش پەلامار بردن پێغەمبەری خوا ﷺ چوار ئالآکەی دابەشی سەر چوار سەرکردە کردبوو ، دوو ئالآ بۆ کۆچکردووەکان ئەبوبەکری صدیق‌و عومەری کوڕی خەتتاب هەڵیان گرتبوو ،دوو ئالآ بۆ یاریدەدەرەکان (سەعدی کوڕی عوبادە)و(حوبابی کوڕی مونذر) هەڵیان گرتبوو – خوا لێیان ڕازی بێت –

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بنکەی سەرکردایەتی لە ناوچەیەکی ئاشکرا دانا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یەکێك لە قەڵاکانی جولەکە

لە ڕۆژی یەکەم جەنگێکی توند ڕوویدا ، تێیدا پێغەمبەری خوا ﷺ خودی خۆی بەشداری تێدا کرد بەڵام ماندووبوونەکەیان بێ‌هوودە بوو ، ئەنجامی جەنگەکە لەنێوان موسڵمانان‌و جولەکەکان بەرامبەر بوو، موسڵمانان تێیدا زیانێکی گەورەیان کرد پەنجا جەنگاوەر تێیدا بریندار بوون ، لە ئەنجامی ئەم تیر بارانەی جولەکەکان دەیانکردە سەر موسڵمانان لەسەر دیواری قەڵاکانیان ، لێرەدا دەوری قارەمان (حوبابی کوڕی مونذر) بەدیار کەوت ، وای تێبینی کرد ئەم شوێنەی موسڵمانان واتە پێغەمبەر ﷺ هەڵیان بژاردووە بە بنکەی سەربازی لە لایەنی ستراتیجیەتی سەربازی باش نی‌یە ، حوباب کاتی شەو چاوێکی بە گۆڕەپانی جەنگ خشاند ، بینی ئەم قەڵایەی موسڵمانان مەبەستیانە پەلاماری بۆ بدەن کەوتۆتە شوێنێکی بڵندو سەربازگەی موسڵمانانیش بە ئاشکرا کەوتۆتە بەرامبەریان ، هەروەها سەربازگەی موسڵمانان لەسەر زەوی‌یەکی داپۆشراو بە گژوگیا بە هیچ جۆرێك بە کەڵکی سەربازی نەدەهات ، ئەوەبوو حوباب هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئامۆژگاری و نیازێکی پاك گوتی :-

– ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ سەبازگەت لەم شوێنە داناوە ، ئەگەر فەرمانەو پێت کراوە ئەوا قسەی تێدا ناکەم ، ئەگەر بیروڕاشە قسەمان لەگەڵ بکە

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- بەڵکو ئەمە بیروڕایە .....

حوباب بە ئەدەب‌و ڕێزەوە بەرامبەر پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی :-

– ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك بوویتەوە لەم قەڵایەو، خستوتە لە نێوان دارستانی خورما‌و گژوگیای قەوزە لەگەڵ ئەوەی خەڵکی قەڵای (النطاة) من دەیانناسم میللەتێکن لە ئێمە تیرهاوێژ تر نین و ، ئەوان شوێنیان لە ئێمە بڵندترە ، خێراتر تیرەکانیان بۆمان شۆڕدەبێتەوە ، لەگەڵ ئەوەش لەوانەیە کاتی شەو پەلامارمان بۆ بێنن و بچنە ناو چڕایی دارستانی خورما ، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەم شوێنە بگوازەوە بۆ شوێنێك پاك بێت لە قەوزەو گژوگیا ، ئەم پەنایەش بکەین بە نێوانمان ، تاکو تیرەکانیان نەمان گرێتەوە

پێغەمبەری خوا ﷺ بیروڕای حوبابی پێ‌باش بوو و فەرمووی :-

– بەڕاستی بیروڕات دەربڕی ، ئەگەر شەومان بەسەر داهات دەگوازینەوە

کاتێك شەو تاریکایی هێنا موسڵمانەکان گواستیانەوە بۆ شوێنە نوێکە بۆ سەربازگە لە جێگایەك بە ناوی (وادی الرجیع) واتە دۆڵی رەجیع ئەم شوێنە بۆ هێرش بردن و بەرگری کردن لە شوێنەکەی تر چاکتر بوو

ڕاوێژکردنی(حوباب) کاریگەرێکی مەزنی هەبوو لەسەر کەم کردنەوەی زیانی موسڵمانان و بوو بە هۆیەك لە هۆیەکانی سەرکەوتن کەوا پاش ئەم گواستنەوەیە پێ ی گەیشتن

ئەم ئاڵایەی حوباب هەڵیگرتبوو لە خەیبەر بە شەکاوەیی گەڕایەوە بۆ مەدینە ، ئەمجارەش ئەم قارەمانە سەلماندی خاوەن بیروڕای دروست و دووربینە ، هەروەها موسڵمانی بە خووڕەوشتیش شایەنی هەڵگرتنی ئاڵای پێغەمبەری خوایە

پاش ئەوەی سوپای ئیسلام لە خەیبەر بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە و مزگێنی ئەم سەرکەوتنە مەزنەیان لەگەڵ خۆیان هێناوە ، بە کەیف و خۆشی یەکی یەکجار زۆر پێشوازی یان لێ کرا

ئیتر (حوباب)– خوا لێ ی ڕازی بێت – بووە جێگای بڕوایی پێغەمبەری خوا ﷺ و یەکێك لە سەرلەشکرەکانی جەنگ و پشتی پێ دەبەستێت و ڕێزی لە بیروڕای دەنا

(حوباب) پاش ئەمە بەشداری هەموو جەنگەکانی کرد ، هەر لە هەموویان – وەکو پەرتووکە سیرەکان دەیگێڕنەوە – جێگاو شوێنێکی دیارو چاك و جیهادێکی مەزنی کردبوو

لە جەنگی تەبوك و فەتحی مەککە و حونەین جێگایەکی گرت کەوا شایەن و لێهاتوو بوو بۆ وەرگرتنی سوچێك لە سوچەکانی جەنگ و سەرکردایەتی کردنی هەندێك لە کەتیبەو پۆلەکان و هەڵگری ئاڵایان بوو شانازی پێوە دەکرد

با ئەمەش لەیاد نەکەین (حوباب) یەکێك بوو لەوانەی بەیعەی پێغەمبەری خوادا ﷺ لەسەر مردن ڕۆژی حودەیبی یە ، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ بە نوێنەری گفتوگۆ ڕەوانەی کرد بۆ سەر قورەیشەکانی مەککە

(حوباب) – خوا لێ ی ڕازی بێت – بە ئایین و بڕوایەکی بەتین ژیا کەوا هەموو ئەندامەکانی جەستەی شایەدی ئەم بڕوایی یەیان بۆ دەدا

هەروەکو لە پێشەوە باسمان کرد (حوباب) – خوا لێ ی ڕازی بێت – دەمارگیری یەکی توندی هۆزایەتی هەبوو ، بەڵام کە بوو بە موسڵمان بەرە بەرە ئەم دەمارگیری یەی لە دەروونی توایەوە ، ئەم بڕوادارە کەوا چالاکی دەنوێنێ بە هۆی هاندەرێکی ئیمانی یەوە ، ئەم کاتە هەموو بۆچوون و هەڵسەنگاندنێکی بە هۆی ئیمانەکەیەوە دەبێت بەم جۆرە لەسەر ئەم وەفایی و ڕاستگۆیی یە مایەوە تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، ئینجا موسڵمانان گەیشتنە دۆخی هەڵبژاردنی خەلیفایەتی لە پاش پێغەمبەری خوا

هەندێك لە یاریدەدەرەکانی کۆبوونەوە لە ژێر کەپری (بەنی ساعدە) بیریان دەکردەوە لە هەڵبژاردنی خەلیفە لە دوا پێغەمبەری خوا ﷺ یەکێك لەمانە (حوباب) لەگەڵیان بوو ن هەندێك لە هۆزەکەی وایان کرد ئەم دەمارگیری یە لە دەروونی (حوباب) خەوی لێ کەوتبوو بۆ ماوەیەکی زۆر ، زیندووی بکەنەوە هەر کە (عومەری کوڕی خەتتاب و

ئەبوبەکری صدیق) و هەندێك لە کۆچ کردووەکان سوڕانەوە لەسەر سەقیفە بۆ ئەوەی لە کاروباری موئتەمەر بکۆڵنەوەو دۆخەکە بگۆڕنەوە بۆ بارودۆخێکی هێمن و گونجاو بۆ موسڵمانان ، تاکو (حوباب) بەرەو ڕووی ئامادەبووەکان وەستاو گوتی:-

- من سینگی محەکم و دینگەی دیواری بەلادا هاتووم ...

واتە :- یەکێکە لەوانەی بیروڕای وەردەگیرێ و بە گوێی دەکەن لە تەنگانە

پاشان بەرامبەر ئەبوبەکر و عومەر گوتی :-

لە ئێمە واتە - یاریدەدەرەکان - گەورەیەك و ، لە ئێوە واتە - کۆچکردووەکان - گەورەیەك ، واتە دەسەڵات دەکەین بە دوو بەشی یەکسان لە نێوان ئێمەو ئێوە ، ئەم کارەش نە بەش بردنە نە خۆپەرستی‌یە

لەم کاتەدا (ئەبوبەکرو عومەر) و ئەوانی تر سەریان سوڕما لەم بارودۆخە ئاڵۆزە کەوا ئاسمانیان پڕ کردبوو لە هەوری ڕەش ئەمەش نیشانەیەك بوو بۆ هەڵکردنی ڕەشەبا

(ئەبوبەکرو عومەر) بە هێمنی و لەسەرخۆ قسەیان لەگەڵ کردن پاشان خەڵکەکە موبایەعەی ئەبوبەکری صدیق هاوڕێی بەوەفای پێغەمبەری خوایان کرد بۆ خەلیفەی موسڵمانان خوای گەورەش پاراستنی لەم هەنگاوە پشت شکێنە

هەروەك (حوبابی کوڕی مونـذر)یش موبایەعەی‌دا، ئینجا چۆن ئەم یاوەرە موبایەعە نادات کە بریتی‌یە بە بڕوادارێکی ئیمان چەسپاو کەوا ژیانی خۆی هەموو تەرخان کرد لە ڕێگای خوا ، لەم ڕۆژەی بوو بە موسڵمان ، بۆ بەرگری کردن لە ئایین و جیهاد کردن بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی یەکتاپەرستی ، بەم جۆرە گیانە ئیمانی‌یەکەی هەموو خووڕەوشتە نەزانی‌یە نەفامی‌یەکەی تواندەوە

کاتێك خەلافەتی (ئیمامی عومەر) - خوا لێی ڕازی بێت - گەیشتە نیوەی خەلافەت ، (حوبابی کوڕی مونـذر) کۆچی دوایی کرد ، بەم جۆرە پاش ئەم هەڵوێستەی لەژێر کەپری (بەنی ساعدە) نواندی هیچ گێروگرفتێك و تێکدانێك دروست نەبوو ، هەروەکو بڵێیت ئەم قسانەی کردی لە زمانی دەرچوو پاشان گوێی پێ‌نەدا ...

خودای گەورە لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا (حوبابی کوڕی مونـذر) ڕازی بێ و بیخاتە بەهەشتی پان و بەرینی خۆیەوە ، ئێمەش لەگەڵ ئەم زاتە پیرۆزانە حەشر بکات .

٥١

# عبداللّەی کوڕی عەبـــاس

# زانـــای ئەم ئوممەتە

٥١

# عبداللەی کوڕی عەباس
# زانـــای ئەم ئومـمەتـــــــــــە

ئیبن عەباس لەوە بە (عبداللّەی کوڕی زوبەیر) دەچێ کە هەر بە منداڵی‌یەوە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووە ، بەر لەوەی (ئیبن عەبباس) قایم بێ و بێتە تەمەنی پیاوان پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، لەگەڵ ئەمەشدا هەر زوو لە قۆناغی منداڵیدا هەموو سیفەتەکانی پیاوان و بیروباوەڕی ژیانی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆی نزیك دەکردەوە فێری زانستی پوخت و پەروەردەی دەکرد ، (ئیبن عەبباس) بەهۆی بیروباوەڕی بەهێزی و خوڕەووشت بەرزی و عیلم و زانیاری زۆری پلەوپایەیەکی بەرزی هەبووە لە نێو پیاوانی دەوروبەری پێغەمبەری خوا ﷺ کوڕی عەبباسە مامی پێغەمبەری خوا ﷺ نازناوی ( حبر هذة الامة) واتە :- زانای ئەم ئوممەتە . لەبەر زیرەکی و فراوانی عیلم و زانستی ئەو ناوەی لێنرا ، هەر لە منداڵی‌یەوە ڕێگای ژیانی خۆی ناسیوە و هەوڵی داوە کە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر فێربێ بە تایبەت خۆی دەدی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆی نزیك دەکاتەو دەستی پیرۆزی لەشانی دەداو دوعای بۆ دەکاو دەفەرموێ :-

( ئەی خوایە زانستی ئاین و تەفسیری فێر بکە) ، ئینجا لە زۆر بۆنەو موناسەبەدا هەر هەمان دوعای بۆ دووبارە دەرکردەوە ، ئەو کات (ئیبن عەبباس) تێگەیی کەخوا بۆ زانست و زانیاری دروستی کردووە ، ئامادەیی و لێهاتوویی خۆی زیاتر پاڵی دەنا بۆ ئەو ڕێگایە ، هەرچەندە کە لەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد تەمەنی‌لە (سێزدە) ساڵ تێپەری بوو کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژێکی لە ژیانی منداڵیدا بەفیڕۆ نەداوە ، هیچ ڕۆژێکی بەسەر تێپەڕ نەبووە کە بەشداری کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکردبێ ، هەرچی بفەرمووبایە لەبەری دەکرد لە دوای کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی دەدا لە هاوڕێکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شتانە وەرگرێ کە خۆی نەیتوانیوە ڕاستەوخۆ لێی وەربگری ، هە رکە بیزانی‌بایە یەکێك زانستەکی لایە یان فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەزانێ خێرا دەچووە لای لێی فێر دەبوو و وەری دەگرت ، بەهۆشمەندی خۆشی هەر شتێکی وەرگرتبایە جوان لێی دەکۆڵیەوەو دەیپشکنی ، هەر ئەوە نەبوو کە عیلم و زانیاری وەربگرێ و بەس ، بەڵکو لە هەمان کاتدا بژاری دەکردو لێی دەکۆڵیەوەو دەگەڕاوە سەر سەرچاوەکانی خۆی ، دەربارەی خۆی دەڵێ :-

(لەبارەی یەك مەسەلە پرسیارم لە سی کەس لە یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد) نموونەیەك لەم بارەوە باس دەکاو دەڵێ :-

( كه پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كرد بە لاوێكی ئەنصاریم گوت :- ئەمڕۆ هاوڕێكانی پێغەمبەری خوا ﷺ ژمارەیان زۆرن وەرە با بچین پرسیاریان لێبكەین ) ووتی :-

ئەی (ئیبن عەبباس) من سەیرم بە تۆ دێ !! تۆ وا تێدەگەی ئەو خەڵكە پێویستی‌یان بەتۆیە ، وا بەخۆت دەبینی چەند یارو یاوەری پێغەمبەری خوایان ﷺ لە ناوە ) ؟

( ئەو وازی دەهێنا ، منیش بەخۆم دەچوومە لای هاوڕێكانی پرسیارم لێ‌دەكردن ، ئەگەر بم زانیبایە یەكێك فەرموودەیەكی پێغەمبەر ﷺ دەزانێ كاتی نیوەڕۆ دەچووم ، وا دەبوو ئەویش نووستبوو ، جلەكانی خۆم دەكردە سەرین و لەبەر دەرگاكەیان لەژێر سەری خۆم دادەناو درێژ دەبووم ، وا دەبوو گەردەلوول و با هەموو لەشمی دەكردە تۆزوخۆڵ هەر چاوەڕوانم دەكرد تا ئەو لە قەیلوولە هەڵدەستاو دەهاتە دەرەوە ، ئینجا منی دەبینی و دەیگوت :- ئەی كوڕە مامی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوا خێرە هاتووی ؟؟ بۆچی بە دوات نەدەناردم بەخۆم دەهاتم ؟ منیش دەمگوت :- نا ، هەق وایە كە من بێمە خزمەت تۆ ، ئینجا دەربارەی فەرموودەكە پرسیارم لێ‌دەكردو لێ‌ی فێر دەبووم !!

بەم چەشنە ئەم لاوە مەزنە پرسیاری دەكردو پرسیاری دەكردو پرسیاری دەكرد ، پاشان بە بیری تیژی خۆی لێ‌ی دەكۆڵیەوە گفتوگۆی لەسەردەكرد ، ڕۆژ بە ڕۆژ داناترو لێهاتوو تر دەبوو، گەشەی دەكردو زانستی زۆرتر دەبوو ، بە جۆرێك لە تەمەنی گەنجێتی‌دا سیفات و دانایی و گرانی پیاوی بەساڵاچووی لێ دەهاتە دی لە پایەك دابوو كە (عومەری كوڕی خەتتاب) -خوا لێ‌ی ڕازی بێت - لە هەموو ئیش و كارێكی گرنگ پرس و ڕای پێ دەكردو ڕاوێژی پێ‌دەكردو نازناوی (لاوی پیران)ی لێنابوو !!

ڕۆژێك پرسیاری لێكرا :- ئەو زانست و زانیاری‌یەت چۆن وەرگرتووە ؟

وەڵامی دایەوە :- ( بە زوبانێكی بە پرسەو بە بیرێكی هۆشمەند) ، هەردەم بە زوبان پرسیاری دەكرد و بە بیروهۆشیشی لێ‌ی دەكۆڵیەوەو گفتوگۆی لەسەر دەكرد ، بەم پێ‌یە بە هۆی بێ‌فیزی و خوورەوشت بەرزی بووە ( زانای ئەو ئوممەتە) ، سەعدی كوڕی ئەبی وەققاس بەم ووشانە وەسفی دەكاو دەڵێ :-

( كەسم نەبینیوە لە (ئیبن عەبباس) خێرا تێگەیی ترو، عەقل گەورەترو ، زانستی زیاترو هێمن و لەسەرخۆ تر بێت) ، (دەمبینی ئیمامی عومەر - خوا لێ‌ی ڕازی بێت -بۆ كارەكانی بانگی دەكرد ، وە لە كاتێك دەوری پڕ بوو لە بەشداربووانی غەززای بەدر لە كۆچكەران و پشتیوانان (ئیبن عەبباس) قسەی دەكردو دەدوا عومەریش قسەی لە قسەی نەدەكرد ، (عبیداللەی كوڕی عوتبە)ش دەربارەی دەڵێ :-

( كەسم نەبینیوە كە لە شتی ڕابردوو لە فەرموودەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ لە (ئیبن عەبباس) زاناتر بێ و تێگەیشتوو تر بێ لە پرس و ڕا) ( وە كەسم نەبینیوە كە لە شیعرو ئەدەبی عەرەبی و تەفسیری قورئان و حیساب و میرات لەو زاناتر بێت)

ڕۆژێك دادەنیشت بۆ فیقه ، ڕۆژێك بۆ تەفسیر ، ڕۆژێك بۆ غەزاكان ، ڕۆژێك بۆ شیعر ، وە ڕۆژێكیش بۆ ڕۆژانی عەرەب و هەواڵەكانیان ، وە هیچ كەسم نەبینیوە كە بچێتە لای و دابنیشێ و دانی پێ‌نەنێ و مل بۆ زانست و زانیاری‌یەكی كەچ نەكا)

لەو کاتەی (ئیبن عەبباس) لە سەردەمی (ئیمام عەلی) – خوا لێی ڕازی بێت – والی بەسرا بوو ، یەکێك لە موسڵمانانی ئەو شارە وەسفی (ئیبن عەبباس) دەکاو دەڵێ :–

(ئیبن عەبباس) سێ شتی گرتبوو ، سێ شتی واز لێهێنابوو ، ئەوانەی گرتبوونی :– کە پیاوان دەدوان هۆشی وەردەگرت ، کە قسەی بۆ کرابا جوان گوێی بۆ دەگرت ، لە نێوان دووکار گەر جیاوازی لەسەر با ئاسانترین یانی هەڵدەبژارد . وە ئەوانەی کەوازیشی لێهێنابوون :– وازی هێنابوو لە دەمەقاڵێ ، هاوڕێیەتی پیسکەو ناکەس بەچە ، شتێ کە پاکانەی بۆ بکردایا و عوزری بۆ بهێنراباوە

لەبەرئەوە ئەم سیفەتە جوانانەو فراوانی زانستو زانیاری ، زانایانو خەڵك لە جۆرەها وولاتی ئیسلام دەهاتنە لای بۆ ئەوەی گوێی لێبگرنو لێی فێربن ، یەکێك لەهاوڕێکانی سەردەمی خۆی دەربارەی دەڵێ :– ( بینیم خەڵك لەبەردەم دەرگای ماڵی (ئیبن عەبباس) وەستاونو خەریکە ڕێگا بگیرێ ، کەس توانای هاتوچۆی نەمابوو ، چوومە لای پێم گوت :– خەڵك لەبەردەم دەرگاتان ئەوە حاڵیانە :– پێی گوتم :–

ڕاوەستە هەتا دەست نوێژێك هەڵدەگرم ، دەست نوێژی هەڵگرتو گوتی:– بڕۆ لایان ، بانگی ئەوانەم بۆ بکە کە پرسیاری قورئانو تەفسیریان هەیە ، چوومە دەرەوە بانگم کردن ، هەر هاتن تا ماڵیان پڕ کرد ، جا ئینجا پێی گوتم :– ماوەی براکانتان بدەن ، ئینجا دەرچوون ، بۆ ئەوەی ماوەی ئەوانی تر بدەن ، پاشان پێی گوتم :– بڕۆ بزانە کێ پرسیاری دەربارەی حەڵاڵو حەرام هەیە ، بانگیان بکە دەرچووم بانگم کردن ، دەستیان پێکرد هەر هاتنە ژوورەوە تا ماڵیان پڕ کرد ، پرسیاری هەر شتێکیان دەکرد وەڵامی دەدانەوەو زیاتری فێردەکردن ، ئینجا پێی گوتم :– بانگی ئەوانە بکە کە پرسیاری عەرەبیو شیعریان هەیە ، بانگم کردن هاتنە ژوورەوە هەتا ماڵ پڕ بوو ، پرسیاری هەر شتێکیان دەکرد وەڵامی دەدانەوەو زیاتری فێردەکردن

(ئیبن عەبباس) خاوەن زانستو بیرێکی وابوو نەك تەنها بەرامبەرەکەی دەگەیاندە قەناعەت بەڵکو بە ڕەوانبێژیو زیرەکی خۆی دڵیشیخۆش دەکردو ئینجا بەڕێی دەکرد. لەگەڵ ئەو هەموو عیلمو زانستەی هەیبوو هیچ گفتوگۆیەکی بۆ ئەوە نەدەکرد کە بەسەر بەرامبەرەکەی زاڵ ببێ ، بەڵکو بۆ ئەوەی بوو کە بیگەیەنێتە قەناعەتو حەقیقەتی بۆ ڕوون بکاتەوە

خەوارجەکان زۆر لە قسە هەقەکانی دەترسان ، ڕۆژێکیان (ئیمام عەلی) ئیبن عەبباسی نارده لایان ، ووتووێژو گفتوگۆیەکی زۆر ڕێكوپێك لەنێوان ئەموئەوان دەستی پێکرد ، (ئیبن عەبباس) قسەی زۆر جوانو بەڵگە وای بۆ دەهێنان کەهۆشمەندانی سەرسام دەکرد ، لەو گفتوگۆیە دوورو درێژە تەنها ئەو بڕگەیەمان بەسە :–

(ئیبن عەبباس) پرسیاری لێکردن :– ئێوە ڕەخنەتان چییە لە (ئیمام عەلی) ؟؟

گوتیان :– ئێمە سێ ڕەخنەمان هەیە لێی

<u>یەکەمیان</u> :– پیاوانی کردە ناوبژیوان لە دینی خوا ، خواش دەفەرموێ :–

﴿ ان الحـــكم الا للّــــــه ﴾

واتە :– حوکم نییە مەگەر بۆ خوا

دووەمیان :- کوشتیاری کردووە ئینجا لە جەنگاوەرانی لایەنی دی نە دیلی گرتووەو نـە دەسـت کەوتیشـی هێنـاوە ، ئەگـەر ئـەوان بێبـاوەڕن ، ئـەوا بێگومـان مـاڵو سامانیان حەڵاڵە ، ئەگەر باوەڕداریش بن ئەوا خوێنیان حەرامە !!
سـێیەمیان :- لەناوبژیوانییەکـەدا.بـەوە قـایل بـوو کـە وازبێنـێ لـە پێشـەوایەتی باوەڕداران بۆ ڕازی کردنی دوژمنانی ، ئەگەر پێشەوای باوەڕداران نەبێ ئەوا پێشەوای بێباوەڕانە

(ئیبن عەبباس) دەستی پێکرد بە پووچەڵ کردنەوەی ئارەزووەکانیان و گوتی :-
هەرچی ئەوەیە کە دەڵێن :- پیاوانی کردووە بە ناوبژیکار لە دینی خوا ، لەبەر چی ئەوە کارێکی خراپە ؟ خوای گەورە دەفەرموێت :-
﴿ يا أيها الذّين آمنوا لاتقتلوا الصيد وأنتم حرم ، ومن قتله منكم متعمدا فجـــزاءه مثل ما قتل من النعم يحكم به ذوا عدل منكم ﴾
بۆ خوا پێم بڵێن : ئایا ناوبژیوانی پیاوان لـە ڕاگرتنـی خوێـن ڕشـتنی موسـڵمانان چاکترە یاخود ناوبژیوانیان بۆ کەروێشکێك کە نرخەکەی چارەگە درهەمێکە ؟!! سـەرانی خەوارج نەیانتوانی بەرامبەر ئەو قسە بەهێزو بەڵگەدارانە هیچ قسەیەك بکەن ، زانای ئوممەت بەردەوام بوو گوتی :- هەرچی ئەوەیە کە دەڵێن : - کوشتاری کردووە ئینجا نەدیلی گرتووەو نەدەست کەوتیشی هێناوە ، ئایا ئێوە دەتانەوێ عائیشـەی خـێزانی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دایکـی ئیمـانداران بـەدیل بگـرێ و یەخسـیری بکـاو ولاخو کەلوپەلیشی بکاتە دەسکەوت ؟ !
لەشەرمان ڕووخساریان زەردبوو بە دەست بەری ڕووی خۆیان دەگرت
(ئیبن عەبباس) چووە سەر خاڵی سێیەم :-
هـەرچی ئەوەشـە کـە دەڵێـن قـایل بـوو بـەوە کـە دەسـت هـەڵگری لـە پێشـەوایەتی تـا نـاوبژیوانی تـەواو دەبـێ ، گـوێ بگـرن لـەوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژی حودەیبیـە چیکرد لە کاتی نووسینی پەیمانەکە پێغەمبەری خوا ﷺ بە نووسەرەکەی گوت :- بنووسە ئەوە ئەو پەیمانەیە کە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ و سوهەیلی کوڕی عامر لەسەری پێك هاتن .
سوهەیل گوتی :- بەخوا ئەگەر شایەدیم بدایە کە پێغەمبەری خوایت جەنگو هەرام لەگەڵ نەدەکردی و ڕێمان لێ نەدەگرتی کە سەردانی ماڵی خوا بکەی !
جا بنوسە : ئەمە ئەو پەیمانەیە کە موحەممەدی کوڕی عبداللە و سوهەیلی کوڕی عمر لەسەری ڕێك کەوتن ، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی گوتن : بەخوا من هەر پێغەمبەری خوام ئەگەر ئێوەش باوەڕ نەکەن ، پاشان بـە نووسـەرەکەی گـوت : چـۆن دەڵێـن ئـاوا بنووسە ، بنووسە :- ئەمە ئەو پەیمانەیە کە موحەممەدی کوڕی عبداللە و سـوهەیلی کوڕی عمر لەسەری ڕێك کەوتن
بەم شێوە جوانە گفتوگۆ لە نێوان (ئیبن عـەبباس) و خەوارجـەکان بـەردەوام بـوو ، هێشتا دەمەقاڵێ و گفتوگۆ تەواو نەبووبوو کە بیست هەزار کەس هەڵسانەوە قەناعەتیان

بــه قســهكانى (ئيــبن عــهبباس) هاتوڕايانگــهياند كــهچى دى دژايــهتى (ئيمــام عەلـى) نەكەن !!

(ئيبن عەبباس) هەر تەنها خاوەنى ئەو سامانە گەورەيە نەبوو لە عيلمو زانست بەڵكو سـامانێكى گــهورەترى هــهبوو لــه خوورەوشــتو ئــهدەبى زانســتو زانايــان وەلــه سەخاوەتيشدا كەم وێنە بووو ، هــهروەك چۆن زانستى دەبەخشى سامانيشى بەهەمان شێوە دەبەخشى ، هاوسەردەمانى دەربارەى دەڵێن :-

(( هيچ ماڵكێمان نەديتووە كە خۆراكو خواردنەوەو ميوەهاتو عيلمو زانستيان لە ماڵى (ئيبن عەبباس) زياتر بێ)) .

دڵ پاكو دەروون خاوێن بووە ڕقوقينى لـه هيـچ كـهس هەڵنـەگرتووە ، ئـەو هيـواو ئاواتەى كە هەيبوو لـێى تێر نەبوو ئەوەبوو : هـەردەم حەزى لە چاكەو خێر بوو بـۆ هەموو ئەو كەسانەى كە دەياننناسىو ئەوانەى نەيانىدەناسى دەربارەى خۆى دەڵێت :-

( من گوێم لـێدەبێ كە دادوەرێك لـه دادوەرانـى موسڵمانان بە عەدالـەت و دادگـەرى حوكم دەكا دڵم پێ خۆش دەبێ و دوعاى بۆ دەكەم كە هيچ كارێكيشم لاى نىيە !! وە كە دەبيستم باران دەبارێتە سەر خاكێكى موسڵمانان كەيف خۆش دەبم كە هيچ ئاژەڵێكيشم لەوێ نىيە بلەوەڕێ !!

عابيدێكى لەخواترس بووە ، شەو نوێژى دەكردو ڕۆژيش بەڕۆژوو دەبوو كوڵمـەكانى شوێنەوارى فرمێسكى لەسـەرديار بـووە كە نوێـژى دەكـرد يـا قورئـانى دەخوێنـد زۆر دەگريا ، كە دەگەيشتە ئايەتەكانى ترسێنەرو بەهەڕەشەو باسى مردن و زيندووبوونـەوە دەنگى گريـانى بەرزدەبووەوە ، لـە هـەمان كـاتدا ئـازاو دەسـت پـاكو هۆشمـەند بـوو ، بيروبۆچوونـەكانى دەربـارەى كێشـەى (ئيمـام عەلـى) و (معاويـە) ئـەوە دەگەيـەنێ كـە زۆر زيرەكو زاناو داناو بليمەت بووە ، ئاشتى و نەرمىو ووتوويێژى لە پێش شەڕو توندى و هێز دادەنا ، كـاتێك حوسـەين - خـوا لـێى ڕ ازىبـێت - ويسـتى بچـێتـە عـيراق بـۆ ئـەوەى دژى زيـادو يـەزيد شـەڕ بكـا ، (ئيـبن عـەبباس) خـۆى پێهەڵواسـىو خۆزيـاى مردنـى دەكـرد ، زۆر هـەوڵىدا كـە نـەچێ ، پاشـان كـە هـەواڵى شـەهيدبوونىزانى زۆر خەمباربوو ، لە ماڵ دەرنەدەچوو لە گشت كێشەو ناكۆكىيەكانى نێوان موسڵمانان تەنها هەڵگرى ئاڵاى ئاشتىو لێك گەيشتن ونەرمى بوو ، ڕاستە بەشدارى شـەڕى نێـوان (ئيمـام عەلـى) و (معاويـە)ى كردووە ، بەڵام هـەر بۆ ئـەوەبوو كە بزووتنەوەيـەكى جيـابووەوەى ترسناك كە هەڕەشەى لە يەكێتى دينو و يەكێتى موسڵمانان دەكرد تەمێ بكرێ .

لە كۆتايى ژيانيدا چاوەكانى كوێر بوون ، لە شارى مەككە لە دايك بوو بەڵام لە تائيف لە تەمەنى حەفتاو يەك ساڵيدا كۆچى دوايىكرد

* * *

٥٢

# بیلال کوڕی ڕەباح

## گاڵتەکار بە ڕووداوە سەختەکان

## ٥٢

# بیلال کوڕی ڕەباح
# گاڵتەکار بە ڕووداوە سەختەکان

کاتێك ناوی (ئەبوبەکری صدیق) بهاتبایە (عومەری کوری خەتتاب) دەیگووت :-

( ئەبوبەکر سەروەرمانەو ، سەروەری ئێمەی ئازاد کرد) کە مەبەستی بیلال بوو ، هەڵبەتە پیاوێك (ئیمامی عومەر) نازناوی (سەروەرمانی لێبنێ ئەوا ئەو کەسە پیاوێکی مەزن و بەهرەدارە ... کەچی ئەو پیاوە رەشە ، لەڕولاوازە ، بەژن درێژە ، بەموو ، پیش تەنکە - هەروەکو بەم جۆرە وەسف کراوە - کە دەیبیست مەدح وستایشی ئەو دەکریّ و بەسەریدا دەگوترێ ، سەری دادەنواندو چاوی دادەگرت و فرمێسك بە سەر کولمەی دەهاتە خوارەوەو دەیگوت : (( من تەنها پیاوێکی حەبەشیم ، دوێنێ بەندە بووم )) ، جا ئەو حەبەشی یەی کە دوێنێ بەندە بوو کێیە ؟؟ بێگومان ئەو کەسە (بیلالی کوری رەباح)ە بانگدەری ئیسلام ، تۆقێنەری بتان ، یەکێك بوو لە موعجزاتی باوەڕی و ڕاستی ، یەکێك بوو لە موعجیزاتی ئیسلامی مەزن

لەو کاتەی ئیسلام دەستی پێکردووە هەتا ئەمڕۆ ، و تا ئەو کاتەی خوا حەز بکا چاومان بە هەر (دە) کەس بکەوێ بەلایەنی کەمەوە (حەوت) کەسیان بیلال دەناسن واتە سەدان ملیۆن کەس هەن بە درێژایی سەدەکان و نەوەکان کە بیلال یان ناسیوەو ناویان لەبەر بووەو ڕۆڵی ئەویان زانیوە ، بە تەواوی هەروەکو چۆن هەردوو مەزنترین خەلیفەی ئیسلام (ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتتاب)یان ناسیوە .

تۆ کە پرسیار لە هەر دەکەس بکەی کە هێشتا لە قۆناغی سەرەتایی دابن لە (مصر یان پاکستان یان مەلایۆ یان چین یان هەردوو ئەمریکا و ئەورویا و روسیاو عێراق و سوریا و تورکیا و ئێران و سوودان یان لە تونس و جەزائیرو مەغریب و لەناوجەرگەی ئەفریقیا و لە سەرووی بەرزایی یەکانی ئاسیا ، لە هەموو پارچەیەکی زەوی کە موسڵمانی تیا بن و ، نیشتەجێ بووبن ، دەتوانی پرسیار لە هەر ڕۆڵەیەکی ئیسلام بکەی کە (بیلال) کێیە ؟ وەڵامت دەداتەوەی :-

(بیلال) بانگدەری پێغەمبەرە ﷺ

(بیلال) ئەو بەندە بوو کە گەورەکەی بەگاشە بەردی سوورکراوە ئازاری دەدا تاکو لە ئایینەکەی پەشیمان بکاتەوە ، ئەویش هەر دەیگوت :- ( أحد ، أحد) کاتێك دەبینی کە ئیسلام ئەو نەمرییەی داوەتە (بیلال) دەبێ ئەوەش بزانی کە ئەو بیلالە لە پێش ئیسلام لە بەندەیەکی کۆیلە زیاتر نەبوو ، ئەگەر ئیسلام نەبوایە حەتمەن وەك بەندەیەکی سەرگەردان و سەرلێشێواو لەناو کۆمەڵ دەمایەوە ، تا مردن لاپەڕەکانی ژیانی لوول دەداو دەیخستە ناو قووڵایی یەکانی مێژوویەکی لەیادچوو ، بەڵام ڕاستی باوەڕی خۆی و

مەزنی و گەورەیی ئەو دینەی کە باوەڕی پێهێنا ، لە ژیانی و لە مێژووی‌دا لە پایەو شوێنێکی بەرزیان دانا لە نێو پیاوە مەزنەکانی ئیسلام .

بێگومان زۆر لە پیاوە بەرزو پایەدارو خاوەن سامانەکان دە یەکی ئەو نەمری‌یەیان بە دەست نەهێناوە کە (بیلالی حەبەشی) بە دەستی هێناوە بگرە زۆر لە پاڵەوانانی مێژوو بەشێك لەو ناوبانگی‌یە مێژوویی‌یەیان بە بەدەست نەهێناوە کە (بیلال) بە دەستی هێناوە .

لە ڕاستی‌دا ڕەش پێشتی (بیلال)و نزمی پایەو نەژادی‌و بێنرخی ئەو لە لای خەڵك وەك بەندەیەکی کۆیلە لەو پلەوپایە بەرزەی بێبەش نەکرد کە ڕاستی خۆی بۆی دانا لەو کاتەی ئیسلامی هەڵبژارد بە ئایین ، ئەوانە گشتی لە تەرازووی هەڵسەنگاندن‌و ڕێز بۆ دانانی ئەو هیچ کێش‌وبەهایەکی نەبووە ، تەنها کێشی سەرسوڕمان نەبێ ، کاتێك مەزنی لە غەیری شوێنی خۆی دادەنرێ ، خەڵکان وایان دەزانی بەندەیەکی وەك (بیلال) دەگەڕێتەوە بۆ بنەچەیەکی بیانی ، بێکەس‌وکارە ، پشت‌و هێزی نی‌یە لە ژیان موڵکی گەورەی خۆیەتی کە بە پارەی خۆی کڕیوەتی ، بەیانی تا ئێوارە لەناو مەڕوماڵات‌و ئاژەڵدایە بۆ گەورەکەی ، وا تێدەگەیشتن ئەو جۆرە کەسە لەوەدانی‌یە کە توانای هیچ شتێکی هەبێ‌و شایەنی ئەوە نی‌یە کە ببێتە هیچ

پاشان بە پێچەوانەی هەموو بیروبۆچوونەکان ، دەتوانێ ببێتە خاوەن بیروباوەڕێك کەم کەس بگاتە ئەو ، توانی ببێتە یەکەم بانگدەری پێغەمبەرو ئیسلام کە کەسێکی تر نەیتوانی ئەو کارەی کە هەموو پیاوانی قورەیش لەوانەی بوونە موسڵمان و شوێن کەوتەی پێغەمبەر خۆزگەیان بۆ دەخواست ، بەڵێ(بیلال کوڕی ڕەباحە) پیاوێکی حەبەشی‌یە لە دایکێکی ڕەشە ، قەدەر کردیە بەندەی کەسانێك لە کوڕانی جومەح لە مەککە کە دایکی یەکێك بوو لە کەنیزەکانی ئەوان ، ژیانێکی هەروا سادەو ساکار بوو ڕۆژەکانی ئاوا بە دەردەسەری بەسەر دەبرد ، ئەو کاتە هیچ مافێکی نەبوو ، هیچ ئومێدو ئاواتیشی بە بەیانی نەبوو ، هەواڵەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ بیست کاتێك خەڵك لە مەککە بۆ یەکیان دەگێڕایەوە و گەورەکان‌و میوانەکانیشیان باسیان دەکرد ، بە تایبەتی لە (ئومەییەی کوڕی خەلەف)ی زیاتر دەبیست ئەو ئومەییەی کە یەکێك بوو لە کوڕانی جومەح و هەروەها گەورەی بیلالیش بوو ، زۆرجار گوێی لە ئومەییە دەبوو کە لەگەڵ هاوڕێکانی‌و تیرەی خۆی باسی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد ئومەییە زۆر پێ پەست دەبوو خەم‌و پەژارە دای دەگرت ، (بیلال) لە نێو قسە پڕ لە قینەکانی ووشەی شێتی دەبیست ، ئەو سیفەتانەی دەبیست کە وێنەی ئەو دینە نوێ‌یەی دەخستە بیروهۆشی ، هەستی دەکرد ئەو سیفەتانە لەو شوێنەدا کەتیای دەژی تازەن ، هەروەکو لەنێو قسە پڕ هەڕەشەو گوڕەشەکانیشیان دا ئەوەشی دەبیست کە دانیان بە پایەو ڕاستگۆیی‌و دەستپاکیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەهێنا ، بەڵێ (بیلال) دەیبیست کە چۆن سەری‌ان سوڕماوەو سەریان لێ شێواوە لەو بەرنامەی کە موحەممەد ﷺ هێناویەتی ،

هەندێکیان بە هەندێکی تریان دەگوت :- هەرچەندە چاریشمان نی‌یە هەر دەبێ بەم شتانە لەکەداری بکەین ، تاکو ڕێگە بگرین لەو کەسانەی کە پەلە دەکەن بۆ ناو ئایینەکەی

گوێی لێ‌بوو باسی دەستپاکیی‌و وەفاداری‌یان دەکرد ، باسی پیاوەتی‌و خوورەوشتیان دەکرد باسی پاکی‌و هۆشمەندی‌یان دەکرد ، بە نهێنی باسی ئەو هۆیانەیان دەکرد کە وایان لێ‌دەکا زۆرانبازی‌و دوژمنایەتی بکەن ، هۆیەکانیش ئەمانە بوون :-

یەکەم :- پاڵپشت‌و دەست بەرنەدان لە ئایینی باب‌وباپیران

دووەم :- ترسی نەمانی پلەوپایەی قورەیش ئەو پلەو پایەیەی کە شوێن‌و مەنزڵە ئایینی‌یەکە پێی دابوون وەك پایتەختێك بۆ عیبادەت‌و خواپەرستی لە سەرجەم دوورگەی عەرەب ، پاشان ئەو ڕق‌وقینەی کە لەگەڵ بنەماڵەی هاشم هەیان بوو ، پێیان ناخۆش بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبنەماڵەی هاشمە و لە بنەماڵەی ئەوان نی‌یە !

ڕۆژێکیان (بیلال) ڕووناکی خوا دەبینی‌و لە کانگای دڵی پاکیەوە گوێی لە دەنگەکە دەبێ ، ئینجا دەچێتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺو باوەڕ دەهێنێت‌و موسڵمان دەبێت ، زۆر نابات هەواڵی موسڵمان بوونی بڵاودەبێتەوە ، گەورەکانی لە کوڕانی‌جومەح دونیایان بەسەر دا تاریك دەبێ‌و سەریان سوڕ دەمێنێ ، ئەو سەرانەی کە پڕ بووبوون لە لووت بەرزی‌و خۆ بەزل زانین !! شەیتانەکان دەچنە سەر سینگی (ئومەییەی کوڕی‌خەلەف) موسڵمان بوونی یەکێك لە بەندەکانیان بە بێ‌دەسەڵاتی‌یەك دەبینی کە هەموویانی دابەزاندن‌و کەمی کردنەوە و پێی ڕیسواو شەرمەزار دەبن ، بەندە حەبەشی‌یەکەیان دەبێتە موسڵمان و شوێن کەوتەی موحەممەد !

ئومەییە لە دڵی خۆیدا دەڵێ :- لەگەڵ ئەوەش خراپ نی‌یە ، خۆری ئەمڕۆ ئاوا نابێ مەگەر بە موسڵمان بوونی ئەو بەندە دەرچووە نەبێ !! خۆری ئەمڕۆ تەنها بە موسڵمان بوونی (بیلال) ئاوا نابێ ، بەڵکو ڕۆژێك دێ ئاوا دەبێ بەسەر هەموو بتەکانی قورەیش‌و پارێزەرانیان ، هەرچی بیلالیش بوو هەڵوێستێکی وای هەبوو نەك هەر بۆ ئیسلام سەر بڵندی بوو - هەر چەندە هەر شایەنی ئیسلامیشە - بەڵکو سەربڵندی بوو بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی ، خۆی گرت بەرامبەر جۆرەها ئەشکەنجەو ئازار بە وێنی خۆڕاگری پیاوچاکانی مەزن ، هەروەکو خوای گەورە کردی بە نموونە ، کە ڕەش پێستی‌و کۆیلەو بەندایەتی کار لە گەورەیی گیان ناکەن کاتێك بیروباوەڕی تێدا بەدی‌کراو پشتی بەخوا بەست‌و خۆی بە پاراستنی هەقەکانی خوا گرت .

(بیلال) وانەیەکی کاریگەری بەخشی‌یە هاوسەردەمی و هەموو سەردەمێك بۆ ئەوانەی لە ڕێبازی ئەون ، وانەیەك ناوەڕۆکەکەی ئەوەیە :-

که سەربەستی دەروون و گەورەی نەفس نافرۆشرێ بە قەد زەوی سامانی بدەنێ ، یا ئەشکەنجەو ئازاری بدەن ، بێگومان (بیلال) بە ڕووتی خستیانە ناو پشکۆی ئاگر تا لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە یان بیروباوەڕی بگۆڕێ بەڵام نەگۆڕا !

پێغەمبەری خوا ﷺ و ئیسلام وایان لەو بەندە حەبەشییە زەحمەتکێشە کرد کە ببێتە مامۆستای گشت مرۆڤایەتی لە بارەی هونەری ڕێزگرتن لە دەروون و بەرگری لە ئازادی و سەربەخۆیی ، لە گەرمترین کاتی نیوەڕۆ لەو کاتەی بیابان دەبوو بە دۆزەخێکی کوشندە دەیان هێنایە دەرەوە ئینجا بە ڕووتی فڕێیان دەدایە سەر بەردی سوورکراوە ، پاشان بەردێکی سوورکراوەی زۆر گەرمیان دەهێنا کە بە کۆمەڵە پیاوێك هەڵیان دەگرت و دەیانخستە سەر سینگی و لەشی ، ئەو ئازارە دڕندانەیە هەموو ڕۆژێك دووبارە دەبوویەوە ، تاکو لەبەر توندی ئەو ئەشکەنجەو ئازارە دڵی هەندێکیان نەرم بوو لە دواجار پێیان دەگوت :- ئەگەر تەنها یەکجاریش ناوی خواکانمان بە باشە بهێنی ئەوا وازت لێدەهێنین ، تا ئابڕووی لووت بەرزییان نەتکێ و قوڕەیش باسی ئەوە نەکا کە ئەوان بەرامبەر خۆڕاگری بەندەیەکی خۆیان بە ڕیسوایی و زەبوونی بەزین ، تەنانەت ئەو تاکە وشەیەی نەگوت کە دەیتوانی بە دڵ نەیڵێ و ژیانی خۆی پێ بکڕێتەوەو بێ ئەوەی ئیمان و باوەڕی پێ بچێ و واز لە قەناعەتی‌خۆی بێنێ ، بەڵێ قایل نەبوو تەنها ئەو تاکە وشە سەرزارییەش بڵێ ! لە جیاتی ئەوە ئەو سرووده نەمرەی دەخوێندەوە (أحد ، أحد) داربەدەستەکانی زیاتر تووڕە دەکرد

هەروەها تکایان لێدەکردو، دەیانگوت :- ناوی لات و عوززا بێنە ، ئەویش وەڵامی دەدانەوە (أحد ، أحد) پێیان دەگوت :-

ئێمە چیمان گوت تۆش وەك ئێمە بڵێ و ، بەگەپ وگاڵتەیەکی سەرسووڕهێنەرەوە وەڵامی دەدانەوە دەیگوت : (بەڕاستی بە چاکی نایەتە سەر زمانم !! )

(بیلال) لەناو ئەو گەرمییە سەختەو بەرد لەسەر سینگە هەتا ئێوارە دەمایەوە ئینجا دواجار ڕاستیان دەکردەوە و پەتێکیان لە مل کردو منداڵەکانیشیان تێگەیاند کە لە دەوری چیاکانی مەککەو شەقامەکان بسوڕێننەوە بیلالیش تەنها سروودی پیرۆزی (احد ، احد ) لەسەر زمانی بوو ، ئینجا کە شەو دەهات قسەیان لەگەڵ دەکردو دەیان گوت : بەیانی‌قسەی باش و خێر دەربارەی خواکانمان بکە

بڵێ :- پەروەردگاری من لات و عوززایە ، تاوەکو ئێمە وازت لێبهێنین تۆش بە کەیفی خۆت بکەی ، بەڕاستی لە ئازاردانی تۆ بێزار بووین بە جۆرێك هەروەك ئەوە ئێمە ئازار بدرێن ، ئەویش سەری بادەداو دەیگوت :- ( أحد ، أحد ) ، ئومەییەی کوڕی خەلەفیش مستێکی لێدەداو لە داخوتوورەیی خۆی هاواری دەکرد :- ئەوە چ ڕەش بینی و بەدبەختییەکە بەسەر ئێمە هاتووە ئەی بەندەی خراپ ؟ سوێند بە لات وعوززا ، دەبێ بۆ گشت بەندەو گەورەکان بت کەم بە پەند وعیبرەت ، (بیلال)یش بە بیروباوەڕێکی

پتەوەوەو گەورەیی خواوە وەڵامی دەدایەوە ( أحـد ، أحـد ) ئینجا لەگەڵی دەگەڕایەوە سەر قسەو گفتوگۆ .

پاشان ئەو پیاوەی بەو کارە سپێردرابوو قسەی نەرمی لەگەڵ بکا دەیگووت :-

ئەی ئومەییە واز لە (بیلال) بێنە ، بە لاتو عوززا ، لەمەو دوا لە پاش ئەمڕۆ نابێ (بیلال) هیچی تر ئازار بدرێ ، (بیلال) لە ئێمەیەو ، دایکیشی کەنیزەیەکی خۆمانە بە موسڵمان بوونی ڕازی نابین قسەی قوڕەیشمان بێتە سەروگاڵتەمان پێ بکەن ، هەرچی بیلالە لە تەماشای ئەو درۆزنو تەڵەکەبازانە دەکاو زەردەخەنەیەکی وەك تیشکی بەیانی بەسەر لێوەکانی دادێو نیوەڕۆش نزیك دەبێتەوە ، (بیلال) دەگرن دەیبەنەوە بۆ بیابانی گەرم ، ئەویش هەر خۆڕاگرو خاوەن باوەڕو لەخۆبووردووە ، لەو کاتەی ئازاری دەدەن ئەبوبەکری صدیق دەچێتە لایان لەسەریان هاوار دەکا :-

( ئایا ئێوە پیاوێك دەکوژن کەبڵێ پەروەردگاری من هەر خوایە ؟ ) ئینجا بە ئومەییە دەڵێ :-

لە نرخی خۆی زیاترت دەدەمێو وازی لێ بهێنەو ئازادی بکە .

وەك ئەوە ئومەییە نقووم بێو بیلالیش بەلەمێ رزگاری بگاتێ ، کاتێ بیستی کە ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازی بێت - دەیەوێ لێی بکڕێتەوە زۆر دڵخۆش بوو ، هەرچەندە ئەوانیش بازرگان بوونو لە پەشیمان بوونەوەی بیلالیش نائومێد بووبوون ، زانیان فرۆشتنی بۆ ئەوان چاکترە لەوە کە بمرێ ، بۆیە فرۆشتیانە ئەو ئەبوبەکرەی کە یەکسەر ئازادی کرد

(بیلال) شوێنی خۆی گرت لەنێو پیاوانی ئازادو سەربەخۆ . لەوکاتەی ئەبوبەکری صدیق دەستی (بیلال)ی خستە بن هەنگڵی خۆیوگرتی بۆ ئەوەی بەرەو سەربەستی ببا ، ئومەییە پێی گوت :- بیگرە ، سوێند بە لاتوعوززا ئەگەر تەنها بەیەك هۆقەش بیکڕی هەر دەتفرۆشمێ ، ئەبوبەکر - خوا لێی ڕازی بێت - تێگەیشت کە چەند ڕەش بینو نائومێد بوون لێی وا چاکیش بوو بۆی کە وەڵامیان نەداوەتەوە ، بەڵام لەبەر ئەوەی (بیلال) تازە بووە برایو ئەو قسەی شکاندنەوەیە لەڕێزو حورمەتی بۆیە وەڵامی ئومەییەی داوەو گوتی :-

سوێند بەخوا ئەگەر داوای سەد هۆقەشتان بکردایە هەر دەمدا ! بەم جۆرە بیلالی بردە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و موژدەی ئازادی پێدا ، جەژنێکی گەورە بوو !

* * *

لە دوای کۆچکردنی پێغەمبەرو موسڵمانان بۆ مەدینە و نیشتەجێبوونیان ، پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ دەستووری بانگ دان دابنێ ، دەبێ ئەو کەسە کێ بێ کە ببێتە بانگدەر ڕۆژانە پێنج جار بانگ بدا ؟ دەنگی (اللّـه أكـبر)ی بە ئاسۆدا بڕوا ؟ ئەوە بیلالە ، ئەو (بیلال)ی کە ماوەی (١٣) ساڵ لە قۆناغی ئەشکەنجەو ئازار دابووو دەیگووت (أحـد ،

أحد) پێغەمبەری خوا ﷺ (بیلال)ی هەڵبژارد بۆ ئەوەی ببێتە یەکەم بانگدەری ئیسلام ، بە دەنگی زوڵاڵی دەستی پێکرد دڵەکانی پڕ لە ئیمان و باوەڕی دەکردو ترس و هەیبەتی بە گوێچکان دەدا لەو کاتەی بانگی دەدا :

( اللّه أكبر اللّه أكبر، اللّه أكبر اللّه أكبر ، أشهد أن لا اله الا اللّه ، أشهد أن لا اله الا اللّه ، أشهد أن محمد رسول اللّه ، أشهد أن محمد رسول اللّه ، حى على الصلاة ، حى على الصلاة ، حى على الفلاح ، حى على الفلاح ، اللّه أكبر اللّه أكبر ،لا اله الا اللّه )

شەڕو کوشتاری نێوان موسڵمانان و سوپای قورەیش دەست پێدەکا ، شەڕ هەڵدەگیرسێ و گەرم دەبێ (بیلال)یش تیایدا هەڵمەت دەبا و پەلاماریان دەدا ، لە یەکەم شەڕی ئیسلام غەزای بەدر ... ئەو غەزایەی کە پێغەمبەر تیایدا (أحد ، أحد) ی کردە دروشم ، ئەو غەزایەی کەتیایدا قورەیش هەموو گەورەکان و پاڵەوانەکانی لەدەست داو کوژران .

لەو شەڕەدا ئومەییە ویستی پاشەکشە بکا و بەشداری نەکا ، ئەو ئومەییەی کە گەورەی (بیلال) بوو کە بە ئەوپەڕی وەحشیەت و درندانە ئازاری دەدا ، ئەگەر لەبەر عوقبەی کوڕی ئەبی موعەیت نەبوایە کە هاوڕێی بوو لەو شەڕەدا پاشەکشەی دەکردو نەدەچوو کاتێ عوقبە زانی نیازی بەشداربوونی نییە بخووردانێکی بەدەستەوە گرت وچوو لەناو کۆمەڵی خۆی ڕووبەڕوو بخوردانێکی لەپێش داناو گوتی :- ئەی باوکی عەلی :- بەوە بۆن لەخۆ بدە تۆ لە ژنانی !!!

ئومەییە هاواری کرد و گوتی :- خوا ڕووت ڕەش بکا لەگەڵ خۆت و ئەوەی هێناوتە ، پاشان هیچ چاری نەما کە دەرنەچێ و بەشداری نەکا ، دەرچوو

قەدەر چ نهێنییەکی شاردۆتەوە ئاشکرای دەکا ؟ عوقبە گەورەترین هاندەری ئومەییە بوو بۆ ئازاردانی (بیلال)و موسڵمانە زەحمەتکێشەکان ، ئەمڕۆش عوقبە هەر خۆی لە خشتەی دەبا و بۆ غەزای بەدر دەریدەپەڕێنێ کە تیایدا دەکوژرێ ، هەروەکو عوقبە خۆشی هەر لە هەمان غەزا دەکوژرێ ، هەروەکو بینیمان ئومەییە لەم غەزایە پاشەکشەی کردبوو و لە دانیشتووەکان بوو ، ئەگەر لەبەر هاندانی عوقبە نەبوایە دەرنەدەچوو ، بەڵام خوا کاری خۆی دەباتە سەر ، با ئومەییەش دەرنەچێ ، ئەوەتا لە نێوان ئەو بەندە و بەندەکانی خوا حیساب و لێپرسینەوەیەکی کۆن هەیە ئێستاش کاتی باس کردنی هاتووە ، خوا نامرێ ، چی بکەی دێتەوە پێشت !! بێگومان قەدەر حەزدەکا گاڵتە بە ستەمکاران بکا ، ئەو عوقبەیەی کە ئومەییە گوێی بۆ هاندانی شل کرد و خێرا بە هەواو ئارەزووی ئەو ئازاری باوەڕدارانی بێتاوانی دەدا ، ئەوا هەر ئەوە بە پێش ئومەییە دەکەوێ بۆ فەوتانی ، بە دەستی کێ ؟

بەدەستی (بیلال) ، (بیلال) بەتەنیا !! هەر بەو دەستەی کە ئومەییە کەلەپچەو زنجیری کردبوو و ئەشکەنجەو ئازاری دەدا ، هەر ئەو دەستە خۆی وەعدو بەڵێنێکی هەیە کە

قەدەر كاتێكی زۆر باشی بۆ داناوە لەگەڵ یەكێك لە داربەدەستەكانی قورەیش كە بەزوڵم و زۆرداری موسڵمانانی زەبوون كرد بێگومان ئەوە بە تەواوی ڕوویدا

كاتێك شەڕو كوشتار لە نێوان هەردوولادا دەستی پێكرد ، موسڵمانان بە سروودی ( أحد ، أحد ) دەستیان پێكرد ، ئومەیە لە ترسان گیانی دەرچوو ، دڵیداخورپاو ترسی گەیشتە سەر ، ئەو وشەیەی كە دوێنێ بەندەیەكی لەژێر ئەشكەنجەو ئازاردا دەیخوێندەوە ئەمڕۆ بوو بە دروشمی دینێك وتێكڕای ئومەتێكی نوێ !! ائاوەها ؟! بەوخێراییەو گەشەسەندنە مەزنە ؟؟ شمشێرەكان گەیشتنە یەك و شەڕ گەرم بوو ، لە كاتێك شەڕ بەرەو كۆتایی دەڕوا ، ئومەییە چاوی بە( عبدالرحمن ى كوڕی عوف) كەوت و خۆی داپەناو خۆی بەو پاراست وداوای لێكرد كە ببێتە دیلی ئەو بە ئومێدی ئەوە لە كوشتن دەربازی بكا ، (عبدالرحمن)یش داواكارییەكەی قبوڵ كردو بردیە لای خۆی پاشان لەناو جەرگەی شەڕ بردییە شوێنی دیلەكان ، لەڕێگا بیلال چاوی پێكەوت و هاواری كرد ، گوتی :-

(سەری كوفر ، ئومەییەی كوڕی خەلەف ... دەرنەچم ئەگەر دەرچوو ) شمشێری بەرزكردەوە بۆ ئەوەی سەری بپەڕێنێ ، ئەو سەرەی كە لەبەر لووت بەرزی و خۆبەزل زانین باری قورس بووە ، ( عبدالرحمن) هاواری كرد : ( بیلال ئەوە دیلی منە) دیل لە كاتێك شەڕ گەرمەو بەردەوامە ؟! دیل شمێرەكەی پێش ساتێك لەناو جەستەی موسڵمانان خوێنی پێدا دەهاتە خوارەوە ، نا ... ئەوەیە نۆچوونی بیلال گاڵتەو پێكەنینە بە عەقڵ و هۆش ، بێگومان ئومەییە بای ئەوەندە گاڵتەو پێكەنینی كردووە كە بەس بێ ، ئەوەندە گاڵتەی كردووە هیچی بۆ ڕۆژێكی ئاوا ڕەش و تەنگانە نەهێشتۆتەوە ، تەنانەت بۆ ئەنجامێكی وا خراپیش بێت .

بیلال تەماشای كرد بە تەنیا ناتوانێ پارێزگاری برای دینی (عبدالرحمن كوڕی عوف) بشكێنێ بۆیە بە هەموو دەنگی لەناو موسڵمانان هاواری كرد ، ( پشتیوانانی خوا .... سەری كوفر ئومەییە كوڕی خەلەف ... دەرنەچم ئەگەر دەرچوو ) دەستەیەك لە موسڵمانان كە مەرگ لە شمشێرەكانیان دەتكاوە ڕوویان تێكرد چوار دەوری ئومەییەو كوڕەكەیان گرت ، (عبدالرحمن) نەیتوانی هیچ بكا تەنانەت نەیتوانی زرێی خۆی بپارێزی كە ئەو كۆمەڵە لێك وپێكیان كردەوە بیلال ماوەیەكی زۆر لە تەرمەكەی ئومەییە ڕاما ئەو تەرمەی كە كەوتە بەر لێدانەكانی شمشێری بیلال ، پاشان بەپاكردن بەجێی هێشت و بەدەنگە خۆشەكەشی هاواری دەكرد (أحد ، أحد) .

پێم وایە ئێمە ئەو ماوەمان نییە لێرەدا باسی گەورەیی گیانی لێبووردن بكەین لەلای بیلال بە تایبەت لەم جۆرە شوێنەدا ، خۆ ئەگەر بیلال و ئومەییە لە كات و بارودۆخێكی تر بگەیشتبان بە یەك ئەو كات بۆمان هەبوو كە پرسیاری مافی لێبووردن لە بیلال بكەین ، پیاوێك ئیمانێكی وەك بیلالی هەبێت بێگومان ڕۆدی و ڕەزیلی لە لێبووردن ناكات ، بەڵام ئەو پێك گەیشتنە لە شەڕ بوو ، هەر لایەك هاتبوو ئەوی تر لەناو ببات ،

شمشێرەکان دەدرەوشانەوەو کوژاوەکانیش دەکەونە سەر زەوی و مەرگیش پڕیان دەدایێ ، ئینجا بیلال چاوی بە ئومەییە دەکەوێ ، ئەو ئومەییەی کەشوێنی سەرە پەنجەیەك نەماوە لە جەستەی بیلال ئازاری ئەوی پێوە نەبێ ، لە کوێ دەیبینی و چۆن ؟ لە گۆڕەپانی شەڕ لە کاتێك شەڕو کوشتاری بە شمشێرەکان هەمووئەو سەرە موسڵمانانە دەدورێنەوە ئەگەر ئەو شمشێرانە بگەیشت با بیلال دەربازیان نەدەکرد ، ئا لەو بارودۆخەدا ئەو دوو پیاوە بگەنە یەك هیچ ڕاستو عەدالەت نی‌یە پرسیار لە بیلال بکەین :- بۆچی ئومەییەی عەفو نەکردو لێ‌ی نەبوورد ؟!

ـ ڕۆژگار بەسەر دەچێ‌و.... مەککە فەتح دەکرێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەخۆی و بە دە هەزار موسڵمانەوە بە تەکبیرو سوپاس‌و حەمدی خواوە دەچێتە ناو ئاو سەارو یەکسەر ڕوو دەکاتە کەعبە .... ئەو شوێنە پیرۆزەی کەقورەیشی‌یەکان بەدرێژایی ڕۆژانی ساڵ پڕیان کردبوو لە بت‌وسەنەم ، هەق هات ، ناهەقیش پووچەڵ بووەوە ، لەمەودوا نە لات‌و نە عوززا و نە هوبەل . لەمەودوا تەنها کڕنۆش بۆ خوای تاك‌وتەنها خوای مەزن دەبردرێ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە یاوەری بیلال دەچێتە ناو کەعبە ! چاوی بە چەند پەیکەرێکی تاشارو دەکەوێ ، خۆی بە وێنەی ئیبراهیم - سەلامی خوای لێ‌بێ - دێتە بەرچاو ، لە حاڵێك بەدوای چارەنووس دەگەڕێ بە پیاڵەکان‌و تیرەکان (یستقیم بالازلام) ، پێغەمبەری خوا ﷺ تووڕە دەبێ و دەفەرموێ ( نەفرەتی خوایان لێ‌بێ) ... ( گەورەمان ئیبراهیم بە تیران‌و پیاڵان بەدوای چارەنووس نەگەڕاوە ، ئیبراهیم نە جوولەکە بووە و نە گاور ، بەڵکو تەنها موسڵمانێکی خواپەرست بووە ، لە هاوبەش پەیداکەران نەبووە .

ـ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بە بیلال دەکا کە بچێتە سەربانی مزگەوت‌و بانگ بدا ، بیلال بانگ دەدا

ئەم ڕۆژە و، ئەو شوێنە ، ئەو بۆنەو موناسەبەتە دەبێ چەند خۆش بێت ؟!!

مەککە لە جووڵەو کار دەکەوێ و هەزارەها موسڵمان وەك شنەی وەستاو بەبێ‌دەنگی بە سەرکزی‌و ملکەچی‌یەوە ووشەکانی بانگ لە دوای بیلال دەڵێنەوە .

موشریکەکان لە ماڵەوە خەریکە بڕوا نەکەن ، دەبێ ئەوە ئەو موحەممەدەو هەژارانە بن کە دوێنێ لەم خانووانە لە ماڵەکانیان دەرکران ؟؟ !!! ئەوە ڕاستە کە دە هەزار ئیمانداری لەگەڵە ؟!

ـ دەبێ بەڕاستی ئەو کەسە کە ئێمە دەربەدەرمان کردو کوشتاریمان لەگەڵ کردو خۆشەویسترین کەسمان لەکەس‌وکاری‌و خزمانی‌کوشت ؟! ئەوە ئەو کەسەیە کە لە ماوەی چەند ساتێك ووتاری بۆ داین ئێمەش لەژێر دەستی بووین و پێ‌ی‌گوتین :-

( بڕۆن ئێوە ئازادن !!) ، بەڵام سێ‌کەس لە گەورەکانی قورەیش لە حەوشی کەعبە دانیشتبوون ئەم وێنەی بیلال یان لا زۆر پێ‌ناخۆش بوو کەدەیان دی بەپێ بەسەر بتەکانیان دەکەوێ‌و دەنگی بانگیش دەنێرێ بۆ سەر تۆپەڵەی بتە تێکشکاو ووردوخاش

بووەکان و بە ئاسۆی مەککەدا بڵاودەبێتەوە وەك بۆنە خۆشەکانی بەهار ئەو سێ کەسەش ئەوانەن :-
- (ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب) کە پێش چەند سەعاتێکە بووە بە موسڵمان و (عەتتابی کوڕی ئوسەید) و (حاریسی کوڕی هیشام) ، ئەو دووانە هێشتا بڕوایان نەهێناوە ، عەتتاب لەو کاتەی کە لە بانگی بیلال ڕامابوو گوتی :- خوا ڕێزی ئوسەیدی گرت ، کە گوێی لەو بانگە نەبوو پێی پەست بێ ، حارسیش گوتی :- بە خوا - ئاگاداربە - ئەگەر بزانم موحەممەد لەسەر هەق و ڕاستە شوێنی دەکەوم ، ئەبوسوفیانی لێزانیش لە دوای ئەوان قسەی خۆی کرد و گوتی :- من هیچ ناڵێم ، هەر قسەیەك بکەم ئەو وردە بەردانە خەبەرم لێ دەدەن !! پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە کەعبە دەرچوو چاوی پێیان کەوت و لەیەك سات ڕوخساری هەرسێیانی خوێندەوە ، لەو کاتەیدا بە ڕووناکی خوا وخۆشی سەرکەوتن چاوی ڕوون بووەوەو دەدرەوشاوە ، فەرمووی :-
بێگومان زانیم چیتان گوت !!!! چییان گوت هەمووی بۆ ووتنەوە ، حاریش و عەتتاب هاواریان کرد :- ئێمە شاهیدی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوای ، بەخوا هیچ کەس لە ئێمەی نەبیست هەتا بڵێین ئەو خەبەری پێدای ! ئینجا هەردووکیان بە دڵێکی تازەوە پێشوازی بیلال یان کرد ، هێشتا دەنگی ووشەکانی پێغەمبەریان ﷺ لە دڵە ، کە لە سەرەتای هاتنە ناو مەککەی ووتاری بۆ دان بوون و فەرموو بووی :-
- ( ئەی کۆمەڵی قورەیش ، بێگومان خوا خۆهەڵدانەوی نەفامیی و خۆهەڵکێشان بە باب و باپیرانی نەهێشت و لای برد ، مەردوم لە ئادەمەوە ، ئادەمیش لە خاکە بیلال لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانی دەبردە سەرو بەشداری هەموو ڕووداو کارەکانی ئیسلامی دەکردو بانگدەری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، دروشمی ئەو دینەی کە ئەوی ڕزگارکرد لە تاریکاییەکان بۆ ڕووناکی و لە بەندایەتی بۆ ئازادی زیندوو دەکردەوەو دەیپاراست .
ئیسلام لە پەرەسەندن دابوو ،موسڵمانانیش لەگەڵ بەرزی ئیسلام لە شکۆمەندی دابوون بیلالیش ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لە پێغەمبەری خوا نزیك دەبووەوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەسفی (بیلال)ی بەوە دەکرد کە پیاوێکە لە بەهەشتییەکان ، لەگەڵ هەموو ئەوانەدا (بیلال) هەر بە حورمەت و ڕێزو بێفیز مایەوە ، خۆی هەر بەو حەبەشییە دادەنا کەدوێنێ کۆیلە بوو !! ڕۆژێك لەگەڵ براکەی دەچنە داخوازی دوو ئافرەت بۆ خۆی و براکەی بەباوکیانی گوت :-
- (من بیلالم ، ئەوەش برامە ، دوو بەندەی حەبەشین ... هەردووکمان گومڕابووین خوا ڕێنمایی کردین ، هەردووکمان بەندە بووین خوا ئازادی کردین ، ئەگەر ژنمان بدەنێ ئەوا سوپاس بۆ خوا ، ئەگەر نەشمان دەنێ ئەوا هەر خوا گەورەیە !!)
- پێغەمبەری خوا ﷺ ماڵئاوایی کردو کۆچی دوایی کرد ، لە دوای ئەو (ئەبوبەکری صدیق) بووە جێنشینی و کاروباری موسڵمانانی کەوتە دەست ، بیلال چووە لای جێنشینی پێغەمبەر و گوتی :- ( ئەی جێنشینی پێغەمبەری خوا ، من لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە فەرموویەتی:- باشترین کردەوەی ئیماندار جیهادکردن و

تێکۆشانە لە پێناوی خوای گەورە ، ئەبوبەکر گوتی :- جا حەز لە چی دەکەی ئەی (بیلال) ، (بیلال)یش گوتی :- دەمەوێ لە پێناوی‌خوا پاسەوانی سنووری ئیسلام بکەم و لە جیهادکردن بەردەوام بم تا دەمرم ، ئەبوبەکر گوتی :- ئەی کێ بانگمان بۆ بدا ؟

(بیلال) چاوی پر فرمێسك بوو گوتی :-

من لە دوای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ کەس بانگ نادەم .

ئەبوبەکر گوتی :- وا چاکە بمێنیتەوە بانگمان بۆ بدەی .

بیلال گوتی :- ئەگەر تۆ بۆ خۆت منت ئازاد کردووە ، چۆنی دەڵێی با وابێ ، ئەگەر بۆ خواش ئازادت کردوومە ئەوا لێم گەڕێ .

ئەبوبەکر گوتی :-ئەی بیلال من بۆ خوا تۆم ئازاد کرد

ئینجا هەندێك لە ڕاوی‌یەکان دەڵێن :- گەشتی کرد چووە شام‌و لەوێ بە جیهادو پاسەوانی سنووری ئیسلام ژیانی بردە سەر ، هەندێکی تر دەڵێن :- داواکەی (ئیمامی ئەبوبەکر)ی قبوڵکردو لە مەدینە ماوەتەوە ، کە (ئیمامی ئەبوبەکر) کۆچی دوایی کرد داوای لە (ئیمامی عومەر ) - خوا لێی ڕازی بێت - کردووەن چووە بۆ شام .

بەهەر حاڵ (بیلال) دوا تەمەنی خۆی لە جیهادو پاسەوانی سنووری ئیسلام بەسەر بردووە بۆ ئەوەی ئامادەبێ کە بە باشترین چاکەو کردەوەی باش کەخواو پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان خۆشە بگەڕێتەوە خزمەتی‌یان .

لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بیلال بانگی نەدەدا ، چونکە گەیشیبا بە (أشهد أن محمد رسول الله) هەموو بیرەوەری‌یەکانی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەهاتەوە یادو دەنگی لەناو یادو فرمێسك و داخدا دەگیرا نەیدەتوانی بانگەکە تەواو بکا .

لە ڕۆژانی کە عومەری کوڕی خەتتاب )چووە شام ، دوا بانگی بیلال لەوێ بوو موسڵمانان داوایان لە (ئیمامی‌عومەر) - خوا لێی ڕازی بێت - کرد کە بە بیلال بڵێ تەنها یەك بانگیان بۆ بدا کە کاتی نوێژ دێ ، لە کاتی نوێژدا پێشەوای ئیمانداران بانگی بیلالی کردو داوای لێکرد کە بانگێکیان بۆ بدا ، (بیلال) سەرکەوت و بانگی‌دا هەرکە دەستی کرد ئەوەی پێغەمبەری دیتبوو لەو یاوەرانەی کە بەخزمەتی گەیشتبوون هەموویان گریان ، گریانێکی وا هەروەك ئەوە کە هیچ نەگریا بن ، (ئیمامی عومەر) لە هەموویان بەکوڵتر دەگریا !!

( بیلال ) چۆنی بۆ خۆی دانا بوو ئاوا بە پاسەوانی ئیسلام لەسەر سنووری لە شام تا ئەو ڕۆژەی کۆچی دوایی کرد .

ئەمڕۆ لەژێر خاکی دیمەشق تەرمی یەکێك لە مەزنترین ئادەمیزاد شاردراوەتەوە

* * *

# ٥٣
# ( هاشم ) ی کوڕی عوتبە
# هەڵۆی موجاهیدان

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ زیاتر هاندانی موجاهیدان بۆ جیهادکردن دەفەرموێت :-

- کاتێك براکانتان لە ئوحد شەهید بوون ، خوای گەورە گیانیانی خستە نێو سکی چەند باڵندیەکی سەوز کەوا دەسوڕێنەوە بەسەر ڕووبارەکانی بەهەشتو لە بەروبوومەکی دەخۆنو دەگەڕێنەوە بۆ شوێنێك کەوا مۆمی زێڕین هەڵواسراوە بە سێبەری عەرشەوە

هەرکە تامی خواردن و خواردنەوەیان چەشت و جێگا خۆشەکەیان بینی گوتیان :-

خۆزگە برایەکانمان بیانزانییایە خوا چی بۆ ئێمە کردووە بۆ ئەوەی سستی نەکەن لە جیهادو پشت لە جەنگ نەکەن

لێرەدا موجاهیدێك لە یاوەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ گیانی خۆی خستە سەر دەست بۆ وەدەست هێنانی ئەم شەهادەتە بەرزە وهەموو ژیانی خۆی بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خواو سەرخستنی ووشەی هەق بەکارهێناو، بە ئەندازەی چاو تروکانێك سستی نەکردو پشتی لە دوژمنانی خواو دوژمنانی هەقو دادوەری نەکرد، ئەم یاوەرە بەڕێزەش (هاشم کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاصی کوڕی ئوهەیبی کوڕی زوهرەی کوڕی عەبدمەنافی زوهری)بوو

مامی (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) بوو - خوا لێی ڕازی بێت - کەوا یەکێك بوو لە موسڵمانە سەرەتاییەکانو پێشەنگی بڕواداران

ناوی باوکی (عوتبە) برای سەعد بوو لە باوکیو، بە گاوری مردو ڕوناکی ئیسلام دڵی ڕوناك نەکردەوە ، ئەوەبوو هەڵوێستێکی زۆر خراپی نواند بەرامبەر موسڵمانان لە جەنگی ئوحد ، بە تایبەتی بەرامبەر خودی پێغەمبەر ﷺ ، ئەم بێباوەرە بوو پەلاماری برد بۆ پێغەمبەرو ڕووی پاکی پیرۆزی بریندار کرد

لەم کاتەدا (هاشم) منداڵێکی بچووك بوو ، بلوغی نەبوو بوو ، بە ئەرەکەکانی سەرشانی نەدەزانی

(هاشم) لە ساڵی فەتح واتە ساڵی ڕزگارکردنی شاری مەککە لەگەڵ ئەو خەڵکانەی کەوا پۆل پۆل بۆ ناو ئیسلام دەهاتن موسڵمان بوو ، بە موسڵمان بوونێکی چاكو بیروباوەڕێکی پتەو ، بەڵام (هاشم) بەشداری جەنگێك یان غەزایەکی نەکرد پاش جەنگی فەتح تاکو جەنگی هەڵگەڕاوەکان ، لەبەرئەوەی تا ئەو کاتە تەمەنی ڕێگای نەدەدا بە جەنگو بەشداریکردنی تیایدا

له مێژووی ئیسلامدا جەنگە ڕزگاریکەرەکان بە ناوبانگن لە عێراق وشام و فارس ئەم جەنگانەش بریتین لە جەنگی : یەرموك و ڕزگارکردنی دیمەشق و قادسیەو مەدائین و جەلەولا

لێرەدا چەند جەنگێك ڕوویدا لە نێوان مسوڵمانان وەکو جەنگی جەمەل و صیفین (هاشم کوڕی عوتبە) بەشداری هەموو ئەم جەنگانەی کرد بە چەند شێوەیەکی جۆراو جۆر تیایدا لە فەرماندەی سوپای سوارچاکان بگرە تاکو سەرۆکی چەند کۆمەڵێکی گەورە ، تاکو سەرۆکی رزگارکردنی جەلەولا...

بلیمەتی و لێزانی سەرکەوتنەکانی (هاشم) لەوەدا تێبینی دەکرێت بەهۆی بەشداری کردنی لە جەنگەکانی ، لەگەڵ سەرۆکی بێ وینە (خالیدی کوڕی وەلید) – خوا لێی ڕازی بێت – لە جەنگی هەڵگەڕاوەکان (ردّة) تا کۆتایی ژیانی

(هاشم) – خوا لێی ڕازی بێت – بەشداری کرد لەگەڵ سەربازانی خودا کەوا دەرچوون بۆ جەنگی هەڵگەڕاوەکان و گێڕانەوەی لە ڕێگا دەرچووەکان بۆ شارێگەی ئیسلام ، بە باشترین شێوە بەشداری تیا کردو تاقیکردنەوەو پەندێکی زۆری تیا وەرگرت ... لەم جەنگانەش ئازایەتی و غیرەت و سوارچاکی تیا بەدیارکەوت ، تا وای لێهات خەڵك باسی بکەن و نازناوی (تیژڕەو)ی لێبنێن ، واتە :– (المرقال)

ئیمە ئیمرۆ پێی دەڵێین :– جەنگی (لەناکاو) ، کەوا (هاشم)– خوا لێی ڕازی بێت – بە خێرایی پەلاماری بۆ دوژمن دەبردو ڕێگای بە دوژمن نەدەدا هەلی بۆ ڕەخسێت و خۆی کۆبکاتەوە ، لێرەدا هەڵەشمان نەکردووە کەوا بڵێین :– ئەم ئازایەتی و پیلانە جەنگیانەی لە قارەمانی بێ وێنەو فەرماندەی مەزن (خالیدی کوڕی وەلید) فێربووە ، لە کاتێکدا (خالید) لە جەنگ و شەڕەکان بە کۆمەڵەکان پشتی پێ دەبەست و بەکاری دەهێنا ، (هاشم) خووی پێوەگرت هەتا لە ئاستی ڕووبەڕووبوونەوەی شەڕە شمشێری تاکەکەسیدا بەکاری دەهێنا

کاتێك (خالید) ڕووی کردە عێراق (هاشم) لەگەڵیدابوو ، هەڵدەستا بە سەرکردایەتیکردنی سوپایەك لە موجاهیدان کەوا (خالید) ئەوپەڕی بڕوایی پشتی پێ دەبەست ، بۆ تۆمارکردنی پەلاماردان و سەرکەوتنەکان

کاتێك فەرمانی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق – خوا لێی ڕازی بێت – گەیشت بە (خالید) کەوا نیوەی سوپاکەی بەجێبهێڵێت بۆ (مثنی کوڕی حارثە) بە نیوەکەی تر ڕوو بکاتە یەرموك بۆ یارمەتی و بەهانا هاتنی لەشکری مسوڵمانان ، (هاشم) لەم گەشتەدا هاوڕێیەتی کرد ، بە بەشداریکردنێك ، بوو بە داستانێك لە مێژوو تۆمار کرا کەوا مەزنترین سەرکەوتنی سەربازی و گەورەترین ئازایەتیان تیادا بەدەست هێنرا

(هاشم) سەرۆکایەتی سوپایەك لە سوارچاکانی موسڵمانانی گرتە دەست لە جەنگی یەرموك دا کەوا بە گەورەترینی جەنگ دەژمێردرێت لە رزگارکردنی وڵاتی شام دا ، هەروەها چاوێکی پیرۆزی پێش خۆی ڕەوانەی بەهەشت و تەسلیم بەخودا کرد ، ئەمەش بۆی بوو بە شایەدی لەسەر ئازایەتی و ڕاستی ئیمانەکەی ...

پاشان (هاشم) بەردەوام کۆڵی‌نەدا لەدوای سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی یەرموك لەگەڵ سوپای (خالید) لە ڕزگارکردنی دیمەشق

ئازایەتی و قارەمانیەتی (هاشم) گەیشت بەخەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب – خوا لێی ڕازی بێت – ئاوای لێ‌هات دان بێنێت و سەرسام بێت بە ئازایەتی ئەم موجاهیدە بەڕێزە ، ئینجا فەرمانی بە (خالید) کرد دووبارە ڕووبکاتەوە عێراق بۆ فریاکەوتنی لەشکری (سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) و (هاشم) بکات بە فەرماندەی ئەم هێزانە ، (خالید) ئەم فەرمانانەی کە پێی کرابوو جێبەجێی کرد

بەم جۆرە (هاشم) بە سوپایەکەیەوە گەیشت بە لەشکری موسڵمانان ، بە گەیشتنی ئەم لەشکرە ، هێزو ورەیەکی بەتینی دروست کرد لە دەروونی موجاهیدان ، ئیتر لە ژێر ئاڵای مامی (سەعد) جەنگی کردو، بە درێژایی ڕۆژگاری جەنگ ئارامی گرت لەسەر توندوتیژی‌و ناخۆشی‌یەکانی جەنگو ، هونەرەکانی جەنگی تیادا بەدیار کەوت هەروەك مێژوونووسەکان دەڵێن :– ( باشترین بەشداری لە قادسیە بەشداری کرد ، ئەو کارانەی کە ئەو پێی هەڵسا کەس پێی هەڵنەستاو ، بووە هۆی سەرکەوتن بۆ موسڵمانان ).

کاتێك فارسەکان لە جەنگی قادسیە شکستیان خوارد ، کەوا ترس‌و هەیبەتیان لە دڵی گەورەو سەرۆکەکان دروست کردبوو‌و قوربانی موسڵمانان‌و پشت نەکردنیان ، ترس‌وبیمی لە دڵی گشت سەربازە فارسەکان دروست کردبوو وایان لێ‌هات ڕاکەن‌و ڕوو بکەنە (مدائن)و (نهاوند) ، هەروەها ورە ڕوخاو شکست خواردوو (یەزدجەرد)یشیان لەگەڵ بوو کەوا مەدائین چاوەڕوانی دەکردن ، هەر کە ئەم دەنگ‌و باسە ناخۆشەیان پێ‌گەیشت بەوەی بەسەر لەشکرو سەرکردەکانیان هاتووە لەم شکستە بێوێنەیە ، هیچیان بۆ نەکرا تەنها کۆکردنەوەی ئەم شتە سووك‌و بەنرخانە نەبێت ، لەگەڵ ئامادەکردنی خۆیان بۆ ڕاکردن‌و ، بەجێ‌هێشتنی چەند هێزێکی پارێزەر لە دوای خۆیان کەوا بوون بە سووتەمەنی جەنگ‌وتەنها بۆ ڕزگارکردنی گیانی خۆیان لە مردن ، بەڵکو بتوانن هەندێك لەم سەروەت‌و سامانەشیان ڕزگار بکەن

(هاشم)– خوا لێی ڕازی بێت – پێش سوپای مامی (سەعد) کەوتبوو بۆ ئەوەی بگات بە پاشماوەی سەربازە فارسەکان ، لە ڕێگایان بۆ مەدائین تاکو گەیشتن بە شوێنێك پێی دەگوترا ( تاریکایی ساباط ) ،( تاریکایی ساباط ) شوێنێك بوو تیایدا بەرگری‌یان دەکرد لە دەورووبەری چەم‌و بەرزایی هەبوو ، لێرەدا (هاشم) چاوەڕێی مامی (سەعد)ی‌کرد . لەم شوێنەدا (کیسرا) کەتیبەیەکی هەبوو بەناوی کەتیبەی (بوران) ، سەربازگەیان لەدەوری ( تاریکایی ساباط ) بوو و بەهێزترین کەتیبەیان بوو هەموو ڕۆژێك سەربازەکانی ئەم کەتیبەیە سوێندیان دەخوارد تا ئەوان زیندوو بن نابێ دەوڵەتی فارس بشکێت

(هاشم) لەپێشیدا شێرێك پەیدابوو کەوا کیسرا لەم ناوچەی دانابوو واتە ناوچەی (تاریکایی ساباط) و پەروەردەی دەکرد ، ئەم شێرە لەسەر ڕێگای موسڵمانان وەستاو ڕێی پێ دەگرتن ، (هاشم) لەسەر وڵاخەکەی هاتە خوارەوەو ڕووی لە شێرەکە کرد ، ئەم شێرە ناوی (موقەڕەت) بوو و (هاشم) شمشێرەکەی لێ‌هەڵکێشاو ، شمشێرەکەش خۆی

بۆ ئامادەکرد ، (هاشم ) شمشێرێکی لێداو کوشتی ، مامی‌سەعد لە (هاشم) چووە پێشەوەو لەسەر ولاخەکەی بۆی نزم بووەوە و ، بۆ ڕێز لێنانی ئازایەتی سەری برازاکەی ماچ کرد ، لەم کاتەدا (هاشم) پێی مامی ماچ کرد کەوا نزیکترین شوێن بوو لێی لەبەر ئەوەی ئەم لەسەر ولاخەکەی بوو ، پاشان کەتیبەی (بوران) شکستی خوارد لە کاتێکدا سوێندیان خواردبوو کە تا ئەوان زیندوو بن نابێ دەوڵەتی فارس بشکێت .

پاشان سەعد گەیشتە ( تاریکایی سابات) وئەم ئایەتەی خوێندەوە کەوا خوا لە قورئان دەفەرموێت :

﴿ أو لـم تكونوا أقسمتم من قبـل ما لكـم من زوال ﴾ ....

کاتێك شەو داهات موسڵمانان لەم شوێنە کۆچی‌یان کرد لە (بەهورەسیر) خستی‌یان ، هەر کە تیپێك لە سوپای (سەعد) دەگەیشتە (بەهورەسیر) بانگی تەکبیریان لێدەدا ، ئەمەش وای کردبوو ترس بخاتە دڵی بێباوەڕەکان‌و ورەو ئازایەتیش بخاتە دەروونی موسڵمانان و پاڵیان پێوە بنێت بۆ بەردەوام بوون لەسەر جیهادو ڕێڕەوی ڕزگارکردنی بەشەکانی‌تری زەوی ....

(بەهورەسیر) یەکێك بوو لە شارەکانی کیسرا کەوتبووە لای ڕۆژئاوای ڕوباری دیجلە ، هەرچی ئیوان بوو کەوتبوونە لای ڕۆژهەلات .

لەبەر ئەوە (بەهورەسیر) خۆی ئامادەکردبوو بۆ بەرگری ئەم گەمارۆیە ، سەعد فەرمانی دا مەنجەنیق دروست بکەن ، ئەوبوو بیست دانەیان دروست کرد ، لە بەرهورەسیر دایمەزراندن‌و بە ڕستە دەیهاوێشتە بەهورەسیر ، خەڵکی شاری بەهورەسیر وایان لێهات بەسەر سوپای سەعد دابدەن بۆ کەم کردنەوەی ئەو گەمارۆیەی لەسەریان بوو ، بەلام پاشەکشەیان کردو بە شکاوی گەڕانەوە مولگەکانیان .

پاشان نوێنەرێکی فارسەکان ڕووی تێکردن‌و گووتی :-

پاشا دەڵێت :- ئایا هیچ ڕێگا چارەیەك هەیە بۆ گفتوگۆ کەوا ئەم لایەی ڕوباری دیجلە بۆ ئێمە بێت ، کەوا دەکاتە لای ڕۆژهەلاتی‌و لای ڕۆژئاواشی بۆ ئێوە بێت ، ئایا تێرنەبوون ، خوا سکتان تێر نەکات ....

(اسود کوڕی قطبة ) بۆ وەلامدانەوەی لێی چووە پێشەوەو - کەوا ئەم ڕستەی دوایی کاری لێکرد ، ووشەیەکی دەربڕی وەکو ئەوەی خودا ئیلهامی بۆ بنێرێت و ببێتە هۆی ئەوەی پاشای فارس بخاتە لەرزین‌و دڵەڕاوکێ و گەڕانەوەیان بۆ نەبێ ، (اسود کوڕی قطبة) گوتی :-

- لە نێوان ئێمەو ئێوە هیچ گفتوگۆیەك نی‌یە تاکو لە هەنگوینی (ئەفریذون)و (ئوتروج -کوثا) نەخوێنەوە ...

هەرچی (ئەفریذون ) بوو کەوتبووە ڕۆژهەلاتی دیجلەو لەناوەوەی ولاتی فارس بوو ، هەرچی (کوثا) بوو کەوتبوە نێوان دیجلەو فورات موسڵمانان لەمەوپێش ڕزگاریان کردبوو .

پاشا گوتی :-

خاکمان بەسەردەڵێی فریشتە قسە دەکات لەسەر زمانیانو لە شوێنی عەرەب وەڵامیان دەداتەوە ، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم قسەیە وانەبێت ، تەنها ئەم شتە ئەوەیە قسەیەکە لە لایەن خواوە خراوەتە سەر زمانیان بۆ ئەوەی ئێمە واز لە شەڕی ئەوان بهێنین .

پاشان دزەیان کرد بۆ کەشتییەکانیانو گواستیانەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی دیجلە هەرچی مەنجەنیقەکان بوو بەردەوام بەردە ئاگرینەکانی خۆیان دەهاوێشت ، لە کۆتاییدا پیاوێك لە (بەهورەسیر) بۆیان دەرچوو بانگی ئەمانی کرد بۆیان ، ئەوانیش پەنایان داو چوو بۆ لایانو گوتی:-

- (بەهورەسیر) کەسی تێدا نەماوە کێ قەدەغەی هاتنە ژوورەوەتان لێدەکات ؟

ئیتر موسڵمانان دیواری (بەهورەسیر)یان بڕیو، کەسی تێدا نەمابوو ، سپاییەکیان لێ بەدیار کەوت کاتێك وەستا بوون لە قەراغی دیجلە ، چونکە دیجلە جوێی دەکردەوە .

(ضِراری کوڕی خەطابی فەهری) گوتی :-

(الله اکبر) ئەوە کۆشکی کیسرایە ، ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا بەڵێنیان دابوو .

موسڵمانان بەردەوام تەکبیریان لێدەدا تا بەیانی ....

(بەهورەسیر) یەکێك بوو لە شارەکانی مەدائین ، شارەکانی مەدائین لە حەوت شار پێکهاتبوو کەوا چەند کیلۆمەترێك لێك دووربوون ، هەر پاشایەك لە پاشاکانی فارس شوێنێکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد بوو ، لەم شارانەش (بەهورەسیرو جوندیسابور) بوو ، وە لە یەکێك لەم حەوت شارە (ایوان کسری) و کۆشکی کیسرای لێبوو کەوا شوێنی دانیشتنی کیسرا بوو ، ئەم کۆشکە یەکێك بوو لە دیمەن سەیرو سەمەرەکانی دونیا تاکو ڕۆژانی خەلیفەی عەبباسی هەر مابوو پاشان لە ساڵی (٢٩٠)ی کۆچی ڕووخا ... مەدائین شوێنێك بوو پاشان لە نزیکیەوە شاری بەغدا دروست کرا

(سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) ویستیوابوو بپەڕێتەوە لەڕووباری دیجلە لەگەڵ موجاهیدەکان بۆ ئەوەی دەست بگرێ بەسەر (ایوان) و شارەکانی تری مەدائین بەڵام هیچ کەشتییەکیان دەست نەکەوت ، لەبەرئەوەی کاتێك فارسەکان ڕایان کرد لە (بەهورەسیر) هەموو کەشتییەکانیان لەگەڵ خۆیان بردو هیچ شتێکیان بەجێنەهێشت ، مەبەستیان ئەوەبوو ڕێگا بگرن لە موسڵمانان .

(سەعد) لەشکرەکەی کۆکردەوە وتارێکی بۆ دان لەسەرەتا حەمدو سوپاسی خوای کردو گوتی :-

دوژمنەکانتان خۆیان پاراست لە ئێوە بەم ڕووبارە ناتوانین پێیان بگەین ، بەڵام ئەوان دەگەن بە ئێوەو ئەگەر حەز بکەن لەناو کەشتییەکان تیر بارانتان دەکەن ، وە لە پشت ئێوەش هیچ شتێك نییە بۆ ئەوەی لێی بترسن ، ئەوەندە بەسە بۆ ئێوە برایەکانتان کەوا جیهادیان کردو هیچ شارێکیان لەدوای خۆیان بەجێنەهێشت مەگەر مل کەچ نەبووبوون ، من وا تێدەڕوانم بەردەوام بن لە جیهادی دوژمنەکانتان بە نیازەکانتان من دەمەوێت ئەم ڕووبارە ببڕم و پێیان بگەم

مسوڵمانەکان هەموویان گوتیان :-

- خوا لەگەڵ ویستمان بێت و ڕێگامان ئاسان بکات ، ئەم کارە بکە ...

لەم کاتەدا داوای لە تیپێك لە سوارچاکان کرد لەگەڵ وڵاخەکانیان ڕووبارەکە ببڕن ، ئەمانەخاوەن غیرەتو سوارچاکیو پشتیان لە دوژمن نەدەکرد ، بۆ ئەوەی بگەن بە قەراغی ڕۆژهەڵاتو پارێزگاری لەوانە بکەن کەوا لە دوای ئەوان بپەڕنەوە
شەش سەد وڵاخ ڕووبارەکەیان بڕی تاکو کەمێك مابوو بگەن بە ڕۆژهەڵات ، خەڵکی مەدائین بینییان بەخۆو بە ئەسپەکانیان پەلاماری موسڵمانەکانی ناو ئاویان دا ، فەرماندەی سوارچاکان ( عاصم کوڕی عەمروی تەمیمی) هاواری کرد :- ڕمەکان ئامادە بکەن ، ڕمەکان ئامادە بکەن ، ڕووبەڕووی چاوی دوژمنان بهاوێن .
لەم کاتەدا موسڵمانان نیشانەیان لە چاوی دوژمنەکانیان گرتو بۆیان هاوێشتن ، زۆربەیان لێدران ، فارسەکان شکانو موسڵمانان پێیان گەیشتن و زۆربەیان کوشتن ، ئەوانی تر ڕایان کرد ، هەروەها ( هاشم کوڕی عوتبە) - خوا لێی ڕازی بێت - یەکێك بوو لە سەرەکردەی ئەم تیپانە لە سوارچاکەکان کەوا ڕووبارەکەیان بڕیو ڕووبەڕوویان بوونەوەو بەسەریان دا سەرکەوتن .
هەر شەش سەد سوارچاکی موسڵمانان لە قەراغی ڕووبار وەستان ، ڕووبار لە دوای ئەوان پڕ بوو لە وڵاغی موسڵمانان کە خۆیان لە هەزارەها ئەداو لە دوای یەك دەڕۆیشتن و یادی خوایان دەکردو پشتو پەنایان خوای گەورە بوو ئەم ئایەتەیان دووبارە دەکردەوە :-

﴿ حسبنا الله ونعم الوكيل ، ولا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم ﴾...

( سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ) لەسەر وڵاغەکەی بوو (سەلمانی فارسی)یش - خوا لێیان ڕازی بێت - لەسەر وڵاغەکەی تر بوو لە تەنیشت یەك بوون ، ڕووبار وای لێهاتبوو لەبەر زۆری سوارچاکان نەدەبینرا
خەڵکی مەدائین لەناکاو تووشی کارەساتێك بوون ئەم شتە بەبیریان نەدەهات ، وای لێهات هەموو ئەوانەی خاوەن موڵكو سامان بوون خۆیانو سامانەکانیان ڕزگار بکەن ، بەڵام ئەو سەربازە فارسانەی لەسەر قەراغ بوون کەمێك مانەوە پاشان پشتیان هەڵکردو شکستیان خوارد .
خەڵکی مەدائین کاتێك بینییان دیجلە شەپۆلی وڵاغ دەهێنێت گوتیان :-
ئەوە شەیتان هات ، هەندێك لەوانەی لە پشتەوەی سوپا تێشکاوەی فارس بوون هاواریان دەکردو دەیانگوت :-
پاشا ڕایکرد بۆ چی خۆتان دەدەن بە کوشت ، سوێند بەخوا لە مەدائین کەس نەماوە ...
بەم جۆرە شکستی تەواویان لێ بەدیار کەوت ، خوای گەورە مەدائینی بۆ موسڵمان ڕزگار کرد ، پاشان چەند کەسێکیان بینی لە کۆشکی کیسرا کە پاش گەمارۆدانیان داوای ئەمانیان کرد و ڕازی بوون بە جزیە دان .
کاتێك سەعد چووە ناو تاقی کیسرا ئەم ئایەتەی قورئانی خوێندەوە :-
﴿ كم تركوا جنات و عيون ، وزروع و مقام كريم ، و نعمة كانوا فيها فاكهين ، كذلك اورثناها قوما آخرين ﴾ ...

پاشان سەعد چەند موجاهیدێکی نارده دوای ڕاکردووەکان ، ئەوانەی موڵکو سامانیان لەگەڵ خۆیان بردبوو، زۆربەیان کەوتنە بەردەست و ماڵەکانیان لێ وەرگرتنەوە تەنها کەمێکیان ڕزگاریان بوو .

(سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص) لە مەدائین جێگیر بوو ، وا دەنگوباسی بۆ هات کەوا پاشماوەی ڕاکردووەکانی فارس وەستاون لە (جەلەولا)و ، خەڵکێکی زۆریان لەدەورەی خۆیان کۆکردۆتەوە کەوا لە زۆر شوێن بۆیان هاتوون‌و، (یەزدجەرد) گەیشتۆتە (حولوان) و سوپایەکی گەورەی لە زۆر شوێنان کۆکردۆتەوە بۆ ئەوەی بەرامبەر موسڵمانان بوەستن‌و ، پارێزگاری لەو بەشانەی تری وڵاتی فارس بکەن و نەهێڵێت زیاتر موسڵمانن بێنە پێشەوە.

سەعد بۆ گەورەی بڕواداران (عومەری کوڕی خەتتاب)ی- خوا لێی ڕازی بێت - نووسی ، سەرپشکی کرد لەم کارە ، عومەریش بۆی نووسی و داوای لێکرد کەوا خۆی بمێنێتەوە لە مەدائین و برازاکەی (هاشم کوڕی عوتبە) بکات بە سەرکردەی ئەو سوپایەی کەوا دەینێرێ بۆ سەر سوپای کیسرا لە (جەلەولا) ، چەند کۆمەڵێك لە سوارچاکانی بۆ دیاری کرد بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی بکەن .

(سەعد) سوپایەکی ڕێکخست لەگەڵ برازاکەی ، کە خۆی دەدا لە دوازدە هەزار موجاهید ، چەند سوارچاکێکی توندوتۆڵی وەکو (قەعقاعی کوڕی عەمروی تەمیمی ) لە سەرکردایەتی کردنی کەتیبەکان دانا لەگەڵ بیرتیژو قارەمانی‌موسڵمانان لە یاریدەدەرو کۆچکردووەکان .

هەرچی سوپای فارسەکان بوو چەند چاڵێکیان لە دەرەوەی (جەلەولا) هەڵکەندبوو ، لێرەدا (هاشم کوڕی عوتبە) گەمارۆی دان ، ئەوانیش لەشار هاتنە دەروە بۆ جەنگ ، جەنگێکی وایان دەکرد وێنەی نەبوو کیسراش یارمەتی بۆ ڕەوانەکردن ، هەروەها لەشکری هاشم یارمەتی بەردەوام لە (سەعد) پێ‌دەگەیشت ، تا دەهات جەنگ گەرم تر و توندتر دەبوو ، هاشم جار جار وتاری بۆ خەڵك دەدا و ، هانی دەدان بۆ جەنگ و داوای لێدەکردن پشت بەخوا ببەستن ، ئەمەش هەندێك لە وتەکانیەتی :-

- ئەگەر ئێمە ئەم جێگایەمان بۆ ببێت جێگای تریشمان بۆ دەبێت ، بەشداری‌یەکی تەواو بۆ خودا بکەن ، خوداش پاداشت‌و غەنیمەیەکی تەواوتان پێ‌دەبەخشێ ، تەنها بۆ خودا کار بکەن .

هەرچی فارسەکانە بەڵێنیان داوەو سوێندیان بەم ئاگرە خواردووە کە دەیپەرستن کەوا پشت لە ئێوە نەکن تا لەناوتان دەبەن ...

بەم جۆرە (جەلەولا) جەنگێکی وای بەخۆوە بینی وێنەی نەبوو لە پەلامارو بەرگری‌و کۆڵنەدان لە کۆتایی‌دا خودا سەرکەوتنی بۆ موسڵمانان ڕەوانەکرد ، پاش نزیکەی هەشتا جار بەیەکگەیشتن و پێکدادان ئینجا پاش چەند ڕۆژێکی زۆر موسڵمانان سەرکەوتن ، چاڵەکەیان بڕی ، ئەو چاڵەی کەوا فارسەکان پێ‌ی‌دا تێپەڕدەبوون بۆ جەنگ لەگەڵ موسڵمانان .

بەم جۆرە گاورەکان تووشی شکستی‌یەکی گەورە هاتن و پشتیان هەڵکرد و ڕایان کرد ، بەڵام چاڵەکان بووە هۆی لەناوچوونی خەڵێکی زۆر چونکە لە پشتەوەی خۆیان سنگی ئاسنینیان چەقاندبوو بۆ ئەوەی موسڵمانان بکەونە ناویەوە ، بەڵام خوای

گەورە وای کرد کە خۆیان تێ‌ی‌کەون ، ئەسپێکی زۆریان کەوتەناو ئەم سنگە ئاسنیناوە پاش ئەوەی پشتیان هەڵکردوڕایان کرد

خوای گەورە (جەلەولا)ی بە دەستی موسڵمانان ڕزگارکرد ، ئەوەش لێدانێکی گەورە بوو هیواو ئومێدەکانی فارس بۆ وەستانیان دژی موسڵمانان لەبەر ئەوە ناویان لەم جەنگە نا ڕووداوی (جەلەولا) :- سەرکەوتنی سەرکەوتنان ، هەروەك دەڵێن فارسەکان لەم جەنگەدا سەد هەزار جەنگاوەریان کوژرا و موسڵمانان تێیدا سەرکەوتن بە دەسکەوتێکی یەکجار زۆرەوە کەوا لە ژمارە نایەت

بەم جۆری (هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی‌وەقاص) لاپەڕەیەکی پرشنگداری لە سەرکەوتنە مەزنەکان تۆمارکرد ، کەوا وێنەی نەبوو لە جیهان دا

(هاشم) گەڕاوە کوفە لە نێوان ئەم سەرکەوتنانە بەسەر فارسەکان‌و نێوان شەهیدکردنی ( عثمان کوڕی عەففان ) - خوا لێ‌ی ڕازی بێت - بۆ ماوەیەکی زۆر ناوی نەماو باسە لێوە نەکرا

کاتێك موسڵمانان لە شاری مەدینە پەیمانیان دا بە (عەلی کوڕی ئەبی طالب) - خوا لێ‌ی ڕازی بێت - (هاشم) هاتە لای (ئەبی موسای ئەشعری) کاتێك والی کوفە بوو ، پێ‌ی گوت :-

- ئەی ئەبا موسا موبایەعە بدە بە باشترین کەس لەم ئوممەتە واتە (ئیمامی عەلی)
- ئەبو موسا گوتی :- پەلە مەکە

(هاشم) دەستەکانی لەسەر یەك دانا و گوتی :-

- ئەمە بۆ (عەلی)و ئەمە بۆ من ، من موبایەعەم بە (عەلی)دا

پاشان ئەم پارچە شیعرەی خوێندەوە :-

ابايــع غير مكتــرث (عليّـــا)      ولا أخشـــى أميرا أشـــعريًا
ابـايعه و اعلــم ان سـأرضـي      بذاك اللـه حقـا و النبيّــا

(هاشم) لەگەڵ (ئیمامی عەلی) - خوا لێ‌یان ڕازی بێت - هەردوو جەنگی (جەمەل‌و صیفین)ی بینی گەورەترین بەشداری تیاکردو گەورەترین شەڕی تیاکرد ، لە کاتی جەنگی (صفین) هاشم‌و عەمماری کوڕی یاسر - خوا لێ‌یان ڕازی بێت - پارێزگاریان دەکرد لە ئەسپی (ئیمامی عەلی) هەتا خوێن لە شمشێرەکانیان دەتکایەوە لەگەڵی دەچوون بۆ ناو ڕیزەکانی دوژمنەوە ، و لە یەکێك لەم پێکدادانە هاشم‌و عەممار - خوا لێ‌یان ڕازی بێت - بە دەستی لە ڕێگادەرچووەکان (فئة الباغية) نەگەڕانەوەو هەردووکیان شەهید بوون و گەیشتن بە پیاوچاکان .

ڕەزای خوا لە قارەمانی موجاهیدو سەرکردەی بێ‌وێنەو شەهید لە ڕێگای هەق ، هەڵۆی موجاهیدان (هاشمی کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبی وەقاص) .

*     *     *

٥٤

# صوهەیب ﴿﴾ی کوڕی سینانی ڕۆمی

## پێشەوای ڕۆمەکان بۆ بەهەشت

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

## ٥٤

# صوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمی
# ( صوهەیب پێشەوای ڕۆمەکانە بۆ بەهەشت )
### فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

لە سەدەی شازدەهەمینی زایینی ، دوو زل هێزی گەورە مل ملانێیان دەکرد بۆ دەست بەسەر داگرتنی دەسەلات لە جیهان دا ئەم دوو دەولەتەش :- دەولەتی فارس – کیسرایەکان– لە ڕۆژهەلات و ، دەولەتی ڕۆم – قەیسەرەکان – لە ڕۆژئاوا ، هەر یەکێك لەمانەش دەستیان گرتبوو بەسەر چەند بەشێکی ولاتانی عەرەب ، فارسەکان فەرمانڕەوایی عێراقیان دەکردو ، ڕۆمەکان فەرمانڕەوایی میسر و شامیان دەکرد ، هەرچی نیمچە دورگەی عەرەب بوو ئەم دوو هێزە دەورەیان دابوو ، دەستیان لە کاروباری وەرنەدەدا ، تەنها دەورووبەرەکانی نەبێ هەندێ جار دووچاری هێرش و پەلاماردان دەبوون

دەولەتە عەرەبەکان بوو بە شانۆی جەنگەکان ، بۆ ئەم دوو دەولەتە ، هەریەکێکیان چاوی دەبڕیە فرەوان کردنی دەولەتەکەی و بەهێزکردنی

هەندێك جار فارسەکان پەلامارو غارەیان دەهێنا بۆ سەر ڕۆمەکان و ، میسرو شامیان لەژێر دەستیان دەردەهێناو ..... هەندێك جاریش ڕۆمەکان پەلامارو غارەیان دەهێنا سەر فارسەکان و عێراقیان لەژێر دەستیان دەردەهێنا

لێرەدا (سینان کوری مالیکی نەمری) ، کاربەدەستی کیسرا بوو لەسەر (ابلـة) لە خاکی موسڵ لە نزیك ڕووباری فورات لە ولاتی عێراق

ڕۆمەکان غارەو پەلاماریان بۆ سەر ئەم ناوچەیە ، خەڵکەکەیان بەدیل گرت ، لەم دیلانە کوڕی سینان کەوا ناوی – صوهەیب – بوو منداڵێکی بچووك بوو کەوتە بەردەستیان ، هێشتا خۆی نەناسیبوو و بلوغی نەبوو بوو ، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا میللەت و نەتەوەو بنەماڵەو شارەکەی خۆی دەناسی

صوهەیب پەروەردە بوو لە ولاتی ڕۆم و زمانیان فێر بووو ، زمانی ڕەسەنی خۆی کەوا عەرەبی بوو پشێوی تێکەوت ، پاش ماوەیەك یەکێك لە هۆزی کەلب لە ڕۆمەکانی کڕیەوە ، پاشان بردیە مەکەو ، لە بازاڕ فرۆشتیەوە (عبداللەی کوڕی جودعانی تەیمی ) لێ ی کڕیەوەو لەگەڵی ژیا ....

صوهەیب لەگەڵ (عبداللەی کوڕی جودعان) جێ نشین بوو و، هەموو خوڕەوشت و هەلس وکەوتێکی بەرزی لەم پیاوە فێربوو .

صوهەیب پیاوێکی سوورەی بەژن وبالا مام ناوەندی پرچی درێژ بوو ، بەلام لەنگی یەك لە زمانی هەبوو بە هۆی ئەم ماوە درێژەی لە ولاتی ڕۆم بەسەری بردبوو ،

گەورەکەی زۆر سکی بۆی دەسوتا و دەستی بەزەیی و ڕەحمی بەسەریدا دەهێنا ، کاتێکیش سەرسام بوو بە ڕەوشتی بەرزی صوهەیب چاکەی ئازادکردنی پێبەخشی، پەیمانیشی لەگەڵ بەست ببێت بە یارمەتیدەرو سەریەخستنی لە ناخۆشی و گیروگرفتەکان لەجیاتی کەس وکاری کەوا لە بچووکی یەوە لێی بێبەش بوو بوو ، لەبەر ئەوە عبدالله و هۆزەکەی پارێزگاری و بەرگری یان لە صوهەیب دەکرد

لەم ڕۆژەی دەستی ئەجەل گەیشتە (عبداللەی کوڕی جەدعان) صوهەیب بە تاك و تەنهایی مایەوە بەبێ کەس وکارو هۆز ...

بەڵام زۆری نەبرد ، تاکو بەزەیی خوا سێبەری کردو، خوای گەورە پێغەمبەری جیهانیان موحەممەدی ﷺ ڕەوانە کرد ، هەڵسا داوای لەخەڵکی مەککە کرد خودای گەورە بە تەنها بپەرستن ، دڵسۆز بن بۆ ئیسلام ، بانگەکەی بڵاوبوویەوەو کەوتە سەر زاری خەلکی مەککە لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەکان بە هەتا لە گەشت و سەفەرەکان باس دەکرا

صوهەیب گوێی لە پێغەمبەر و یاوەرەکانی بوو ، قورئانی پیرۆزیان دەخوێند ، ئەم بارانە بەهاری یە دڵی صوهەیبی گەشاندەوەو دڵی نەرم بووو سینگی جۆش درا دڵی ئاوی پاکی خواردەوە ، بە نهێنی بۆی دەرچوو بە نیازی ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەبی ئەرقەم ، بۆ ئەوەی کۆببێتەوە لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ یاوەرەکانی ، مسوڵمان بوونی خۆی ئاشکرا بکات ، کاتێك گەیشتە بەردەرگا ، بە عەماری کوڕی یاسر گەیشت

بە عەماری گووت :- چیت دەوێت ؟

عەمار گوتی :- دەمەوێ بچمە ژوورێ بۆ لای موحەممەدو گوێ لە قسەکانی بگرم .

صوهەیبیش گوتی :- منیش ئەمەم دەوێت

هەردووکیان چوونە ژوورەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ مسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاندو ، مسوڵمان بوون ، پاشان ئەم ڕۆژە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ مانەوە لە کاتی شەو بەنهێنی یەوە بۆی دەرچوون ، مسوڵمان بوونیان پاش سی وهەندێك پیاو بوو .

صوهەیب بە موسڵمان بوونی کەوتە قۆناغێکی نوێ لە قۆناغەکانی ژیانیدا ، بەم جۆرە خۆی دووچاری ئازاری قوڕەیش کرد لەبەر ئەوەی قوڕەیش هیچ ئارامیەکی نەما بەرامبەر بانگەکەی موحەممەد ﷺ کەوا ڕۆژ بە ڕۆژ لە پەرەسەندن دا بوو

هەر هۆزێك لە لایەن خۆیەوە دەستی کرد بە ئازاردانی ئەو موسڵمانانەی کە دەستیان دەگەیشتێ ، بۆ ئەوەی وازیان پێ لە ئایینەکەیان بهێنن ، بە تایبەتی ئەو بێکەس و بێهێزانەی هیچ هۆزێك نەبوو بەرگریان لێبکات و بیان پارێزێت ، نموونەی :-

( بیلال و ، عەماری کوڕی یاسرو ، باوکی یاسرو ، دایکی (سمَیە) کەوا هەردووکیان مردن لەژێر ئازارو ئەشکەنجەی قوڕەیش .

هەروەها نموونەی صوهەیبی کوڕی سینان ، کەوا پاش مردنی گەورەکەی (عبداللّەی کوڕی جودعان) بەتەنها مایەوەو . بێ کەس وکارو هۆز ، نەهێزی ما و نە توانا

ئەم چەوساوانە ، ئارامیەکی زۆریان گرت بەرامبەر ئەم هەموو ئازارەی قوڕەیش ، هەر سووربوون لەسەر ڕێبازەکەیان کەوا ئیسلام بوو ، لەگەڵ ئەم هەموو ئازارو ئەشکەنجەی تووشیان هات لەم ڕێگایە .... بەڵکو مردن بوو لە ڕێگای هەق

بەڵام کاتێك ناخۆشیچنگی بەم چەوساوانە هەڵچنی توولە ڕێگایان بەرامبەر باریك بووەوە ، یەکێك لەمانە (خەباب) چووە لای پێغەمبەر ﷺ لە کاتێکدا عەباکەی ڕاخستبوو لە ژێر سێبەری کەعبەدا ، بە پێغەمبەری ﷺ گوت :-

ئەی پێغەمبەری خوا : لەخوا بۆمان ناپاڕێیتەوە ئەم ئازارەمان لەسەر کەم بکاتەوە ؟!

( لە پێش ئێوە میللەتان هەبوون ، پیاویان دەگرت ، خاکیان بۆ هەڵدەکەند ، لێیاندەدا بە شانەی ئاسنین گۆشتیان لە ئێسکیان جیادەکردەوە ، مشاریان دەهێنا لەسەر سەریان دادەنا و دەیانکردن بە دوو لەتەوە ، وازیان لە ئایینەکەی خۆیان نەدەهێنا

سوێند بەخوا ئەم فەرمانە تەواو دەبێ و ، تاکو ڕێبوار لە (صنعاء) دەگاتە (حضرموت) ، لە هیچ ناترسێت تەنها لە خوا نەبێت یان گورگ لەسەر مەڕەکانی

لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە     بسم الله الرّحمن الرّحيم

﴿ الم ، أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون ، ولقد فتنا الذين من قبلهم فليعلمن الله الذين صدقوا و ليعلمن الكاذبين ﴾ (العنكبوت )(١،٢،٣)

پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسا بە هێنانەوەی نموونە بۆ دڵ دانەوەی موسڵمانان ، بەوانەی بڕواییان بوو بە پێغەمبەرەکانی پێشوو ، بەوەی تووشیان بووە لە ئازارو ئەشکەنجە لە لایەن نەتەوەکانیان بۆ ئەوەی ببن بە پێشەنگی ئارام گرتن و خۆگرتن بە هەق ...

کاتێك قورەیشییەکان نا ئومێد بوون لە گێڕانەوەی موسڵمانەکان لە ئایینەکەیانو ، تەنانەت بە هۆی ئازاردانیشیانەوە نەیانتوانی ڕێگا لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام بگرن .

ئەمجارەیان لە جیاتی ئەوەی یەك یەك ئازاریان بدەن ، پەنایان بردە بەر ئازاردانی بە کۆمەڵ ، نووسراوێکیان هەڵواسیو بەڵێنیان دا پەیوەندییەکان بپچڕێنن لەگەڵ نەوەی هاشم ، ژنیان لێنەهێننو ژنیان نەدەنێ و کڕینو فرۆشتنیان لەگەڵ نەکەن ، ئینجا ئەم نووسراوە بێویژدانەیان لە ناوەوەی کەعبە هەڵواسی ، بەمە نەوەی هاشمو موسڵمانان گەمارۆ دران وایان لێهات گەڵای داریان دەخوارد ، هەروەها بۆیان نەبوو تێکەڵاوی خەڵك ببن تەنها لە کاتی هاتنی حەج نەبێت ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ نوێنەرە عەرەبەکان دادەنیشت کەوا دەهاتن بۆ شاری مەککە بە مەبەستی زیارەت کردنی حەج ، داوای لێدەکردن بۆ باوەڕ بە ئیسلام بهێنن ، زۆر لە نوێنەرەکان دەهاتن بۆ لایو گوێیان دەگرت لە بانگەکەی و بڕواییان پێدەهێنا بە تایبەتی خەڵکی (یەثریب) کەوا پەیمانیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ دا ببن بە پەناو یاریدەدەری .

موسڵمانان دڵخۆش بوون بەم مزگێنییەو ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای دا بە موسڵمانان کە کۆچ بکەن بۆ شاری (یەثریب) شاری مەدینە ، بۆ ئەوەی بگەن بە براکانیان کەوا بڕواییان هێنابوو کۆچیان بۆ کرد ، بێجگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکرو عەلی کوڕی ئەبی طالیب و هەندێك لە هەژارە چەوساوەکان نەبێت لە پیاوو ئافرەت کەوا توانایان نەبوو کۆچ بکەن لە شاری مەککە مانەوە ، لە مانەی کەوا مانەوە صوهەیبی کوڕی سینان بوو – خوا لێی ڕازی بێت – ، ئەم پیاوە نەیتوانی لە شاری

مەککە دەربچێ بەڵکو بە ئارام گرتوویی مایەوە بەم ئازارو ئەشکەنجەی تووشی دەهات لە لایەن قورەیشەوە .
کاتێك قورەیش بینییان موسڵمانەکان بەم کۆچکردنە هێزیان پەیدا کردووە لەمە ترسان پێغەمبەری خوا ﷺ پێیان بگات ، ئەوە بوو پیلانی تیرۆریان بۆ دانـاوە هەموویان فەرمانی کوشتنیان دا ، خوای گەورەش فەرمانی کۆچ کردنی بە پێغەمبەری خـوا ﷺ دا ، بـەم جـۆرە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە مەککـە دەرچـوو ، ئەبوبـەکری صدیقیشی لەگەڵ خۆی برد -خوا لـێی ڕازی بێت - پاشان ( ئیمامی عەلی) -خوا لێی ڕازی بێت - گەیشت پێیان .
( صوهەیب )ی هەژاری بێکەس لەگەڵ چەند چەوساوەیەکی تر لە مەککە مانەوە ، شـەیدای گەیشـتنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـوون ، کـاتێك ( صوهـەیب ) مەککـەی بەجێهێشت چەند کەسێك لـە قورەیشـەکان بـە دوای کـەوتن بـۆ ئـەوەی بیگێڕنـەوە بـۆ مەککەو نەهێڵن کۆچ بکات ، کاتێك ( صوهەیب ) - خوا لـێی ڕازی بێت - ئەمانی بینی لەســەر ووشــترەکەی هاتــە خــوارەوە ، تیرەکــانی لــە جوعبەکــەی دەرهێنــا ، و پاشان گووتی :-
ئەی کۆمەڵی قورەیش :- ئێوە دەزان من لە هەمووتان بلیمەت ترم لە تیر هاوێشتن ، سوێند بەخوا ئێوە ناگەن بە من هەتا هەموو تیرەکانی ناو جوعبەکەم بۆتان بەڕێ نەکەم ، پاشان بە شمشێرەکەم شەڕتان لەگەڵ دەکەم ، ئینجا ئەگەر هیچ شتێکم لە دەست نەما چی حەز دەکەن ئەوە بکەن
ئەوانیش پێیان گووت :- هاتی بۆ ئێرە هەژارێکی نەداری بێ کەس بووی ، لە لای ئێمە موڵکت زۆر بوو و ، بەم موڵكو ماڵەی ئێمە گەیشتی‌یە ئەم ڕۆژە پاشان بە خۆتو بە ماڵت دەرچوویت ؟ سوێند بە خوا ئەمە نابێت وا بڕوات !
( صوهەیب ) پێی گوتن :-
ئەگەر بینی‌تان ماڵەکەم بۆ بەجێهێشتوون ڕێگام دەدەن ؟
گوتیان :- بەڵێ
ئەم ماڵەی کۆی کردبووەوە هەموو بۆ بەجێهێشتن .
تەنها نیو کیلۆ ئاردی بۆ بەجێما ، لە ڕێگـا کـردی بـە هـەویرو ئەمیشـی خـوارد ، برسیەتی تینی بۆ هێنا و چاوەکانی زەرد بوو تروسکایی تیا نەما ، لە (قوباء) گەیشتە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ( ئیمامی‌ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر ) دانیشتبوون - خوا لێیان ڕازی بێت - هەندێك خورمایان لەبەر دەستی بوو ، هەر لە دوورەوە دەستی برد بۆ خورمایەکەو خواردی لەبەر ئەوەی برسیەتی تینی بۆ هێنا بوو .
ئیمامی عومەر گوتی :-
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، نـابینی ( صوهـەیب ) خورمـا دەخـواو چاوەکانیشـی تروسکایی تیا نەماوەو زەرد بووە
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- ئایا خورما دەخۆیتو تۆ چاوەکانت زەرد بووە ئەی ( صوهەیب )؟
( صوهەیب ) گوتی :-
بەڵکو بەلای چاوە ڕاستەکەم دەیخۆم

پێغەمبەری خوا ﷺ و یاوەرەکانی زەردەخەنەیان بردەوەو ، پاشان ( صوهەیب ) ڕووی لە ( ئیمامی ئەبوبەکر )- خوا لێی ڕازی بێت - کردو گوتی :-
بەڵێنت پێدام لەگەڵ خۆت بمبەیت ، دەرچوویت و بەجێت هێشتووم .
پاشان ڕووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردو پێی گوت :-
بەڵێنت پێدام لەگەڵ خۆت بمبەیت دەرچوویت و بەجێت هێشتم ، پیاوەکانی قوڕەیش قەدەغەیان کردمو خۆم کڕییەوە بە ماڵی خۆم .
پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

﴿ ربح البيع أبا يحى ! ربح البيع أبا يحى ! ﴾

واتە :-( بازرگانیەکت قازانجی کرد باوکی یەحیا ، بازرگانیەکت قازانجی کرد باوکی یەحیا ) ..
پاشان صوهەیب گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، هیچم لەگەڵ خۆم نەبرد تەنها چەند مستێك لە ئارد نەبێت کردم بە هەویرو لە (ابواء) تاکو گەیشتمە لای تۆ
پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو :-
( صوهەیب قازانجی کرد ! صوهەیب قازانجی کرد ! )
(صوهەیب) لە دوای هەموو خەڵك گەیشتە مەدینە ، لە ڕێکەوتی نیوەی یەکەمی مانگی (ربیع الاول) ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە (قوباء) بوو صوهەیب لەگەڵ سەعدی کوڕی خەیثەمە دابەزی ، لەگەڵ چەند یاوەرێك لە یاوەرەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوا ڕەبەن بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ برایەتی خستە نێوان صوهەیب و (حارث کوڕی صمّە ) .
(صوهەیب) لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری هەموو جەنگەکانی بەدرو ئوحدو خەندەقو هەموو دیمانەکانی کردووە ، هیچ ساتێك بەدوا نەکەوت بۆ دەرچوون بۆ جیهاد لە ڕێگای خوا هەر کە جاڕی جیهاد لێدەدرا
لە جەنگی - بنی قریظة - لە موجاهیدە پێشەنگەکان بوو
لە ڕۆژی - بەیعەی رضوان - لە پەیمان دەرە سەرەتاکان بوو
لە جەنگی خەیبەر - لە پێشەوەی لەشکر بوو لەگەڵ جەنگاوەرەکان .
لە ڕۆژی - حونەین - یەکێك بوو لە چەسپاوەکان
هەر لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بوو تاپێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە پەروەردگار ، هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ مزگێنی بەهەشتی پێدا کەوا دەیفەرموو :-
﴿ أنا سابق العرب الى الجنّة ، و صهيب سابق الرّوم الى الجنّة ﴾
واتە :- من پێشەوای عەرەبم بۆ بەهەشتو ، ( صوهەیب ) پێشەوای ڕۆمەکانە بۆ بەهەشت
( صوهەیب ) باسی غەزاو جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ویاوەرەکانی بۆ خەڵك دەکرد کەوا کردبوویان دژی گاورو جولەکەکان ، صوهەیب ماڵی خۆی دەبەخشی و ، بە شمشێرەکەی شەڕی دەکردو ، تیر هاوێژی دەکرد
لەبەر ئەوەی (عومەری کوڕی خەتتاب) - خوا لێی ڕازی بێت - خۆشی دەویست بە خۆشویستنێکی بێ ئەندازەو هەموو کات شەویان بەیەکەوە دەبردە سەر .

کاتێك (ئیمامی عومەر) – خوا لێی ڕازی بێت – لە ژیان مابوو داوایان لێکرد یەکێك لە دوای خۆی هەڵبژێرێت بە ئەمیر بەڵام ڕازی نەبوو ، ڕۆژێك بەسەر مینبەر کەوت پاش حەمدو ستایشی خواو سەڵەوات لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی :–

(( ئەگەر مردم فەرمانتان پێ دەکەم بەم شەش کەسەی پێغەمبەریان بەجێهێشت و پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان ڕازی بوو ، ئەمانەش :–

( عەلی کوڕی ئەبی طالیب و ، زوبەیری کوڕی عەوامو ، عبدالرحمن کوڕی عەوف و ، عثمان کوڕی عەففان و طەلحەی کوڕی عبداللە و ، سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ) – خوا لە هەمووان ڕازی بێت –

پاشان گوتی :– من ئاگادارتان دەکەمەوە بەوەی لە خوا بترسن لە فەرمان کردنو ، دادپەروەری لە دابەش کردنی حوکم .

پاشان بە کۆمەڵی ڕاوێژی گوت :–

ڕاوێژ بکەن لە کاروبارتان ، ئەگەر دوو بە دوو بوون دوانیش بێ دەنگ بوون بگەڕێنەوە بۆ ڕاوێژ ، ئەگەر دووو بە چوار بوون ، بەشە گەورەکە هەڵبژێرن ، ئەگەر بیروڕاتان سێ بەسێ بوو پابەند بن بە کۆمەڵی ( عبدالرحمن کوڕی عەوف ) ، گوێتان لێ بێتو گوێ ڕایەڵ بن

کاتێك (ئیمامی عومەر) – خوا لێی ڕازی بێت – بریندار کرا بە کۆمەڵی ڕاوێژی گـــــوت :–

(( ئەگەر من مردم ( صوهەیب ) سێ نوێژتان بۆ بکات ، واتە ئەم سێ ڕۆژە هەر پێنج نوێژەکان ئەو ئیمامەتیتان بۆ بکات ، تاکو کۆمەڵی ڕاوێژ لەسەر ووشەیەك ڕێك دەکەون بۆ هەڵبژاردنی یەکێك ، پاشان هەمووتان بیروڕاتان بکەن بە یەكو موبایەعە بدەن بە یەك کەس )) .

کاتێك ( ئیمامی عومەر ) کۆچی دوایی کرد – خوا لێی ڕازی بێت – ( صوهەیب ) هەڵسا ئیمامەتی کردنی نوێژەکان ، کاتێك لاشەی ( ئیمامی عومەر ) دانرا ویستی نوێژی لەسەر بکات ، خەڵکەکە نەیانویست ( عەلی کوڕی ئەبی طالب ، یان عثمان کوڕی عەففان ) – خوا لێیان ڕازی بێت – پێش بخەن ، بۆ ئەوەی نوێژی لەسەر بکەن ، ( عبدالرحمن کوڕی عەوف ) گوتی :–

( صوهەیب پێش کەوە نوێژی لەسەر بکە ) (صوهەیب) پێش کەوتو نوێژی لەسەر تەرمی( ئیمامی عومەر) کرد –خوا لە هەمووان ڕازی بێت –

بەم جۆرە( صوهەیب ) هەموو ژیانی لە جیهادو تێکۆشان بەڕێکرد بە گیانوماڵیەوە لە ڕێگای خودای گەورە ، بەم جۆرە مایەوە تاکو بای ئەجەل یەخەی گرتو پێی گوت ئەی ( صوهەیب ) بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت ، خوا لێت ڕازییە ، بەم جۆرە لە مانگی شەوالی ساڵی سیو هەشتی کۆچی لە تەمەنی حەفتا ساڵی گیانی پاکی بە پەروەردگار سپارد – گەیشت بە بەهەشتی پانو بەرینو ، لە (بەقیع) ، لە مەدینەی شاری پێغەمبەری خوا ﷺ نێژرا ن سەلامی خودا لە پێشەوای ڕۆمەکان بۆ بەهەشت :–

صوهەیبی کوڕی سینانی ڕۆمی – خوا لێی ڕازی بێت –

*            *            *

٥٥

# عاصیم ﷺی
# کوڕی عەمروی تەمیمی

## فەرماندەی
## کەتیبەی ئەهوال

## ٥٥

# عاصیم کوڕی عەمروی تەمیمی
# فەرمانـــــدەی کەتیبـــەی ئەهـــــوال

( بەنو تەمیم ) لە نێو هۆزە عەرەبەکان بە ئازایەتیو سوارچاکیو بە هانا هاتنی خەڵكو پیاوەتی بەناوبانگ بوون ، بە دەوڵەمەندییەکی بێئەندازە و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی تر جیادەکرانەوە تاکو ساڵی (٩) نۆی کۆچی لە موسڵمان بوونیان دواکەوتن ، پاش ئەوەی خوای گەورە دەسەلاتی دا بە پێغەمبەرەکەی ﷺ لە دوورگەی عەرەبی ....

پاش جەنگی تەبوك ( عاصیم کوڕی عەمروی تەمیمی ) لەگەڵ چەند کەسێك لە هۆزەکەی بە نوێنەر هاتن بۆ مەدینەی منەوەرەو موسڵمان بوونی خۆیان ئاشکرا کرد .

هەروەك دەزانین جەنگی ( تەبوك )یش کۆتا جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ، ئیتر بەمە ( عاصیم) بەشی نەبوو ببێت بە خاوەنی شەرەفی ئەم جیهادە لەژێر ئالای پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری جەنگی گاوران بکات ....

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دەستێکی بالای هەبوو و ، خوای گەورە سەربەرزی کرد بە بەشداری کردنی جەنگی هەڵگەڕاوەکانو ڕزگارکردنی ناوچە مەزنەکان لە خاکی عێراق و فارس ....

کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد ، هەندێك لە هۆزە عەرەبەکان هەڵگەڕانەوە ، ( تەمیم )یش هۆزێك بوون لە هۆزە هەڵگەڕاوەکان ، بەلام خوای گەورە ( عاصیم ) و هاوڕێکانی لە هەڵگەڕانەوە پاراستو لە خراپە بە دوورکەوتن .... لەگەڵ ئەوەشدا فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ دامرکاندنەوەی ئەم ئاژاوەیە ...

( عاصیم) چووە ژێر ئالای ( خالیدی کوڕی وەلید) کەوا (ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ ڕەوانەی سەر هەڵگەڕاوەکانی کرد بوو ، ( عاصیم) لە جەنگە هەڵگەڕاوەکان شوێنێکی دیاری هەبوو جێگای خۆیکردەوە وەکو سوارچاکێکی ئازاو موجاهید ، گیانی خۆی دەخستە شوێنی مەترسیو ترسناك، لە خواش دەپاڕایەوە بەسەر دوژمنان زاڵی بکات ...

جگە لەمەش ...هەروەك فەرماندەیەك پشتیان پێ دەبەست بۆ دروست کردنی ڕاپەڕاندنی پیلانەکانو ، گیانی ئازایەتیو خۆ بە قوربانیدانیشی دەخستە دەروونی سەربازەکانی

لەبەر ئەم سیفاتە بەرزانە ... ( خالید ) ڕەوانەی عێراقی کرد لەسەر کۆمەڵێك لە سوارچاکانی موسڵمانان هەروەك هێزێکی پێشەنگ ، لە پێشەوەی سوپا بۆ پشکنینی ڕێگاو سەلامەتی بەکاری دەهێنانو، ئەو کۆسپانەی ڕێگای لادەبرد ، لەگەڵ خەریك کردنی دوژمن و بۆ چاوەڕێکردنی گەیشتنی هێزە سەرەکییەکە .

لە نێوان موسڵمانان و فارسەکان لە عێراق زۆر جەنگ ڕووی داوە ، لە هەموو ئەم جەنگانەش گەورەتر جەنگی ( المذار ) لە نێوان واسط و بەسرا تێیدا فارسەکان بەرگرییەکی مانو نەمانیان کرد .

وا ڕێکەوت ( خالیدی کوڕی وەلید ) جێشوێنی دیار بێتو داوای سەرۆکی فارسەکان بکات بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ، ئەویش بۆی چووە دەرەوەو ، فێڵێکی بۆ دروست کرد ، کەوا تیپێك لە فارسەکان بۆی بسوڕێنەوەو تیرۆری بکەن ، بەڵام هەندێك لە سوارچاکانی موسڵمانان هەستیان بەم جوڵانەوانە کرد ، چەند موجاهیدێکیان ڕەوانەی گۆڕەپانی جەنگ کرد بۆ پاراستنی ( خالید ) ، لە نێوان ئەوانە قارەمانی ئەم داستانەمان ( عاصیم کوڕی عەمرو ) بوو کەوا لە گۆڕەپان مایەوە ، ئەمیش داوای بەرامبەری کرد لە یەکێك لە ئەمیری فارسەکان بۆ جەنگ کردن ...

هەردوو قارەمان ( خالیدو عاصیم ) بە بەرامبەرەکانیان گەیشتنو ، بە شمشێر و ڕم شەڕیان کرد لەگەڵ هەموو کەرەستەکانی جەنگ ، پاشان ( عاصیم) توانی زاڵ بێت بەسەر ناکۆکەکەیی و بیکوژێت ، موسڵمانان ( لا الە الا اللە ) یان گووتو تەکبیریان لێدا ، بەمە فارس ترسو بیم گرتنی

موسڵمانەکان دەورەی حیرەیان داو گەمارۆیان دا ، پاشان هێڵی بەرگرییان شکاندو ڕزگاریان کرد ، خشڵو سامانێکی زۆریان بەدەست کەوت ....

جەنگ لە دەروبەری ئەنبارو عەین نەمرو ( دومة الجندل ) بەردەوام بوو ، خالید سوارچاکی خۆی ( عاصیم) ڕەوانەی سەریان کرد بۆ بە دیل گرتنی ئەمیرەکەیان ناوی ( ئوکیدەر کوڕی عبدالملك ) بوو کەوا زۆر جار ستەمی دەکرد لە موسڵمانان ، ئەمەش پێویست بوو تەمبێ بکرێو بە سزای موسڵمانان بگەیەنرێ بۆ ئەوەی ببێت بە پەندو عیبرەت بۆ ستەمکارانی تر ....

( عاصیم) توانی دیلی بکاو بەدەست بەسترایی بیبات بۆ لای ( خالید ) کە فەرمانی لەمل دانی دابوو .

( عاصیم) لە هەموو دیمانەکان سەلماندی کەوا سوارچاکەو بڕوا بە بلیمەتو بە توانایی دەهێنرا ، لەگەڵ ئەمەشدا ( عاصیم ) خاوەنی پیاوەتیو وەفا بوو چاکەی لەگەڵ ئەو کەسە دەکرد کەوا چاکەی لەگەڵ بکردبایە ، بە درێژایی ژیانی ئەمەی لەیاد نەدەچوو .

لە ڕۆژی جەنگی ( دومة الجندل ) هەندێك لە دوژمنان لە دەرەوەی قەڵاکە مابوونەوە ، ئەمەش لەبەر تەسکی شوێنەکە بوو ، لەمانەش بنو ( کلب ) کەوا پەیوەندییەکی برایەتییان هەبوو لەگەڵ ( عاصیم) ، ( عاصیم) بە نەتەوەکەی ( بەنی تەمیم )ی گوت :-

( ئەی نەوەی تەمیم) هاوپەیمانەکانتان ( کلب ) جێگایان بۆ بکەنەوەو پەنایان بدەن ، ئێوە ڕۆژێکی واتان بۆ ناڕەخسێ بۆ ئەوەی چاکەیان لەگەڵ بکەنو وەفاو پیاوەتی خۆتان لێی بهێننە جێ .

ئەم ڕێنماییانەی ( عاصیم) بووە هۆی ڕزگارکردنی نەوەی ( کلب ) لە کوشتن ، لەبەر ئەوەی (خالید ) فەرمانی کردبوو هەتا بە کوشتنی دیلەکانیشیان ، چونکە ؛ ئازارێکی زۆری موسڵمانانیان دابوو ، بەم جۆرە نەوەی (کلب ) پەنا دران لەبەر ئەوەی نەوەی ( عاصیم )و نەوەی ( تەمیم ) گرتیانە ژێر سێبەری خۆیان .

کاتێك ( ئەبوبەکری صدیق ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ فەرمانی کرد بە ( خالید ) ڕوو بکاتە ( شام ) ویستی ( عاصیم ) بکات بە هاوڕێی لەم کارەدا ، بەڵام ( المثنی کوڕی حارثەی شەیبانی ) پێشنیاری ئەوەی کرد کەوا ( عاصیم) لەگەڵ ئەو بمێنێتەوە بۆی ببێت بە پشتێك لەسەر دوژمنەکانی .

( عاصیم) لە عێراق مایەوە لەگەڵ ( المثنی ) بەشداری هەموو جەنگەکانی کرد بەبێ سستی و پشوودان .

لە جەنگی ( جسر ) وا ڕوویدا کە ( ابو عبید الثقفی ) شەهید بکرێ لەگەڵ چوار هەزار شەهیدو بریندارو خنکاو ، کە موسڵمانان تێیدا شکستیان خوارد ، هەرچی ( عاصیم) بوو لە دوای ئەوا مایەوە پارێزگاری لە سوپاکە کرد پاش گەڕانەوەی موسڵمانان بۆ جاری دووەم ، تاکو موسڵمانان لە ڕووبار پەڕینەوە و ، لە پاش ئەوان ( عاصیم) پەڕیەوە ...

لە جەنگی ( البویب ) ( عاصیم) فەرماندەی هێزی سوارچاکە سوکەکانی کرد ، ئەوانەی باریان لە وڵاخەکانی خۆیان هەڵنەدەگرت و بە تیژیو خێرایی وڵاخەکانیان تاو دەداو بە پێشەوەی سوپا دەکەوتن و ڕێگایان لە کۆسپ پاك دەکردەوە و ئاسانیان دەکرد .

پاش ئەوەی جەنگی ( البویب ) کۆتایی هات و فارسەکان شکستیان خوارد ، ( عاصیم) کەوتە دوایان ، یەکەم کەس بوو چووە ناو قەڵاکەیان لە ( ساباط ) .

پاشان بۆ جەنگی قادسیە ... جەنگی کۆتایی بۆ ڕزگارکردنی عێراق ...

پێش ئەوەی جەنگ دەست پێبکات گفتوگۆ دەستی پێکرد لە نێوان ( سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص ) و ( کیسرای یەزدجەرد ) ، سەعد چەند پیاوێکی لە موسڵمانان کەوا هەیبەت و قسەزان و بە جورئەت بوون ، یەکێك لەوانەی ڕەوانەی کرد بە نوێنەری خۆی ( عاصیم) بوو ، لە کۆتایی گفتوگۆکەدا کیسرا ڕقی هەڵسا لە گفتوگۆکەرە موسڵمانەکان بە پیاوەکانی خۆی گوت :-

کیسەك خۆڵم بۆ بهێنن و لە گەورەی ئەوانە باری بکەن ....

( عاصیم) ی بیر تیژو ئازا پێش کەوت ، بە ژیری خۆی لە ویستی کیسرا گەیشت و ، بە ئازایەتی خۆی بەرامبەرستەمی پادشا وەستاو گوتی :-

( من برای گەورەیانم و ... گەورەی ئەوانەم ) ، پاشان خۆڵەکەی بار کردە سەر ملی خۆی و بەرەو وڵاخەکەی ڕۆیشت و سواری وڵاخەکە بوو و خۆڵەکەشی لەگەڵ خۆی برد .

( سەعد ) دووسەد سوارچاکی ڕەوانەی نێوان دوو ڕووبار کرد سوپرانەوەیان لەم شوێنە کرد ( ڕۆستەم ) بەمەی زانی و چەند سوارێکی ڕەوانە کرد بۆ ئەوەی قەدەغەیان بکات ، کاتێك ( سەعد ) زانی وڵاخەکانی دوور کەوتونەتەوە ، کەوتینە بەر مەترسی ، ( عاصیم)ی ڕەوانە کرد بۆ ڕزگارکردن و پاراستنیان ، ئەوەبوو پێیان گەیشتن لە کاتێکدا کەوتبوونە شەڕ لە سوارچاکە مسوڵمانەکان ، هەر کە فارسەکان ( عاصم) و هاوڕێکانی بینی پشتیان هەڵکردو هەڵاتن ، موسڵمانەکان بە ڕزگارکردنی ئەم شوێنە و غەنیمە گەڕانەوە

کاتێك جەنگ لە نێوان موسڵمانان و فارسەکان لە جەنگی ( قادسیە) ڕوویدا ، لە ڕۆژی یەکەم دا ( عاصیم) جێگاو شوێنی بەدیارکەوت ، و گەورەترین هەڵوێستی نواند لە گۆڕەپانەکەو هیچ کەس نەیدەتوانی شان لە شانی بدا

پاش ئەوەی ( عاصیم) وتارێکی بۆ سوارچاکەکانی خۆیدا ئینجا ڕووی کردە گۆڕەپانی جەنگ ، ئەوە بوو پیاوێکی عەجەم لەبەر دەستی هەڵاتو ، ( عاصیم) کەوتە دوای تاکو ( عاصیم) کەوتە ناو ڕیزەکانی فارس ئەمجارەیان فارسێکی پێ گەیشت سواری بارگینێك ببو ، هەر کە ( عاصیم) بینی بارگینەکەی جێهێشت و هەڵات لەبەر ترس و هەیبەتی ( عاصیم) ( عاصیم)یش بارگینەکەی گرت و دایە دەست ( سەعد ) ...

پاشان موسڵمانەکان ڕۆیشتن ، فیلەکانی فارس لە ڕاست و چەپی لەشکر بەرەڵا کران ، وڵاخی موسڵمانان ترس و بیم گرتنی و لە شوێنی خۆیان نەجوڵان ، پیاوەکان بەبێ پاڵپشتی سوارچاکان بە تەنها مانەوە ...

( سەعد ) بینی هەڵوێستی موسڵمانان کەوتە بەر مەترسی ، بۆ ( عاصیم ) ڕەوانە کرد و پێی گوت : ( ئەی خەڵکی بەنی تەمیم ، ئایا ئێوە خاوەن ووشتر و وڵاخ نین ؟؟ ئایا هیچ چارەسەرێکتان نی‌یە بۆ ئەم فیلانە ؟ )

( عاصیم) گوتی :- بەڵێ ( سوێند بەخوا ) پاشان بانگی تیر هاوێژەکانی کرد لە هۆزەکەی فەرمانی پێکردن تیرهاوێژی فیلەکان بکەن بۆ پارێزگاری کردنی ئەم کۆمەڵەی فەرمانی پێ کردبوون بە بڕینی قایشی بن پشتی فیلەکان ، بەم جۆرە ( عاصیم) خۆی دەرچوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم پیلانە کەوا دەردێکی گەورەیان دابوو بە موسڵمانان ، بەم جۆرە ئەمجارەیان تەرازووی جەنگەکە بەلای ئەوان دا گران بوو .

بەڵام بۆ ڕۆژی دووەم ( قەعقاع کوڕی عەمرو )ی برای گەیشتە لایان بۆ هاوکاری کردنی موسڵمانان بۆ ئەوەی ئەم بارە گرانەیان لەسەر شانی سووك بکات .

ماوەی جەنگەکە چەند ڕۆژی خایاند ، هەموو ڕۆژێك قارەمانیەتی و ئازایەتی ( عاصیم) ئاشکرا دەبوو ، تا موسڵمانان سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا

کاتێك ( سەعد ) فەرمانی ڕزگارکردنی ( مەدائن )ی پایتەختی کیسرای دا ، پاشان جەنگی ( قادسیە ) پێویست بوو لە ڕووباری دیجلە بپەڕێتەوە ، هەروەها دەبوایە هێزێکی گیان لەسەر دەست و لە مردن نەگەڕاوە پێش ئەوان لە ڕووبار بپەڕێتەوە و پارێزگاری لەوانی تر بکات ، سەری سوپاکە بپارێزێ کە لە پاش ئەوان دەپەڕێتەوە ، ( سەعد ) گوتی :-

کێ دەست پێدەکا و ئەم دیوی ڕووبارمان بۆ دەپارێزێت ، بۆ ئەوەی خەڵك پێیان بگا و هیچ کۆسپێك نەیێتە ڕێگاکان لە دەرچوون ؟

( عاصیم) بۆی دەرچوو لەگەڵ شەش سەد کەس لە هێزە تایبەتی‌یەکان ، ڕۆیشتن تا گەیشتنە قەراغی دیجلەو ( عاصیم) بە هاوڕێکانی گوت :- ( کێ دێت لەگەڵ من بۆ ئەوەی پێش ئەوانی تر بچینە ناو ڕووبار و پارێزگاری لە ئەوانی تر لەم دیوی ڕووبار بکات ؟ ) شێست سوارچاك بۆی دەرچوون ، ئەوانەی کەوا ناوی ( کەتیبەی ئەهوال ) یان لێنرا ، ( عاصیم) ئەوانی کرد بە دوو کۆمەڵ ، جووت جووت ، پاشان پێشکەوت بۆ قەراغی ڕووبار و گوتی :-

( ئایا دەترسن لەم دڵۆپە ئاوە ؟ پاشان ئەم ئایەتی قورئانیەی خوێندەوە :-

﴿ وما كان لنفس أن تموت الا باذن الله كتابا مؤجلا ﴾

پاشان ولآخەکەی تاوداو ڕووباری بڕی ئینجا هاوڕێیەکانیشی لەگەڵی ، کاتێك فارسەکان بینییان ئەوانیش سوارچاکەکانی خۆیان بۆ ڕەوانە کردنو ئەوانیش وەك ئەوان ڕووباریان بڕی ...

لە ناوەڕاستی ڕووبار گەیشتن بە ( عاصیم ) و هاوڕێکانی ، ( عاصیم ) هاواری کردە سەر هاوڕێکانی و گوتی :- ( ڕمەکان ئامادە کەن ڕمەکان ئامادەکەن ، ڕووبەڕووی چاوی دوژمنان بیان هاوێن )

فارسەکان پشتیان هەڵکردو ، موسڵمانان بە دوایان کەوتن و زۆربەیان کوشتن ، ئەوەی ڕزگاریشی بوو بە بریندار ڕزگاری بوو ....

بەم جۆرە کەتیبەی ( ئەهوال ) یەکەم کەس بوون چوونە ناو مەدائن .

ئەمە بوو شوێنی سەربازی جەنگاوەر و سوارچاکی بێوێنەو ، قارەمانی نەگەڕاوە ، پاشان سەرۆکی ڕزگارکەر .

پاش ڕزگارکردنی ( نەهاوەند ) گەورەی بڕواداران ( عومەری کوڕی خەتاب ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ فەرمانی دا لەشکری موسڵمانان بچنە ناو هەموو ناوچەکانی فارس ، ئەوەبوو حەوت سوپایان ڕێکخست پەیمانیان لێوەرگیرا بەناو هەموو خاکی فارس دا بسوڕێنەوە ، ئینجا لە نێوان ئەم سوپایانەش سوپای ( سوجوستان ) بوو ئاڵاکەی درا دەست ( عاصیم ) فەرمانی پێکرا ببێت بە سەرکردە لەسەر خەڵکی بەسرا ، پاشان ( عبدالله کوڕی عومەیر ) یارمەتی بۆ ڕەوانە کرد لە هێزەکانی خەڵکی کوفە .

( عاصیم ) سەربازگەی لە نزیك بەسرا دانا ، تا هێزەکەی ڕێکخست و هەموو داواکارییە بەڕیوەبردنەکانی جێبەجێ کرد ، پاشان بۆ ئامانجەکەی کەوا ئازادکردنی ( سوجوستان ) بوو بەریکەوت ، ئەم شوێنەش لە ( خوراسان ) گەورەتربوو ، چونکە ویلاییەتێکی زۆری پێوە بەسترا بوو .

( عاصیم ) گەیشتە هێڵی بەرگری ( سوجوستان ) ، بەڵام ئەوان نەیانتوانی بەرگری بکەن بەڵکو کێشایانەوە بۆ ( زەرەنج ) کەوا گەورەترین قەڵاو شاریان بووو پایتەختی ( سوجوستان ) بوو ، موسڵمانان گەمارۆیەکی توندیان دانو ، کەتیبەکان چوونە ناو هەموو پارچەکانی ئەم ویلایەتە .

پاش ئەوەی گەمارۆ دراوەکان دڵنیا بوون درێژبوونەوەی ئەم گەمارۆیە زیان بە ناوچەکەیان دەگەیەنێت هیچ چاریان نییە تەنها ڕێککەوتن نەبێت ، ( عاصیم ) لەگەڵیان ڕێککەوت لەسەر چەند بەندێك لە نێوان هەردوولا

پاشان ( عاصیم ) بەڕێوەبردنی ئەم ویلایەتەی گرتە دەست ، کاری کرد لەسەر چەسپاندنی هێمنیو ئاسایش تێیداو ، بەم جۆرە بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتووی لێدەرچوو لەگەڵ فەرمانڕەوایەکی چاك ، هەروەك چۆن قارەمانێکی سوار چاك و فەرماندەیەکی ڕزگار کەر بوو ...

پاشان لە ساڵی حەقدەی کۆچی ( عاصیم ) کۆچی دوایی کرد ، پیرۆزترین و گەورەترین شوێنی لە بەهەشتی خوا گرت - ڕەحمەتی خوا - لە یاوەری بەڕێز ( عاصیمکوڕی عەمروی تەمیمی ) .

* * *

٥٦

# عبداللّەی ی کوڕی حوذافە

ئەو موجاهیدەی
نە ترس و نە ئارەزووی دونیایی نەیتوانی
لە ئایینەکەی پەشیمانی بکاتەوە

## ٥٦

# عبداللەی کوڕی حوذافە

## ئەو موجاهیدەی نە ترس و نە ئارەزووی دونیایی نەیتوانی لە ئایینەکەی پەشیمانی بکاتەوە

کاتێك ڕووناکی ئیسلام لە ئاسمانی مەککە بریسکایەوەو ، تیشکی گەیشتە هەموو ناوچەکانی دوورگەی عەرەبی، ( عبداللـە ) یەکێك بوو لە موسڵمانە سەرەتاو پێشەنگەکان ، خودای گەورە نیعمەتی گەورەی ئیمان و موسڵمان بوونی پێ بەخشی .....

( عبداللەی کوڕی حوذافەی قورەیشی سەهمی ) لە مەککە لە دایك و باوکی بەڕێز لە دایك بوو ، باوکی حوذافە ( کوڕی قەیسی کوڕی سەعدی کوڕی سەهمی قورەیشی سەهمی ) بوو ، دایکی ناوی ( تەمیمە کچی حورذان ) لە نەوەی ( بەنی حارث ) کوڕی ( عەبد منیات کوڕی کنانە ) بوو ....

( عبداللە ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ بەزۆر قۆناغی ئازارو ئەشکەنجەدا ڕۆیشت بەبێ ئەوەی کۆڵ بداو لاواز بێ و بکەڕێتەوە ، بەڵکو بە بیروباوەڕێکی پتەو ، ئارام گرتوو و ، چەسپاو لەسەر ئیمانەکەی مایەوە ...

هەروەها کاتێك ئازاری قورەیش توندتر بوو و ، دەستیان دەڕۆیشت لەسەر موسڵمانان و خەریك بوون بیانگێڕنەوە لە ئایینی خوا ....

پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای دا بە یارەوەرەکانی کۆچ بکەن بۆ حەبەشە دووجار لەم ماوەیەدا ، ( عبداللە ) لەگەڵ کاروانی یەکەم نەڕۆیشت ، ئێمەش نازانین چ هۆیەك بوو بە کۆسپ لە ڕێگادا ...

بەڵام بۆ جاری دووەم ( عبداللە )ش لەگەڵیان کۆچی کرد بە ( حەبەشە ) ، و لە ( حەبەشە ) مایەوە تاکو خوای گەورە ڕێگەی دا بە گەڕانەوەی ئەم یاوەرانە ، ئەم ڕۆژانە ڕۆژی فەتحی ( خەیبەر ) بوو .

هەرچەندە ( عبداللەی کوڕی حوذافە ) زۆربەی جەنگەکانی پێغەمبەری خوای ﷺ نەبینی ، بەڵام ئەمە وای نەکرد پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێزو لێهاتووی سەربازیی ، جیهادیی ( عبداللـە ) کەم بکاتەوە ، ئەوە بوو وەکو فەرماندەیەك لەسەر یەکێك لە تیپەکانی داینا ، هەروەها ( عبداللە ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ جیهادێکی گەورەو بەشداری‌یەکی بێوێنەی لە جەنگەکانی خەلافەتی ( ئەبوبەکری صدیق ) و خەلافەتی ( عومەری کوڕی خەتاب ) کرد _ خوا لێیان ڕازی بێت _ هەروەها ماندووبوون و ناخۆشی‌یەکی زۆری هاتە ڕێگا کاتێك بەدیل گیراو تاقیکرایەوە لە ئایین و لە بیروباوەڕو ئیمانەکەی

( عبداللّه ) موجاهیدێکی بڕوا بەتین و ئازاو چاونەترس بوو ، دەچووە ناوجەرگەی شەڕەوە بەبێ ئەوەی بزانێت ترس چی‌یەو تاکو بڵێیت چوست و چالاك بووە ....

ئەم موجاهیدە سیفەتی سەرکردەی سەرکەوتووی لێ دەهاتە جێ کەوا فەرمانی ڕێکخستنی پیلان و ڕاپەڕاندنی دەدا ، ئەم کارەش ببوە جێگای بڕوای پێغەمبەری خواو ﷺ خەلیفەکانی لە دوای خۆی . جگە لەم سیفەتە بەرزانەو ، خوڕەوشتە جوانانەو سەربازی بێ وێنانە ، جیادەکرایەوە لە یاوەرەکانی تر بە پیاوێکی ڕووخۆش و قسە بە نوکتە ، ڕووخۆشی‌یەکە وای کردبوو لە دەروونی هەموو یاوەرەکان خۆشەویست بێت ...

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە مالی خۆی دەرکەوت ، کاتی نیوەڕۆ بوو نوێژی نیوەڕۆی کرد ، کاتێك سەلامی دایەوە چووە سەر مینبەرو ، باسی ڕۆژی دوایی کردو ، ترساندنی لەم ڕۆژەو لە ناخۆشی‌یەکانی باسی نیشانەکانی بۆ کردن ، پاشان فەرمووی : -

(( هەر کەسێك حەز دەکات پرسیار لە شتێك بکات با پرسیار بکات ، سوێند بەخوا لە هەر شتێك پرسیارم لێبکەن ئەوا وەلامتان دەدەمەوە تا لەم شوێنە بم ))

لێرەدا وشەیەك لە دەمی ( عبداللّە ) دەرچوو _ خوا لێی ڕازی بێت _ بوو بە نوکتەیەکی بەبێ نیازو گالتەیەکی دلخۆشکەرو ، گوتی :-

باوکم کێیە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

( باوکت حوذافەیە) .

پێغەمبەری خوا ﷺ وەلامی دایەوەو دەشیزانی گالتە دەکات ، ئەم هەلس وکەوتەی لە ئەو دەزانی و ، هەستی کرد بەوەی پرسیارەکەی تەنها بۆ خۆشکردنی کۆڕەکەیە .

ئەم هەوالە گەیشتە دایکی و کاری لێکردو پێی ناخۆش بوو ئەم پرسیارەی کردووە ، لەبەر ئەوەی پرسیارەکە پەیوەندی بە خودی شەرەف و ناموسی ئەو هەیە .

کاتێك ( عبداللە ) گەڕایەوە مالەوەو پێی گوت :-

( ئەی کوڕم ، ئەمڕۆ قسەیەکت کردووە ، کە بووە بە هۆی ئیحراج و ناخۆشی بۆ دایکت ، چۆن دەبوو ، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ قسەیەکی تری کردبا ؟ واتە :-

ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بیفەرمووبا :- نازانم ، ئەم کاتە کارەکە چۆن دەبوو !

( عبداللە ) پێی گوت : - ( دەمویست ئەوەی لە دەروونمە دەریببڕم )

پاشان گوتی : - ( سوێند بەخوا ئەگەر بیگەیاندبام بە بەندەیەکی ڕەش شانازیم پێوە دەرکرد .

ناوەڕۆکی ئەم قسەیەی کۆتایی وای کرد زیاتر ( عبداللّە ) جێگای بڕوایی پێغەمبەری خوا ﷺ بێت و لێی جیانەبێتەوە .

وا ڕێکەوت پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر تیپێك دایبنێت و ، نامەیەکی دا دەست و فەرمانی پێکرد بیگەیەنێت بە موجاهیدەکانی پاش ئەوەی گەیشتنە شوێنێك خۆی بۆیان دیاری دەکات .

کاتێك ( عبداللّە) لەگەل پیاوەکانی گەیشتە ئەم شوێنە نامەکەی کردەوە و بۆ براکانی خوێندەوە ، ناوەڕۆکی نامەکەش فەرمانی دەکرد بە گوێڕایەلی تەواو بۆ برا گەورەیان .

هەر کە ( عبداللّە ) لە خوێندنەوەی نامەکە تەواو بوو ئەوە بوو شتێکی بە دڵدا هات و ، ئەم پیاوە لە کاتی ئاڵۆزیو تووندترین کات قسەی خۆشی بە دڵدا دەهات ، دڵی هاوڕێکانیپێ خۆش دەکرد ...

فەرمانی کرد بە پیاوەکانی پووشو چیلکەدار کۆبکەنەوەو ئاگری پێ بکەنەوە ، هەموویان بۆ ئەم کارە دەرچوون هەرچەندە شەویش بوو و بەبێ ئەوەی لەمەبەستی ئەم کارە بگەنو بزانن سەرکردەکەیان نیازی چی هەیە !! کاتێك پووش و چیلکەدارێکی زۆریان کۆکردەوە و ، ئاگریان پێ کردەوە ، ئاگرەکە گڵپەو بڵێسەی لێهەڵدەستاو بەرز دەبووەوە .

کاتێك ( عبداللّە ) بینی ئاگرەکە تینی زۆر بوو ، فەرمانی پێکردن خۆیان بهاوێننە ناویەوە ، ئەوانیش وەستان بە سەرسوڕمانەوە چی بکەن ؟؟

وایان لێهات هەندێکیان تەماشای هەندێکیان دەکردو سەرسوڕمانی دەموچاوی داگرتبوون ( عبداللە ) هاواری کرد و پێی گوتن :- پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەکردوون گوێڕایەڵیم بکەن ؟؟؟

کە فەرمووی :- هەرکەسێك گوێڕایەڵی ئەمیری خۆی بکات گوێڕایەڵی منی کردووە ؟

بێدەنگی هەموویانی داگرتو بەرۆکی گرتن ، بەڵام یەکێك لەوانە غیرەت گرتیو هێزی هاتەوە بەرو زمانی بەقسەهات و گوتی :-

( بڕوامان بە خوای نەهێناوەو بە دوای پێغەمبەرەکەی نەکەوتووین تەنها بۆ ئەوە نەبێت ڕزگاریمان بێت لە ئاگر ... ) .

( عبداللە ) هاواری کرد و گوتی :- ( من فەرمانتان پێدەکەم و مافی خۆمە بەگوێم بکەنو خۆتان بهاوێنە ناو ئاگرەکە ) .

برایەکانی ( عبداللە) هیچ چارەکیان نەما ئەوە نەبێت فەرمانی سەرکردە ڕابپەڕێنن هەندێکیان خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەوەی خۆیان فڕێ بدەنە ناو ئاگرەکە .

( عبداللە ) ڕێگای لێگرتن لەپێش ئاگرەکەو ، پێکەنی و گوتی (( دانیشن ... با لەگەڵتان پێبکەنم )) ئەوانیش وەستانو ترس و ناخۆشی لە دڵیان دەرچوو ...

ئەمانە چەند دیمەنێك بوون لە دیمەنە دڵخۆش کەرەکانی کەوا چەند سیفەتێك بوون ( عبداللّە )ی پێ جیادەکرایەوە لە یاوەرەکانی تر . ئەم یاوەرە خۆشەویستە لە کاتی ناخۆشی و هەڵوێستی ئاڵۆزیش جێگای خۆی دەکردەوە لە دڵی برایەکانی ، ئەم سیفەتانەش نەبوونە هۆی ئەوەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوور کەوێتەوە ، بەڵکو زیاتر خۆشیدەویستو لەخۆی نزیك دەکردەوە ...

پێغەمبەری خوا ﷺ چەند نیوێنەرێکی خۆی ڕەوانە کرد بۆ ( هیرقەل ) پادشای ڕۆمو کیسرا پادشای فارسو ( مقوقس ) گەورەی قیبتییەکان لە میسر بە چەند نامەیەك بانگهێشتی کردن بۆ سەر ئایینی ئیسلام و تێیدا گوتنی ( لا الە الا اللّە محمد رسول اللە )ی ئاشکرا بکەن .

( عبداللە ) هەڵبژێردرا بە هەڵگری نامە بۆ پادشای فارس و ئەویش بەبێ وەستان و بیرکردنەوە نامەکەی وەرگرتو تاکو گەیشتە ( مەدائین ) پایتەختی فارس ، لە کیسرا چووە ژوورەوە نامەکەی دایە دەست خودی خۆی ...

نامە بۆ کیسرا خوێنرایەوە ئەمەی تیابوو :-

(( بسم اللّه الرّحمن الرّحيم ... لە موحەممەد پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ كیسرا گەورەی فارس ، سەلام لەوانە بێت كە هیدایەت دەیانگرێتەوە و ، بڕوایان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەكەی و شایەدی دەدەن كەوا هیچ خوایەك نی‌یە بێجگە لە ( اللە ) نەبێت و موحەممەدیش بەندەو پێغەمبەری خوایەو ، من داوات لێ‌دەكەم بڕوا بەخوا بهێنی و ، من پێغەمبەری خوام بۆ هەموو خەڵك بۆ ئەوەی زیندووەكان بترسێنم و گاورەكانیش موستەحەقی ئاگرن ، ئینجا مسوڵمان بەو سەلامەت دەبیت ، ئەگەر پشتت كرد گوناهی ئاگرپەرستان لەسەر تۆیە ))

هەر كە نامەكە تەواو بوو كیسرا زۆر تووڕە بوو و ، نامەكەی پارچە پارچە كرد و وەڵامێكی زۆر ناشیرنی ( عبدالله ) ی دایەوە .

بەڵام موجاهیدی بڕواداری ئارامگرتوو لەسەر سووك پێكردنی لە ڕێگەی خوا ئارامی گرت و ، بە ڕێگای خۆیدا گەڕایەوە شاری مەدینەو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگادار كردەوە كیسرا چ كارێكی پێكردن .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :- (( اللّهم مّزق ملكه )) واتە :- پەروەرگارا موڵكی كاول بكەیت .

خوای گەورە دوعای پێغەمبەرەكەی ﷺ قبوڵ كردو ، لە كاتی خەلافەتی ( عومەری كوڕی خەتتاب ) _ خوا لێ‌ی ڕازی بێت _ خاكی فارس پارچە پارچە بوور كەوتە بەردەستی موسڵمانان و توانیان بە ئارەزووی خۆیان بە هەموو پارچەكانی وڵاتی فارس بسوڕێنەوەو ، بەهێزو بازوویان قەڵای بت پەرستی و ستەم گۆڕ بە گۆڕ بكەن

( عبدالله ) _ خوا لێ‌ی ڕازی بێت _ ڕۆژی حەجی ماڵ ئاوایی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرزی حەجی بەجێدەگەیاند ، پاش ئەوەی خەڵك لە عەرەفات دەرچوون بۆ ( مۆنا ) ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی بە ( عبدالله ) كرد بە خەڵك ڕابگەیەنێت :- هیچ كەسێك ئیمڕۆ بەڕۆژوو نەبێت ، ئەمەش شایەدی دەدات كەوا ( عبدالله ) جێگای متمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ بووە و بەردەوام لێ‌ی نزیك دەبووەوە .

پاش ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ كۆچی دوایی كردو ( ئەبوبەكری صدیق ) _ خوا لێ‌ی ڕازی بێت _ جڵەوی خەلافەتی گرتە دەست و جەنگی هەڵگەڕاوەكان دەستی پێ‌كردو ئاگری شەڕ خۆشبوو ، ( عبدالله ) _ خوا لێ‌ی ڕازی بێت _ یەكێك بوو لەم قارەمانانەی توایەوە بۆ ئایینی خواو بەرگری‌یەكی بێ‌ئەندازەی كرد لە ئایینەكەی ، تاكو كاروبار گەڕایەوە ئاستی خۆی

پاشان لەگەڵ لەشكری ئیسلام ڕووی لە ( قیسارییە ) كرد .

لە یەكێك لە جەنگەكان لەگەڵ ڕۆم و بە هۆی گەیشتنی ( عبداللّە ) بۆ ناو جەرگەی سوپای ڕۆم كەوتە بەر دەستی دوژمنان و بەدیل گیرا ، سەركردەی ڕۆم بەمەی زانیبوو چ ئازایەتیەك و سوارچاكی و خۆڕاگریەك لە ( عبدالله ) دا هەیە ، ویستی ئیمانەكەی تاقی بكاتەوەو پاشگەزی بكاتەوە لەئایینەكەی و پاشان بەكاری بهێنێت دژی موسڵمانان و كاری پێ بكات ، ئەوەبوو فەرمانی كرد ، لە بەندیخانە دەریبهێنن و بیهێننە لای ، كە هاتە لای پێ‌ی گوت :-

- ببە بە فەلە بەشت دەدەم لە موڵكی خۆم ، ( عبداللّە ) گاڵتەی پێ‌هات و ، قبوڵی نەكرد ، سەركردەی ڕۆم فەرمانی دا لەداری بدەن ، بەڵكو بترسێ ، هەرچی ( عبدالله )

بوو بە هیچ شێوەیەك ترس دای نەگرت ، لە كاتێك دا دەروو پشتی هەموو پێكرا بوو بە تیر ، لەسەر دارەكە دایانبەزاند ، ئەمجارەیان سەركردەی ڕۆم بیری لە پیلانێكی تر كردەوە بۆ ئەوەی ترس بهاوێتە دڵی ( عبدالله ) و ورەی بشكێنێ و كۆڵی پێبداو ، لە ئایینەكەی پاشگەزی بكاتەوە

ئەمجارەیان سەركردەی ڕۆم فەرمانی دا مەنجەڵێك ئاویان بۆ هێناو گەرمیان كرد تا كوڵاو بڵقی لێ هەڵسا ، پاشان فەرمانی كرد یەكێك لە دیلەكان بهاوێنە ناویەوە ، پاش ئەوەی خستیانە ناو ئاوەكە و دەریان هێنا ، گۆشت بە لەشییەوە نەمابوو تەنها ئێسك نەبێت ، ئەم كارەشیان لەبەرچاوی ( عبدالله ) كرد .

سەركردەی ڕۆم ئاوڕی لە ( عبدالله ) دایەوەو گوتی :-

ئەگەر نەبی بە فەلە دەتهاوێمە ناو ئەو ئاوە ...

( عبدالله ) گریا .... !!

سەركردەی ڕۆم وا گومانی برد ( عبداللە ) بەرگری نەماو ورەی ڕوخا ، لەوانەیە ئارەزووەكەی جێبەجێ بكات ، ئامادەبووان هاواریان كرد :- بەڕاستی ( عبداللە ) ترساو ... گریا ...

- ( عبدالله ) گوتی :-

(( وا مەزانن لەبەر ئەوە گریام لەبەر ئەم كارەیە كە پێم دەكەن و بترسم ، نەخێر ، بەڵام گریام لەبەر ئەوەی یەك گیانم هەیە لە پێناوی خودا ببیەخشم !! من حەزم دەكرد بە ژمارەی چەند موو لە لەشم هەیە ئەوەندە گیانم لەبەر بوایە ، ئەوەندە جار شەهیدتان بكردباما و ئەم كارەتان لەگەڵ بكردباما ))

سەركردەی ڕۆم بەم كارانەی ( عبدالله ) سەری سوڕما و حەزی دەكرد ئازادی بكات ، بەڵام نەیدەویست ئەم كارە بكات پێش ئەوەی فیزوكەورەیی خۆی بچەسپێنێت بەسەر ئەم بڕوادارە ئیمان بەرزەو كە قەناعەتی بە ئیسلام و ئایینەكەیەتی .

سەركردەی ڕۆم پێی گوت :- سەرم ماچ بكە ؛ ئازادت دەكەم

( عبدالله ) گوتی :- نایكەم ...

سەركردەی ڕۆم گوتی :- ببە بە فەلە ، كچەكەی خۆمت لێ مارە دەكەمو دەتكەم بە هاوبەش لە موڵكی خۆم - ( لە كاتێكدا كچەكەی زۆر جوان بوو گەورەكانی ڕۆم ئاواتیان دەخواست كە بیخوازن ، بەڵام سەركردەی ڕۆم ڕازی نەبوو بە كەسیان ) .

( عبدالله ) گوتی :- ئەم كارە ناكەم ...

سەركردەی ڕۆم پێی گوت :- سەرم ماچ بكە ، هەشتا موسڵمان لەگەڵ تۆ ئازاد دەكەم .

پاشان ( عبدالله ) سەری سەركردەی ماچ كرد و ، بەخۆیو بە هەشتا موسڵمانەوە ئازاد كران ، كاتێك چووە لای ( عومەری كوڕی خەتتاب ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ ( ئیمامی عومەر ) بۆی هەڵسایەوە و سەری ماچ كرد ....

پاشان هاوڕێكانی گاڵتەیان لەگەڵ دەكرد چونكە خۆی پیاوێكی ڕووخۆش بوو پێیان دەگوت :- سەری پیاوێكی گاورت ماچ كرد

ئەویش پێی دەگوتن :-

- خودای گەورە بەهۆی ئەم ماچ كردنە هەشتا موسڵمانی ئازاد كرد

( عبداللّـه ) _ خـوا لـێ ی ڕازی بێـت _ لەگـەڵ سوپای ( عـەمروی کـوڕی عـاص ) دەرچوو بـۆ میسـر ، بەشـداری گـەلێك جـەنگی کـرد ، لـە هـەموو جەنگـەکان نیشـانەی خۆڕاگری و ئازایەتی و غیرەت و پشت نەکردن لە دوژمنی ئـاشکرا دەبوو ، ئەمـەش وای لە ( عـەمروی کوڕی عـاص ) کرد زیاتر متمانـەی پـێ بکـات بـە هـۆی توانـا و زیرەکـی ئـەم پیاوەو ، هەندێك کاری گرنگی پێ بسپێرێ

پاش ئەوەی ( فسطاط ) رزگار کرا ، ( عبداللّه ) ڕووی لە شاری ( عین الشمس ) کرد بۆ ئەوەی ڕزگاری بکات ، کەوا سێ فەرسەخ لـە شـاری ( فسـطاط ) دوور بـوو لـە قـەراغی ڕووباری نیل ، گـەمارۆی شـارەکەی دا تـاکو زاڵ بـوو بەسـەر خەڵکەکـەو ئەوانیش ناچـار بوون داوای پێکهاتن بکـەن ، ئـەمیش لەگـەڵیان صـولحـی کـردو پێکـهاتن لەسـەر هـەمان مـەرجی ( عـەمروی کوڕی عـاص ) لەگـەڵ خـەڵکی ( فسـطاط ) ، ئینجا گەڕایـەوە شـوێنی خۆی لە سوپای ( عەمرو ) بە سەلامەتی و غەنیمەت و سەرکەوتوویی یەوە

( عـەمروی کوڕی عـاص ) ڕووی لـە ( ئەسـکەندەریە ) کـردو ڕزگـاری کـرد ، پاشـان ( عبداللّه )ی لە سـەربازگەیەکی بچووك بەجێهێشت لەبەر متمانـەو تواناى سـەرکردەیی ( عبداللّه ) و پیلان زانی و ڕێکخەری کاروبارو توانای هەڵس وکەوتی و زاڵ بوونی بەسـەر هەر تەنگ و چەڵەمەیەك کە تووشیان ببێت ...

( عبداللّه ) لە ئەسکەندەریە مایەوەو کاروباری ئەم شارەی ڕێکخست .

کاتێك هەندێك لە خەڵکی ئەسکەندەریە بینی یان ژمارەی موسڵمانان لـە سـەربازگەکە کەمە ئەمەیان بە هـەل زانـی بۆ ئـەوەی بۆ پادشـای ڕۆم بنووسـن و ، تێیـدا بـەم نهێنی یـە ئاگاداری بکەنەوەو ، داوای یارمەتی لـێ بکەن

ئـەویش بـەدەم داواکاری یەکـەیان هـات و بـارێکی دەریـایی بـۆ ئامـادە کـردن بـۆ گێڕانەوەی ئەسکەندەریە ، کە ژمارەیـان ( سـێ سـەد ) کەشتی بـوو ، هـەر کـە لـە ئاسـتی دەریا ئاڵاو کەشتی یەکان بینران ، ( عبداللّه ) هاوڕێکانی کۆکردەوەو ڕاوێژی پێ کردن ، بیروڕای وەرگرتن لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بەرگری نەکەن .

بە خێرایی ( عبداللّـه ) سـەربازگەی چۆڵ کرد و لەگـەڵ هاوڕێکانی بـەڕێ کـەوتن بۆ ( فسطاط ) ، هەواڵی ئەم ڕووداوەی دا بە ( عەمروی کوڕی عاص ) .

پـاش ماوەیـەکی کـەم دووبـارە موسـڵمانەکان ئەسـکەندەری یەیان ئـازاد کـردەوەو ، ڕۆمـەکانیان لـە ئەسـکەندەری یە دەرکـردو ئـاڵای ئیسـلام لەسـەر شـارەکە شـەکایەوە ، خەڵکەکە بەختەوەر بوون بە بەخششی ئیمان

بەم جۆرە ( عبداللّـه ) _ خوا لـێ ی ڕازی بێـت _ جیهادی گاورو دووڕوانـی کـرد لـە پێناوی خودادا ، لەم جەنگ بۆ ئەو جـەنگ و لـەم وڵات بۆ ئەم وڵات بـەبێ ئـەوەی درێغی بکات و کۆڵ بدا ، تا گیانی پاکی بەرز بووەوە بۆ لای پەروەردگار .

ڕەحمەتی خوا لە موجاهیدی یاوەری پێغەمبەری خوا ﷺ و سـەربازی کۆڵنـەدەرو ، دیلی ئارام گرتوو و ، سەرۆکی قارەمان ( عبداللّەی کوڕی حوذافە ) خـوای گـەورە لـێ ی ڕازی بێت ....

*   *   *

# ٥٧

# أم سـەلەمـە
# دایکـی موسـڵمانان

( أم سەلەمە ) ، ئایا دەزانن ( أم سەلەمە ) کێیە ؟!

باوکی ( أم سەلەمە ) یەکێك بوو لە گەورە ناودارەکانی مەخزومو ، یەکێك بوو لە سەخاوەتمەندەکانی عەرەب ، تا وای لێهات پێیان دەگوت :- ( زاد الراکب ) ) واتە :٠ خۆراکی ڕێبوار ، لەبەر ئەوەی ڕێبوار خۆراکی لەگەڵ خۆی هەڵنەدەگرت ئەگەر نیازی ماڵی ئەوانی هەبوایە ، یان لەگەڵ ئەودا بەڕێ بکەوتایە

( عبدالله کوڕی عبدالاسد ) هاوسەری ( أم سەلەمە ) یەکێك بوو لەو دە کەسەی کە لە سەرەتادا هاتنە ناو ئیسلام و ، ( ئەبوبەکری صدیق ) و چەند کەسێکی تر لە پێش ئەو بڕوایان هێنا کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران .

ناوی خۆی ( هند ) بوو ، بەڵام نازناوی ( أم سەلەمە ) ی پێدرا ، پاشان ئەم ناوەی کەوتە دوای‌و بەم ناوە ناسرا .

( أم سەلەمە ) لەگەڵ پیاوەکەی بوو بە موسڵمان ، ئەمیش بە یەکێك لەوانە دەژمێردرێت کە لە سەرەتاوە موسڵمان بوون

موسڵمان بوونی ( أم سەلەمە ) و پیاوەکەی بڵاوبووەوە ، وای لێهات قورەیش پێیان زانی و ڕق‌و قینی خۆیان هەڵگرن بەرامبەریان‌و دژایەتی‌یان بکەن ، بەڵام ئەمان بێ هێز نەبوون‌و پەشیمان نەبوونەوە لەسەر باوەڕەکەی خۆیان .

کاتێك ئازارو ئەشکەنجە تینی هێنا بۆ سەر موسڵمانان ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای دا بە یاوەرەکانی کۆچ بکەن بۆ حەبەشە ، ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکەی لە پێشەنگی کۆچکردووەکان بوون ....

( أم سەلەمە ) شاری مەککەی بەجێهێشت کە جێگای ڕەسەنی باوك‌و باپیرانی و خزم و کەس‌و کاری بوو ئەمەش تەنها لە پێناوی ڕەزامەندی خوا بوو کە بەسەر خۆشیەکانی دونیادا هەڵیبژارد .

لەگەڵ ئەوەی جێنشین بوونی ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکەی لەژێر پارێزگاری نەجاشی بوو -خوای گەورە لە بەهەشت ڕووی سپی بکات - ، بەڵام سۆزی بۆ مەککە کۆڵەگەی نیگا و ، خۆشەویستی‌یان بۆ سەرچاوەی هیدایەت لە دڵی ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکی باڵی گرتبوو ....

پاش ئەوەی دەنگو باس دەهات بۆ کۆچکردووەکان لە خاکی حەبەشە کەوا ژمارەی موسڵمانەکان لە مەککە زۆر بووەو ، مسوڵمان بوونی ( حەمزەی کوڕی عبدالمطلب ) و ( عومەری کوڕی خەتتاب ) بووە بە هۆی کەم کردنەوەی ئازار و ئەشکەنجەدانی موسڵمانان ، بۆیە کۆمەڵێك لە کۆچکردووەکان بڕیاریان دا بگەڕێنەوە بۆ شاری مەککە ، ئەم خۆشەویستیو سۆزی شاری مەککە پاڵی پێوەنان ئەم کارە بکەن ، ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکەی لە پێشەنگی ئەم کۆمەڵە دابوون

بەڵام زۆر بەخێرایی گەڕاوەکان بۆیان دەرکەوت ، کە بە موسڵمان بوونی( حەمزەی کوڕی عبدالمطلب ) و ( عومەری کوڕی خەتتاب ) گاورەکانی مەککە جارێکی ترو بەشێوەیەکی تر ئازای موسڵمانان بدەن کە جیاواز بێت لە جاری پێشوو .

لەو کاتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای دا بە یاوەرەکانی کۆچ بکەن بۆ مەدینە ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکەی بڕیاریان دا ، ببن بە یەکەم کۆچکردوو ، لە پێناوی بەجێهێنانی ڕوکنەکانی ئایینەکەیان بە ئازادی بژین .

بەڵام کۆچکردنی ( أم سەلەمە ) و هاوسەرەکەی ئەوەندە ئاسان نەبوو وەکو خۆیان خەیاڵیان بۆ دەبرد ، بەڵکو ناخۆش و زەحمەت بوو لە دوای خۆی خەمو کەسەرێکی وای بەجێهێشت هەموو جۆرە ناخۆشییەکی لە دوای خۆی دەتواندەوە

ئەم قسەیەش با بۆ خودی ( أم سەلەمە ) بەجێبهێڵین بۆ ئەوەی چیرۆکی ئەم خەمو پەژارەیەی کە تووشی بوو بۆمانی بگێڕێتەوە ، لەبەر ئەوەی خۆی لە هەموو کەس زیاتر هەستی بەم کارەساتە دڵتەزێنە کردووەو دەتوانی بە شێوەیەکی وردترو ڕوونتر بۆمانی بگێڕێتەوە ، چونکە کارەساتەکە بەسەر ئەو هاتووە .

( أم سەلەمە ) دەڵێت :-

کاتێك باوکی سەلەمە بڕیاری دەرچوونی لە شاری مەککەدا بۆ شاری مەدینە وشترێکی بۆ ئامادە کردم ، پاشان سواری وشترەکەی کردم ، سەلەمەی منداڵ لە باوەشم بوو ، دەستی کرد بە لێخوڕینی ووشترەکە و بەبێ ئەوەی بۆ شتێك بوەستێو چاوەڕوان بکات .

پێش ئەوەی لە مەککە جیاببینەوە هەندێك لە پیاوەکانی هۆزەکەم ( بەنی مەخزوم ) ئێمەیان بینیو ڕێگایان پێ گرتین و بە باوکی سەلەمەیان گوت :-

ئەگەر تۆ بە خودی خۆت بەسەر ئێمەدا زاڵ بوویت ، ئەی چی لەگەڵ خێزانەکەت دەکەیت ؟! ئەمە کچی ئێمەیە و ، چۆن ڕێگات پێ دەدەین لەگەڵ خۆت بیبەیتو ڕاپێچی کەی بۆ وولاتان ؟!

پاشان پەلاماریان بۆ هێنامو ، منیان لێ سەندەوە

هەر کە هۆزی هاوسەرەکەم ( بەنو عبدالاسد ) بینییان من و منداڵەکەیان برد ، زۆر تووڕە بوون و گوتیان :- نەخێر سوێند بەخوا ناهێڵین ئەم منداڵە لەلای کچی ئێوە بێت ، پاش ئەوەی بەزۆر لە پیاوی ئێمەتان سەندەوە ، ئەوە کوڕی ئێمەیە لە ئێمە نزیکترە

( ام سەلەمە ) دەڵێت :- پاش ڕاکێش ڕاکێشانی منداڵەکەم لە نێوانیان دا منداڵەکەم دەستی بە ئازاری پێگەیشت کەچیهەر بردیان

لە چەند ساتێکدا خۆم بە تەنیا و بێ هاوسەرو بێ منداڵ بینییەوە :- هاوسەرەکەم ڕووی لە شاری مەدینە کرد خۆی لەبەر دەستیان ڕزگار کرد ، منداڵەکەم ( بەنو عبدالاسد ) بە زۆر لەژێر دەستیان دەرهێنام و منیان لەلای خۆیان هێشتەوە بەتەنها لە ماوەی کاتژمێرێکدا

بەم جۆرە لەم ڕۆژەوە وام لێهات هەموو بەیانییەك دەربچم بۆ سەر ڕێگاو ، لەم شوێنە دابنیشم کەوا تووشی ئەم کارەساتە بووم ، ئەم دیمەنە خەمگینە بهێنمەوە بەرچاوی خۆم کەوا من و منداڵەکەم و هاوسەرەکەم لێك جیا بووینەوە ، جارجار دەگریام تا شەوم بەسەردا دەهات .

بەم حاڵەوە مامەوە نزیکەی ساڵێك تاکو پیاوێك لە نەوەی مامم بەلام دا تێپەڕیو حاڵی منی بینی ، خۆی بۆ نەگیراو بە نەوەی هۆزەکەمی گوت :- ئایا ئەم هەژارە بێ دەسەڵاتە ئازاد ناکەن ، لە هاوسەرو منداڵەکەتان دوور کردۆتوە .

ئیتر بەردەوام دڵی نەرم دەکردنەوە و سۆزی بە ئاگا دەهێنان ، تا ئەو کاتەی پێیان گوتم :- ئەگەر حەز دەکەی بڕۆ بۆ لای هاوسەرەکەت .

بەلام چۆن بگەم بە هاوسەرەکەم ئەو لە مەدینەیەو من لێرە و ، منداڵە جگەر گۆشەکەشم لای ( بەنی عبد الاسد )ە چۆن بەجێی بهێڵم ؟!

چۆن دڵم ئارام دەگرێو فرمێسکی چاوم ووشك دەبێتەوە ، من لە شوێنێك ئاوارەبم و منداڵە بچووکەکەم لە مەککە بێتو هیچی دەربارەی نەزانم .... !!!

چەند کەسێك بینییان من لە چ ناخۆشییەك و ئازارێك دام ، بۆیە داوایان لە ( بەنی عبدالاسد ) کرد کە منداڵەکەم بۆ بگەڕێننەوە ، ئیتر ( بەنی عبدالاسد ) منداڵەکە ( سەلەمە ) یان بۆ گەڕاندمەوە ...

حەزم نەدەکرد لە مەککە چاوەڕوان بکەم تاکو یەکێك بدۆزمەوە و سەفەری لەگەڵ بکەم ، من لەوە دەترسام شتێك ڕووبدات خەیاڵی بۆ نەبەمو ببێت بە کۆسپ لە ڕێگام بۆ گەیشتن بە هاوسەرەکەم ، لەبەر ئەمە پەلەم کرد و وشترەکەم ئامادەکرد و منداڵەکەم گرتە باوەشو دەرچووم بۆ شاری مەدینە بە نیازی گەیشتن بە هاوسەرەکەم ، جگە لە منداڵەکەم کەسی ترم لەگەڵ نەبوو .

هەر کە گەیشتمە ( التنعیم ) ( کە سێ میل لە شاری مەکە دوورە ) تا گەیشتم بە ( عثمان کوڕی طلحە ) گوتی :- بۆ کوێ ئەی کچی ( زاد الراکب )

پێم گوت :- نیازم وایە بگەم بە هاوسەرەکەم کە لە شاری مەدینە .

گوتی :- ئەی کەست لەگەڵ دا نییە ؟!

گوتم :- نەخێر تەنها خواو ئەم منداڵەم لەگەڵە .

عثمان گوتی :- سوێند بەخوا بەجێت ناهێڵم تا دەگەیتە مەدینە ، پاشان جڵەوی وشترەکەی گرتو بە پەلە بۆی دەرچوو ، سوێند بەخوا هاوڕێیەتی هیچ پیاوێکم نەکردووە لە ڕێگا لە ژیانم دا کە بەڕێزو بەشەرەف تر بێت لەم پیاوە :- کاتێك کە دەگەیشتینە شوێنێك بۆ حەسانەوە ووشترەکەی ( یخ ) دەکرد پاشان لێم دوور دەکەوتەوە ، تا لەسەر پشتی ووشترەکە دەهاتمە خوارەوە ، پاش ماوەیەك ئینجا نزیك دەبووەوەو بارەکەی بۆ دەهێنامە خوارەوە و ، ووشترەکەی دەبردە ژێر دارێكو دەیبەستەوە ، پاشان دوور دەکەوتەوە لەژێر سێبەری دارێك پاڵی دەدایەوە ، ئەگەر کاتی ڕۆیشتن بهاتایە ، دەهات بۆ لای وشترەکەو بۆی ئامادە دەکردم ، لێی نزیك دەکردمەوەو ، ئینجا خۆی دوور دەکەوتەوە دەیگوت :-

سواری ووشترەکە بە ، کاتێك سواری سەر پشتی ووشترەکە دەبووم و جێگای خۆم دەگرت ، دەهات جڵەوی وشترەکەی دەگرتو بەڕێ دەکەوت .

هەموو جارێك ئەم کارانەی دووبارە دەکردەوە تا گەیشتینە نزیك شاری مەدینە ، پاش ئەوەی کە گەیشتینە گوندی ( قباء ) یەکێك لە ئەوەی ( عەمروی کوڕی عەوف ) ، گوتی :- هاوسەرەکەت لەم گوندەیە ، پاش ئەوەی منیان برد بۆ لای هاوسەرەکەم ( عثمان کوڕی طلحە ) گەڕایەوە بۆ شاری مەککە .

خێزانە پەرش و بڵاوەکە لەگەڵ یەك کۆبوونەوە پاش ئەم ماوە درێژەی لێك جیا ببونەوە ، ( أم سەلەمە ) چاوی ڕوناك بووەوە بە گەیشتنی بە هاوسەرەکەی و ، باوکی سەلەمەش بەختەوەر بوو بە گەیشتنەوەی بە خێزانو منداڵەکەی ....

پاشان ڕووداوی یەك لە دوای یەك وەك بینایی چاو دەهاتە پێشەوە ....

ئەوە غەزای بەدرە ، باوکی سەلەمە بەشداری تیا دەکا لەگەڵ موسڵمانانو سەرکەوتنێکی بێ وێنە تۆمار دەکات ...

ئەمەش جەنگی ئوحدە ، پاش جەنگی بەدر دووبارە بەشداری تیا دەکات ، بە بەشداری‌یەکی یەکجار گەورە ، تێیدا گەورە دەبێت ، بەڵام لێی دەردەچێت بە برینداری‌یەکی سەخت ، بەردەوام چارەسەری دەکات تا وا دەزانێت برینەکەی ساڕێژ بووە ، بەڵام برینەکە لە ژێرەوە ئەوەندە نابات لێی زیاد دەکاو باوکی سەلەمە دەکەوێتە سەر جێگا

کاتێك باوکی سەلەمە چارەسەری برینەکەی دەکرا بە خێزانەکەی گوت :-

ئەی ( أم سەلەمە ) ، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو ، کاتێك موسڵمانێك تووشی کارەساتێك دەبێت ، دەگەڕێتەوە بۆیو دەڵێت :- پەروەردگارا لە لای تۆ پاداشتی ئەم کارەساتە وەردەگرم ، پەروەردگارا لە دوای ئەمە چاکترم بدەیتێ ، ئەوا خوای گەورە پێی دەبەخشێت

باوکی سەلەمە چەند ڕۆژێك بە نەخۆشی لەسەر جێگا مایەوە ، لە یەکێك لە بەیانی‌یەکان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵی خۆی سەردانی کرد ، هێشتا نەگەیشتبووە

بەر دەرگاکەیان ، باوکی سەلەمە گیانی پاکی بەخوای گەورە سپارد ، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی پیرۆزی هەردوو چاوەکانی باوکی سەلەمەی داخستو ، ڕووی لە ئاسمان کردو پاڕایەوەو گوتی :-

﴿ اللهم اغفر لابي سلمه ، وارفع درجته في المقربين واخلفه في عقبه في الغابرين ، واغفر لنا و له يا رب العالمين و افسح له في قبره ، نور له فيه ﴾

بەڵام ( ام سەلەمە ) ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خوای ﷺ بە بیر هاتەوە ئینجا گوتی :- پەروەردگارا پاداشتی ئەم کارەساتە لە لای تۆ وەردەگرم ، بەڵام دڵی نەهات بڵێت :- پەروەردگارا لە دوای ئەمە چاکترم بدەیتێ ، چونکە پرسیاری لە خۆی کرد کەسی باشتری نەدەناسی لە باوکی سەلەمە باشتر بێت بۆی ، بەڵام ئەوەندە نەماوە نزاکەی تەواو کرد ....

موسڵمانان زۆر دڵتەنگ بوون بەم کارەساتەی تووشی ( ام سەلەمە ) بوو ، بۆ کەسی تر ئەم جۆرە دڵتەنگ نەبوون ، نازناوی ( أيمّ العرب ) واتە ( بێ کەسی عەرەب ) هەروەك ئەوەی ( ام سەلەمە ) هیچ کەسوکارێکی نەبوو لە شاری مەدینە تەنها چەند منداڵێکی بچووك نەبێت .

کۆچکردوو یاریدەدەرەکان بە یەکەوە هەستیان کردبوو کە (ام سەلەمە ) مافی لەسەریانە ، هەر کە ماوەی (حدّە)ی تەواو بوو لە باوکی سەلەمە ، ئەبوبەکری صدیق _ خوا لێی ڕازی بێت _ ناردییە داخوازی بۆ خۆی بەڵام ( ام سەلەمە ) ڕازی نەبوو بە داواکەی ، پاشان ( عومەری کوڕی خەتتاب ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ ناردییە داخوازی دیسان ( ام سەلەمە ) ڕازی نەبوو ، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ناردییە داخوازی ئەویش پێی گوت :- ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من ئافرەتێکی بەغیرەتم دەترسم شتێکم لێ ببینی تووڕە ببیو خوای گەورە ئازارم بدات ، من ئافرەتێکی بە تەمەنم ، وە من ئافرەتێکم خاوەن منداڵم .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی سەبارەت بە غیرەتت لەخوا دەپاڕێمەوە کەوا یارمەتیت بدات ، وە سەبارەت بە تەمەنیشت ئەوەی بەسەر تۆ هاتووە بەسەر منیش هاتووە ، بەڵام سەبارەت بە منداڵەکانت ، منداڵی تۆ منداڵی منە ...

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ( ام سەلەمە )ی خواستو خوای گەورە دوعاکەی قبوڵ کردو ، لە دوای باوکی سەلەمە پیاوێکی چاکتری بۆ هەڵبژارد

ئەم ڕۆژەوە تەنها ئەم ناوە ( ام سەلەمە ) تەنها دایکی سەلەمە نەما بەڵکو بووە دایکی هەموو موسڵمانان نازناوی ( ام المؤمنين )ی لێنرا .

خوای گەورە دایکی سەلەمە بخاتە بەهەشتو لێی ڕازی بێت ، هەموو خێزانو کەسوکاری شەهیدە بەرزەکانی ڕێگای خواو ئیسلام شاد بکات بە ( ام سەلەمە ) ....

*   *   *

٥٨

# ( طوفەیل )ی کوڕی عەمـــرووی دەوســی شــەهیدو بـاوکی شــەهید

لە سەردەمی نەزانی‌یدا ( طوفەیلی کوڕی عەمرووی دەوسی ) گەورەی هۆزی دەوس بوو ، یەکێك بوو لە گەورەپیاوان و ناودارەکان و ، لە پیاوە خێرخوازە بەدەگمەنکان دەژمێردرا ، هەموو کاتێك دەرگای ماڵەوەیان کراوە بوو بۆ یارمەتی‌دانی‌لێ‌قەوماو ستەم لێ‌کراوو ڕێبواران.

لەگەڵ ئەمەشدا پیاوێکی ژیرو قسەزان بوو ، شاعیرێکی شارەزاو لێزان بوو.

شیعرەکانی هەستی مرۆڤی دەبزوواندو وشەکان سیحراوییانە کاریان لە هەست‌و نەستی مرۆڤ دەکرد.

هۆزەکەی ( طوفەیل ) لە ( توهامە ) دەژیان ، کە دەشتێکە لە قەراغ دەریای سوور ، ( طوفەیل ) لە ( توهامە ) بەرێ‌کەوت‌و بەرەو مەککە کەوتە ڕێ ، لەم کاتەدا ململانێ‌ی نێوان گاورەکانی قورەیش‌و پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پێ‌کردبوو ، هەر لایەنێکیان دەیویست لایەنگر بۆ خۆی دروست بکات‌و بیروباوەڕەکەی خۆی زیاتر سەربخات ، پێغەمبەری خوا ﷺ باوەڕە هەقەکەی ڕادەگەیاندو لە خوای گەورە دەپاڕایەوە سەری بخات ، گاورە قورەیشی‌یەکانیش بەرگری‌یان لە بیروباوەڕە ناهەقەکەی خۆیان دەکردو هەموو‌جۆرە فێڵێکیان بەکاردەهێناو ، بەرگری‌یان لە خەڵك دەکرد بۆ ئەوەی باوەڕ بە بیروباوەڕی پێغەمبەری خوا ﷺ نەهێنن.

بۆیە ( طوفەیل )خۆی لەناو ئەو بارودۆخە بینی‌یەوە و ، بەبێ ئەوەی خۆی بۆ ئامادەبکا و ، بەبێ ئەوەی هیچ نیازێکی هەبێت لەم بارودۆخەدا و ، بۆ ئەوەش نەهاتبوو خۆی تووشی ئەم بارودۆخە بکات ، با گوێمان لە (طوفەیلی‌عەمرووی دوسی ) بێت بزانین تووشی ئەو بارودۆخە بوو سەربردە سەیرو سەمەرەکانی چین‌و تووشی چ ڕووداوێك بووە ( طوفەیل ) بۆمان دەگێڕێتەوە دەڵێت :-

چووم بۆ شاری مەککە ، کە گەیشتمە شارو ، گەورە پیاوانی قورەیش منیان بینی ، پێشوازی‌یەکی گەرمیان لێ‌کردم‌و ، بەخێرهاتنێکی بێ‌ئەندازەیان کردم و ڕێزێکی زۆریان لێ‌نام و لە خۆشترین شوێن دایانبەزاندم ، پاشان هەموویان لێم کۆبوونەوە پێ‌یان گوتم :-

ئەی ( طوفەیل ) تۆ هاتووی بۆ وڵاتی ئێمە و ، ئەم پیاوەی داوایی پێغەمبەرایەتی دەکات ، کاروباری لێ ئاڵۆز کردووین و ، بوو بە هۆی لێك دابڕان‌و لێك ترازانی عەشیرەتەکەمان ، وە ئێمە لە گەورەیی تۆ دەترسین لەسەر هۆزەکەت هەروەك بەسەر ئێمە هاتووە ، هیچ گفتوگۆیەك لەگەڵ ئەم پیاوە مەکەو، هیچ شتێکی گوێ لێ‌مەگرە ، چونکە هەندێك قسەی هەیە وەك جادوو وایە ، نێوانی باوك منداڵ ، برا لەگەڵ برا ، ژن لەگەڵ مێرد تێك دەدا.

( طوفەیل ) دەڵێت :-
سوێند بەخوا ئەوەندە باسی ئەم هەواڵە سەیرو سەمەرانەی پێغەمبەریان کرد بە قسەو ڕەفتارەکانی تا وام لێهات بڕیار بدەم کە گوێ لە قسەکانی نەگرم‌ولێی نزیك نەکەومەوە.
بەیانی‌یەك زوو چوومە مزگەوت بە نیازی تەوافی کەعبەو بە پیرۆزگرتنی بتەکان کەوا طەوافمان بۆ دەکردن‌و بە پیرۆزمان دەزانی ، وە پەمۆیەکیشم لەناو گوێی خۆم نابوو بۆ ئەوەی گوێم لە پێغەمبەر نەبێت ئەگەر هات بۆ ئەوێ.
بەڵام هەر کە چوومە ژوورەوە بینیم پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێوە وەستابوو دیار بوو نوێژی دەکرد ، نوێژەکەی لەگەڵ نوێژی ئێمە زۆر جیاوازی هەبوو ، وە خواپەرستی‌یەکەی وەك خواپەرستی ئێمە نەبوو ، بۆیە دیمەنکەی سەرسوڕهێنەر بوو و سەرنجی ڕاکێشام ، بۆیە بەبێ ئیرادەی خۆم هەستم دەکرد لێی نزیك دەبمەوە ، کەم کەم لێی نزیك بوومەوە،ویستی خوا وابوو هەندێك لە قسەکانی بەرگوێم بکەوێت ،وشەکان هیچی خراپ نەبوون ، لە دڵی خۆم دا گووتم :-
دایکت ڕۆ ڕۆت بۆ بکات ئەی ( طوفەیل ) ، چاك و خراپت لێ ون نابێت ، تۆ پیاوێکی شاعیری و ، چ شتێك قەدەغەت ناکات لە گوێ کردنی قسەی ئەم پیاوە ، ئەگەر قسەیەکی خراپی بۆ کردی گوێی لێمەگرەو ، وازی لێ بهێنە.
( طوفەیل ) دەڵێت :-
لە کەعبە مامەوە تا پێغەمبەری خواﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ، بەدوای دا چووم تا گەیشتە ماڵەوە ، منیش لێی چوومە ژوورەوە ، گوتم ئەی موحەمەد :-
نەتەوەکەت ئەمەیان دەربارەی تۆ پێم گووتوە ، سوێند بەخوا بەردەوام منیان ترساندووە لە بیروباوەڕەکەت ، تا گوێی خۆمم بەلۆکە داخستوە بۆ ئەوەی گوێم لە قسەکانت نەبێت ، پاشان ویستی خوا وابوو هەندێك لە قسەکانت بەر گوێم کەوت ، کەچی هیچیان خراپ نەبوون .
بە پێغەمبەری خوام ﷺ گوت :-
بیروباوەڕی خۆتم بۆ ئاشکرا کەو ، ئەویش دەستی کرد بە خوێندنەوەی سوورەتی ( اخلاص‌و فلق ) ، سوێند بەخوا تا ئێستا قسەی لەوە چاکترم گوێ لێ نەبوو بوو ، وە هیچیان لە قسەی ئینسان نەدەچوو یەکسەر باوەڕم هێناو ، دەستم درێژ کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺو شایەدی ( أشهد ان لا اله الا الله و اشهد ان محمد رسول اللـه ) هێناو موسڵمان بووم

* * *

( طوفەیل ) دەڵێت :-
ماوەیەك لە مەککە بووم تا فێری ئەرکەکانی ئیسلام بووم‌و هەندێك لە سوورەتەکانی قورئانی پیرۆزم لەبەرکرد کاتێك بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ لای کەس‌و کارم ، گوتم :-
ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، من پیاوێکم هۆزەکەم بەگوێم دەکەن ، ئەوا دەگەڕێمەوە و بانگیان دەکەم بۆ سەر ئیسلام ، داوا لە خوا بکە نیشانەیەکم بداتێ ببێت بە یارمەتی‌دەرێك بۆ ئەوەی بانگی هۆزەکەمی بکەم ، ئەویش فەرمووی :-

پەروەردگارا نیشانەیەکی پێ ببەخشە .
( طوفەیل ) دەڵێت :-
دەرچووم لە مەککە بۆ ئەوەی بگەڕێمەوە بۆ لای کەس‌وکارەکەم ، تا گەیشتمە شوێنێك کە نزیکی ئاوایی بوو ، ڕووناکیەك لە نێوچەوانم پەیدا بوو دەتگووت چرایە ، گوتم :-
پەروەردگارا بیخەرە شوێنێکی تر جگە لە نێوچەوانم ، ترسام لەوەی کەوا گومان ببەن ئەمە توڵەی ئەوەیە کەوا وازم لە ئاینەکەی ئەوان هێناوەو ، بڕوام بە ئیسلام هێناوە .
( طوفەیل ) دەڵێت :- ڕووناکی‌یە گواسترایەوە کەوتە سەر سەری قامچیەکەم ، خەڵك تەماشای ئەم ڕووناکی‌یەیان دەکرد لەناو قامچیەکەم دەتگووت چرایەکی هەڵواسراوە ، من دەچووم بۆ لایان هەر کە لە وڵاغەکەم هاتمە خوارەوە ، باوکم بۆ لام هات ، پیاوێکی بەساڵاچوو بوو ، پێم گوت :-
لێم نزیك مەکەوە ئەی باوکە من لەتۆ نیم‌و تۆش لە من نیت .
ئەویش گوتی :- بۆچی کوڕم ؟!
گوتم :- من موسڵمان بووم و بە دوای ئایینی موحەممەد ﷺ کەوتم .
باوکم گوتی :- ئەی کوڕم ، ئایینی من ئایینی تۆیە .
پێم گوت :- بڕۆ خۆت بشۆرەو جل‌وبەرگت پاك بکەرەوە ، پاشان وەرە تاکو ئەوەی فێری بووم فێرت بکەم ، ئەویش ڕۆیشت‌و خۆی شۆری و جل‌وبەرگی پاك کردەوە ، پاشان هات ، ئیسلامم بۆ ڕوون کردەوە ئەویش موسڵمان بوو .
پاشان خێزانەکەم هات بۆ لام .
پێم گوت : - لێم نزیك مەکەرەوە ، من لە تۆ نیم‌و تۆش لە من نیت .
گوتی :- بۆچی !! دایك‌و باوکم بە قوربانت بێت .
گوتم :- ئیسلام من‌وتۆی لێك جیاکردۆتەوە ، من موسڵمان بووم باوەڕم بە ئایینی موحەممەد ﷺ هێناوە .
گوتی :- ئایینی من ئایینی تۆیە .
پێم گوت :- بڕۆ لە ئاوی ( ذی الشّری ) خۆت پاك بکەرەوە ، ( ذی الشّری ) بتێکی هۆزی دەوس بوو لە دەورەی ئاوێك بوو لە چیا هەڵدەقوڵا .
پێی گوتم :- دایك‌و باوکم بە قوربانت بێت ، من لە ( ذی الشّری ) دەترسم ئەگەر ئایینم بگۆڕم ؟؟!!
پێم گوت :- بڕۆ لەم شوێنە دوور لە خەڵك خۆت پاك بکەرەوە ، من دڵنیام لەوەی کە ئەم بەردە کەڕوڵاڵە هیچی پێ ناکرێت ، ئەویش ڕۆیشت‌و خۆی پاك کردەوە ، پاشان هات بڕوای بە ئیسلام هێنا‌و موسڵمان بوو ، پاشان بانگەوازی هۆزی دەوسم کرد بۆ ئەوە باوەڕ بە ئیسلام بهێنن‌و موسڵمان بن ، کەم کەس بەدەم بانگەوازەکەمەوە هاتن ، تەنها ( ئەبو هریرە ) نەبێت لە هەموو خەڵك بەپەلەتر بڕوای هێنا‌و موسڵمان بوو .
( طوفەیل ) دەڵێت :-
چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە ، (ئەبو هریرە)شم لەگەڵ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم :- چیت کردووە ئەی ( طوفەیل ) ؟
گوتم :- چەند دڵێکی کلیل دراو بێ فەرمانی‌یەکی زۆر ، خراپەو یاخی‌بوون بەسەر دەوس زاڵ بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵسایەوەو دەست نیوێژێکی گرت‌و نوێژێکی کردو ، پاشان دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە .

ئەبوهریرە دەڵێت :- کاتێك وام زانی دوعا لە نەتەوەکەم دەکات و تووشی هیلاکەت دەبن ، بۆیە گوتم :- خاکتان بەسەر میللەتەکەم ...!!
بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هات و فەرمووی :-
(( اللهم اهد دوسا ، اللهم اهد دوسا ، اللهم اهد دوسا ))
واتە ( سێجاران فەرمووی پەروەردگارا هیدایەتی دەوس بدە .
پاشان ئاوڕی لە ( طوفەیل ) دایەوەو فەرمووی :-
بگەڕێرەوە بۆ لای نەتەوەکەت و لەگەڵیان بە بەزەییانە ڕەفتار بکەو بانگیان بکە بۆ ئەوەی باوەڕ بە ئیسلام بهێنن .
( طوفەیل ) دەڵێت :- گەڕامەوە بۆ لای نەتەوەکەم و لە دەوس بانگەهێشتی ئیسلامم دەکرد تا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە ، بەدرو ئوحدو خەندەق بەسەر چوو ، هەشتا ماڵ لە هۆزی دەوس لەگەڵم هاتن بۆ دیداری پێغەمبەر و ﷺ موسڵمان بوون ، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵی خۆش بوو بە دیتنی ئەم موسڵمانانە ، بۆیە لە دەسکەوتەکانی غەزای خەیبەر بەشی ئێمەشی دا
گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ :-
لە لای ڕاستی سوپامان دابنێ لەهەر غەزایەك کە دەکرێ ، و شیعارمان بکە بە(مبرور)
( طوفەیل )دەڵێت :-
پاشان ئەوەندە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ نەماینەوە تا خوای گەورە شاری مەککەی بۆ ڕزگار کردین ، گوتم :- پێغەمبەری خوا ﷺ بمنێرە بۆ لای ( ذو الكفين ) ( کە بتێکە لە بتەکانی عمروی کوڕی حەمەمە ) تا بیسووتێنم ، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگای دام ، بۆیە لەگەڵ کۆمەڵێك لە نەتەوەکەم کە موسڵمان بوون ڕۆیشتم ، کە گەیشتمە لای بتەکەو ویستم بیسووتێنم ، کۆمەڵێك پیاو ئافرەت و منداڵ لە دەورم کۆبوونەوە ، چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد خراپەیەکم تووش ببێت ، وایان دەزانی بروسکێك لێم دەدا ، چونکە نیازی سوتاندنی ( ذو الكفين )م هەیە . پاشان لەبەر چاوی ئەو خەڵکە گڕێکم لە ( ذو الكفين ) بەرداو لەگەڵ سووتاندنی ئەم هۆنراوەیەم دەگووتەوە :-

يا ذا الكفين لســت من عبادكا
ميــلادنا أقـدم من ميـــلادكا
أنی حشـوت النار فـي فـؤادكا

پاش ئەوەی کە ( ذو الكفين ) سوتاو خەڵکەکە بینییان هیچ ڕووی نەدا بۆیان ڕوون بووەوە کە بێ دەسەڵاتە ، بۆیە باوەڕیان بە ئیسلام هێناو هەر هەموویان موسڵمان بوون .
( طوفەیلی کوڕی عەمروی دوسی لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دابوو ، تا ئەو کاتەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، کۆچی دوایی کردو بە خوای گەورە سپارد
کاتێك لە پاش پێغەمبەری خوا ﷺ کە ( ئەبوبەکری صدیق ) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ بوو بە خەلیفە ( طوفەیل ) خۆی و کوڕەکی گوێڕایەڵی خەلیفەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون .

هەرکە جەنگی هەڵگەڕاوەکانیش دەستی پێکرد ( طوفەیل وکوڕەکەی عەمرو )وەك موجاهیدێك بەشدارییان کرد کە هەڵگەڕاوەکان بە سەرۆکایەتی موسەیلەمەی درۆزن شەڕیان دەکرد

کاتێك بەرێکەوتن لەڕێگای یەمامە خەونێکی بینی ، بەهاوڕێکانی گوت :-

من خەونێکم بینیوە تەفیسرەکەیم بۆ بکەن .

گوتیان :- چیت بینیوە ؟

گوتی :- بینم سەرم تاشراو ، پاشان باڵندەیەك لە دەمم دەرچووو ، ئافرەتێکیش منی خستە ناو سکی خۆی ، هەروەها کوڕەکەم ( عەمرو ) هەوڵێکی زۆری دا بەلاَم بێ سوود بوو نەگەیشتە لای من .

هاوڕێکانی گوتیان :-

چاکەیە ، ئەویش گوتی :- بەلاَم من - سوێند بە خوا - وا تەفسیرم کردووە :-

سەرتاشینەکە ، ئەمەیە سەرم دەبڕرێت ، هەرچی باڵندەکەیە کەوا لە دەمم هاتە دەرەوە ئەمە گیانمە ، هەرچی ئەو ئافرەتەیە کەوا منی خستە ناو سکی خۆی ئەوە زەوییە بۆم هەڵدەکەندرێ و تێیدا بەخاك دەسپێرێم ، لەخوا دەپاڕێمەوە کەوا شەهید بکرێم .

بەلاَم داوای کوڕەکەم بۆ من ، ئەوە مانای ئەوەیە داوای شەهادەت دەکات کەوا بەمن دەبەخشرێ - ئەگەر خوا ڕێگا بدات - بەلاَم لەدواییدا پێی دەگات .

لە جەنگی یەمامە ئەم یاوەرە بەڕێزە ( طوفەیل ی کوڕی عەمروی دەوسی ) بەشدارییەکی مەزنی ئەم جەنگەی کرد ، تا برینداریەکەی بێهێزی کردو دەستی ڕاستی بڕایەوە ، گەڕایەوە بۆ شاری مەدینە ، پاش ئەوەی لە دوای خۆی لەسەر خاکی یەمامە باوك و دەستێکی بەجێهێشت .

لە خەلافەتی ( عومەری کوڕی خەتتاب ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ جارێکیان خەڵك لەلای ( ئیمامی عومەر ) دانیشتبوون و( عەمروی کوڕی طوفەیل )یش ئامادەبوو ، خواردنیان بۆ فاروق هێنا ( عومەری کوڕی خەتتاب ) داوای لە خەڵکەکە کرد کە نان بخۆن ، ( عەمرو ) خۆی دوورە پەرێز گرت و دوور کەوتەوە

( ئیمامی عومەر ) گوتی :- چییە ئەی عەمرو ؟

لەوانەیە دواکەوتوویی لە خواردن لەشەرمی دەستت بێت .

ئەویش گوتی :- بەڵێ ئەی گەورەی بڕواداران .

( ئیمامی عومەر ) گوتی :-

سوێند بەخوا تامی ئەم خواردنە ناکەم تا بە دەستە بڕاوەکەت تێکەڵی نەکەیت و دەستت لەناو نەگێڕی ، سوێند بەخوا هیچ کەسێك لەم خەڵکە بەشێکی لە بەهەشت نییە جگە لە تۆ (( لێرەدا مەبەستی دەستە بڕاوەکەی (عەمرو ) بوو )) .

بەم جۆرە ( عەمرو ) هەر چاوەڕێی شەهیدی دەکرد ،لەم ڕۆژەوە کە لە باوکی جیاببوویەوە ، کاتێك غەزای یەرموك هاتە پێشەوە ، ( عەمرو ) خۆی ئامادەکرد لەگەڵ موجاهیدەکان ، لە گەرمەی شەڕ شەهید کرا هەروەك باوکی پێشتر شەهید بووبوو ...

ڕەحمەتی خوا لە ( طوفەیل ی کوڕی عەمروی دەوسی ) بەڵێ شەهید بووو بوو بە باوکی شەهید

* * *

## ٥٩
# سەمورەی کوڕی جوندب
# موجاهیدێکی بێباوک

ئەگەر لێرەدا داب و نەریتێکی هەڵە هەبێت لە لایەن هەندێ کەسەوە ، کە ئەویش بەسووك تەماشاکردنی بێباوکانە ، کە دایکان گرتوویانە خۆیان و پەروەردەیان دەکەن ، پاشان هەندێ کەس بەکەم تەماشایان دەکەن و بە پەروەردەکراوی ژنانە ناویان دەبەن ، ئەم جۆرە کەسانە بەم کارەیان کە گومانی خراپەیە ، زیاتر چارەنووسی ئەم بێباوکانە دەخەنە مەترسییەوەو ، جاری واهەیە وا لە دایکەکەش دەکەن کە شوو بکات بە پیاوێکی تر .

بەڵام مێژووی پڕ سەروەری دادپەروەری ئیسلام ، هەندێك نموونەی چاکمان لەم بێباوکانەمان پێشکەش دەکات ، کەوا پاش ئەوەی باوکیان نەماوە، دایکیشیان شووی کردۆتەوە ، لەگەڵ ئەمەش پەروەردە کراون بە جوانترین شێوەو ، لە ژێر سێبەری کۆمەڵگای ئیسلامی شوێن دەستیان دیار بووە لە قارەمانیەتی و پیاوچاکی و ، هەروەها لە گۆڕەپانی خۆبەخت کردن و قوربانی دان دا

یەکێك لەم بەڕێزانە یاوەری بەناوبانگ ، باوکی سلێمان (سەمورەی کوڕی جوندوبی کوڕی هیلال کوڕی حەریجی فەزاری ) کەوا کاتێك باوکی مرد بچووك بوو ، دایکی پەروەردەی کرد ، کە ئافرەتێکی موسڵمانی بڕوادار بوو ، لەگەڵ کوڕەکەی کۆچیان کرد بۆ شاری مەدینە ، لێرەدا بەرەنگاری نارەحەتی ئاوەرەیی و بێوەژنی و یەتیم بەخێوکردن بوو ، بەڵام خوای گەورەو بەبەبەزەیی و بەخشندەی ، دڵی پیاوێکی بۆ رەخساند ، بوو بە هاوسەری و سەرپەرشتیکاری هەموو کاروباری دەکردو ، هەروەها چاودێری کوڕەکە ( سەمورە)ی دەکرد پەروەردەی دەکرد .

ئەوەوی لەم بارەیەوە دەڵێت :- (( باوکی مردو ئەو بچووك بوو واتە ( سەمورە) ، دایکی لەگەڵ خۆی بردی بۆ مەدینەو ، ئەنصارییەك دایکی خواستو ، ( سەمورە) پەروەردەکرد تا گەورە بوو )) ... ئەم ئەنصارییەش ناوی ( موڕی کوڕی سینان ) بوو ....

کاتێك ( سەمورە ) چاوی بە دونیای جیهادو تێکۆشان هەڵێنا هێشتا گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بوو کە تەمەنی پیرۆزی لە (١٠) ساڵ تێنەدەپەڕی ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بەزەیی بەم خونچە گوڵە تازە دەهاتەوە بۆ کاتی خۆی بۆ کاتی خۆی باسی دەکردن و بۆ موسڵمانانی دەگێڕایەوە - هەروەك سیرەی پیرۆزی بۆمان دەگێڕێتەوە - تا تەمەنیان دەگەیشتە پازدە ساڵان ...ئەوە بوو جەنگی ( ئوحد ) هاتە پێشەوەو ، بینیمان چۆن گەنجی تازەلاو ( رافیع کوڕی خەدیج ) توانی ڕێگای لە پێغەمبەری خوا ﷺ

وەربگرێت و بەشداری جەنگ بکات ، لەگەڵ بچووکی تەمەنی ، چونکە تیرهاوێژێکی چاك بوو .

لێرەدا (سەمورە کوڕی جوندب) ئەم دەرفەتەی قۆستەوەو ، بەخێرایی چووە لای زڕباوکەکەی و پێی گوت :-

پێغەمبەری خوا ﷺ رێگای داوە بە ( رافع کوڕی خەدیج)و ، منی گێڕاوەتەوە ، لە کاتێك من زۆرانبازی لەگەڵدا بکەم بە زەوی‌دا دەدەم !

زڕ باوکەکەی چووە لای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی پێ‌گوت ، لەوانەیە هەندێك یاوەریش بەشداری ئەم گفتوگۆیەیان کردبێت ...

( سەمورە ) هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و ، گوتی :- ئەی پێغەمبەری خوا ، رێگات بە ( رافیع ) داوە و منیشت گەڕاندۆتەوە ، ئەگەر زۆرانبازیم لەگەڵ بکات بەزەوی دا ئەدەم !

پێغەمبەری خوا ﷺ سەری سوڕما لەم ئازایەتی‌یە نوێیەو ، رێگای بە ( سەمورە ) دا زۆرانبازی لەگەڵ ( رافع ) بکا ، ( سەمورە) سەرکەوت بەسەر ( رافع ) ، بەڵام ( سەمورە) نەیدەویست ئازایەتی و سەرکەوتنی خۆی نیشان بدات ، تەنها مەبەستی ئەوە بوو بگات بە گۆڕەپانی جیهادو پەرۆشی ئەوە بوو رێگای پێ‌نەدراوە .

( السخاوی ) لە پەرتوکەکەی ( التحفە اللطیفة ) دەڵێت :-

((پێغەمبەری خوا ﷺ تەماشای منداڵە ئەنصاری‌یەکانی دەکرد ، منداڵێك بەلای دا تێپەڕی ، رێگای پێدا بۆ ناردن ، پاشان (سەمورە) هاتە بەرامبەری ، رێگای نەدا ، گوتی :-

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، رێگای ئەمەت داو رێگەی من نادەیت ، ئەگەر زۆرانبازی لەگەڵ بکەم بە زەوی‌دا دەدەم .

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :-

ئەوە مەیدان ، (سەمورە) زۆرانبازی لەگەڵ کرد و ، بە زەوی‌دادا ، رێگای پێ‌دا)) .

کاتێك (سەمورە) گوێی لەم ڕازی‌بوونەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەسەر بەشداری کردنی لە جەنگ ، موچرکی خۆشی بەلەشی داهات و ، پاش کەمێك ڕۆیشت بۆ گۆڕەپانی جەنگ ، بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی (لا الە الا اللە محمد رسول اللە) و گەیشتن بە پلەی شەهیدی ...

ئەوەبوو بەشداربوونی (سەمورە) چەند جار دووبارە بوویەوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەبێ ئەوەی سستی و کەمتەرخەمی بنوێنێ ، ئەوەندەی (سەمورە) پێشوازی لە شەهیدی دەکرد لە گۆڕەپانی هەق و شەرەف ، بەڵام پاراستنی خواو شاهیدی بۆ ئەم پیاوە لەم جەنگانەدا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەوا هەموو کارێك بەدەست خوایەو ، موجاهید هەموو کات سوورە لەسەر مردن لە پێناو بەرنامەکەی خوا ، بەڵام مردن ڕادەکات لە بەرامبەریان پێش ئەوەی نەخشە بۆ هەر شتێك بکێشین خوای گەورە نەخشەی بۆ دەکێشێت ...

پاشان ئا ئەمەیە ( سەمورەی کوڕی جوندب ) ، دەبینین لە نێو کۆمەڵێکی بەڕێز لە موجاهیدان ، کەوا گیانی خۆیان خستۆتە نێو دەستیان و ئامادەن بگەن بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان ، هەر هەموویان پەیمانی مردنیان داوە - بەبێ دوو دڵی و کەمتەرخەمی - لە بەیعەی (رضوان)ی پیرۆز ، کەوا خوا دەرهەقیان دەفەرموێت :-

﴿ ان الذين يبايعونك انما يبايعون الله ، يد الله فوق أيديهم ، فمن نكث فانما ينكث على نفسه ، ومن أوفى بما عاهد الله فسيؤتيه أجرا عظيما ﴾ .

وە هەروەها دەفەرموێت :-

﴿ لقد رضي الله عن المؤمنين اذ يبايعونك تحت الشجرة ، فعلم ما في قلوبهم فأنزل السكينة عليهم ، واثابهم فتحا قريبا ﴾

پاشان ( سەمورەی کوڕی جوندب ) ژیانی درێژ بووەوە ، بەگوێرەی توانا جیهادی ڕێگای خوای کردو خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کرد ، هەر کاتێکیش بانگەێژ بکرابایە بۆ جیهاد و جەنگ لە ڕێگەی خوا بە خێرایی‌و بەبێ دواکەوتن بەرەو پیری دەچوو ...

هەروەها کاتێك بینی ( خوارج ) واتە هەڵگەڕاوەکان خراپەیان کرد بە هەڵگەڕانەوەیان لە ( ئیمامی عەلی ) _ خوا لێی ڕازی بێت _ ڕووبەڕوویان وەستا

پاشان ( سەمورە ) گواستی‌یەوە بۆ شاری ( بەسرا ) و تێیدا جێنشین بوو ، لێپرسراوەکانی دەوڵەت پشتیان پێ‌دەبەست لە کاروباری بەڕێوەبردنی دەوڵەت ، هەندێ جار دەیانکرد بە فەرمانڕەوای ( کوفە ) هەندێك جاریش لەسەر ( بەسرا ) دەیانکرد بە فەرمانڕەوا ، لە هەر شارێکیان شەش مانگ مایەوە ، هەروەکو بڵێیت دەیویست بیسەلمێنێت کەوا پیاوی جیهادی ئیسلامی تەنها پیاوی گۆڕەپانی جەنگ نی‌یە ، بەڵکو پیاوی کۆمەڵگایەو توانای ئاوەدان کردنەوەو پەرەپێدان‌و فەرمانڕەوایەتیشی هەیە .

هەورەها جیهادکردن‌و فەرمانڕەوایەتی ( سەمورە)یان خەریك نەکرد لە وازهێنان لە ئەرکی پیرۆز لە ڕوانگەی موسڵمانان ، ئەمەش داواکردنی زانست‌و شارەزابوون بوو لە ئایینەکەی ، هەروەکو بڵێیت هەر لەسەرەتاوە زانیبووی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی :-

(( من يرد الله به خيرا يفقه في الدين ))

ئەوەی زانست بوو لە ئیسلام ( سەمورە ) دەستی دەگەیشتێ‌و شارەزای دەبوو ، سەبارەت بە فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ ( سەدو بیست و سێ ) فەرموودەی گێڕاوەتەوە ، هەرورەها چەند ئەستێرەی پڕشنگداریش لێیان گێڕاوەتەوە ، لەوانە :-

(( ابو رجاء العطاردي‌و ، عبداللەی کوڕی بریدەو ، حسن البصري‌و ، الشعبي‌و ، ابن سيرين‌و، ابن أبي ليلى‌و ، عەلی کوڕی ڕەبیعەو ، ابو نضرة ))و ، زۆری تیریش .

( سەمورە ) هەر لە گەنجێتی‌یەوە هەر خەریکی زانست‌وزانیاری بوو ، هەروەك لە فەرموودە ڕاستەکانی ( بوخاری‌و موسلیم ) هاتووە ( سەمورە ) دەڵێت :-

(( من لــه ســەردەمی پێغەمبــەری خــوا ﷺ تــازه پێدەگەیشـتم ، فـەرموودەكانی پێغەمبەرم ﷺ لەبەردەكرد ، هیچ شتێك نەبوو بەرگریم لێ‌بكات ، تەنها هەندێ كەسی نەبێت كە بەتەمەنتر بوون لەمن )).

هـەروەك ( سـەمورە ) پـەیامێك بـۆ ڕۆڵـەكانی دەنووسـێت كـە پـڕ بـوو لـە زانسـت‌و زانیاری ، تاكو ( ابن سیرین ) دەربارەی دەڵێت :-

( لـە پـەیامێكی سـەمورە بـۆ نـەوەكانی زانسـتێكی زۆر هـەبوو ) ، لەگـەڵ ئەمەشـدا ( سـەمورە ) گرنگی‌یـەكی زۆری دەدا بـە منداڵـەكانی و پـەروەردەی دەكـردن لەسـەر شەریعەتی ئیسلامی‌و هانی دەدان بۆ ئەوەی پێشوازی لە ڕۆژی دوایی بكەن هـەروەك لەوتووێژەكانی هاتووە كە شەوێك یەكێ لە كوڕەكانی زیادەڕەوی دەكات لە خواردنی ئێوارەو تا تێر دەبێت ، بە سەمورە دەڵێن :-

دوێنێ كوڕێكت نە نووستووە لەبەر زۆرخواردن

سەمورە گوتی :- ئەگەر بمردبوایە نوێژم لەسەر نەدەكرد !!

ئەمـەش وشـەیەكی تووندو تیژە و پـەندی تیایە بۆ ئەوانەی زیادە ڕەوی دەكەن لـە دونیا ، دەخۆن‌و دەخۆنەوە هەروەكو چوارپێ

ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە ئەم گەنجە چـەندەهاجار بەشـداری گۆڕەپـانی مردنی كردووە ، بەڵام تەمەنی درێژ بووە ، تا تەمـەنی گەیشتە (حەفتاوپێنج )ساڵ ، لە ساڵی ( شەستی ) كۆچی لە شاری بەسرا كۆچی دوایی كرد ....

بەڵام دووبارە ئـەوەی جێگـای سەرسووڕمانە ( سەمورە ) نـەمرد بە شمشێر یـان ڕم یاخود تیر ، بەڵكو بە ئاوی گەرم كۆچی دوایی كرد ، هەروەك ( ابن الاثیر ) لـە ( النهایـه ) دەگێڕێتەوە كەوا پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی لەسەر ( دە ) كەس كردووە یەكێك لەمانـه ( سـەمورە ) بـووە :- (( كۆتاتـان دەمرێـت بـە ئـاگر )) ( سـەمورە ) دەیـەمیان دەبێـت لەوانە كـــە دەمـــرن .

دەڵێن ( سەمورە ) تووشی لەرزێكی توند دەبێت - ئەمەش لە ئەنجامی سەرما بوون كە تووشی مرۆڤ دەبێت - پێویستی بە گەرمایی‌یەكی زۆر دەبێت ، بۆیـە داوا دەكات مەنجەڵێكی گەورەی بۆ بهێنن‌و ، پڕی بكەن لە ئاو و ، گەرمی بكەن ، جێگایەكیش لەسەر مەنجەڵەكە دروست بكەن .

(سەمورە)ش دەچووە سەر شوێنەكەو هەڵمەكە گەرمی دەكردەوە ، جارێكیـان بـەم جۆرە دەچێتە سەر مەنجەڵەكەو لەپڕ بەردەبێتـەوە نـاو ئاگرەكەو گیانی بەخوای گەورە دەسپێرێت.

خـوای گـەورە لـە یـاوەری بـەڕێزی موجـاهید (( سـەمورەی كـوڕی جونـدب )) ڕازی بێت‌و ، لە ئێمەی گوناهباریش خۆش بێت

*　　　　*　　　　*

# ٦٠

# «رەبیعی»ی
# کوڕی زیادی حارثی

لەم ڕۆژەدا بووم بە فەرمانڕەوا
کەس نەبوو ڕاستم لەگەڵ بکات هەروەك
ڕەبیعی کوڕی زیاد ڕاستی کرد لەگەڵم
(عومەری کوڕی خەتتاب)

## ٦٠

# ( ڕەبیعی کوڕی زیادی حارثی )

## لەم ڕۆژەدا بووم بە فەرمانڕەوا کەس نەبوو ڕاستم لەگەڵ بکات هەروەك ڕەبیعی کوڕی زیاد ڕاستی کرد لەگەڵم عومەری کوڕی خەتتاب

ئەوە شاری مەدینەی پێغەمبەری خوایە ﷺ خەمەکانی دەرەوێتەو هێمن دەبێتەوە بەهۆی لەدەست دانی خەلیفەی یەکەم و هاوڕێی گیانی بە گیانی خۆشەویستی خوا ﷺ ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ

ئەوەش نوێنەری ناوچەکانە هەموو ڕۆژێ دێنە ( یەثریب ) بۆ موبایەعەکردنی خەلیفەی دووەم ( عومەری کوڕی خەتتاب ) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ لەسەر گوێڕایەڵی لە خۆشی وناخۆشیدا

ڕۆژێکی سەر لە بەیانی نوێنەرێکی ( بەحرەین ) لەگەڵ چینێکی تر لە نوێنەران دێنە لای گەورەی بڕواداران

هەروەها ( ئیمامی عومەر ) زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی گوێ بداتە قسەی ئەو نوێنەرانەی دێن بۆ لای ، بەڵکو ئەو قسانەی باسی لێوە دەکەن پەندێکی گرنگی لێوەربگیرێ ، یان بیروڕایەکی بەسوود ، یان ئامۆژگارییەك بێت لە لایەن خواو قورئان و موسڵمانان بەگشتی

ژمارەیەك لەمانە هاتن بۆ لای خەلیفە لە کۆڕەکە ئامادەبوون هیچ قسەیەکی سەرنج ڕاکێشەریان نەکرد ئاوڕی لە پیاوێك دایەوە نیشانەی خێری پێوە دیار بوو ، ئاماژەی بۆ ئەم پیاوە کردو پێی گوت :-

ئەوەی لەلاتە بیڵێ ، پیاوەکە پاش سوپاس و ستایشی خودای گەورە گوتی :-

تۆ ئەی گەورەی بڕواداران جڵەوی فەرمانڕەوایی ئەم ئوممەتەت گرتە دەست ئەمە تاقیکردنەوەیەکە لە لایەن خوای گەورە پێی تاقی دەکرێیتەوە ...

لە خوا بترسە بەوەی گرتۆتە دەست ، ئەمە بزانە ئەگەر کاوڕێك لە قەراغەکانی فورات ون ببێت لە ڕۆژی دوایی پرسیار لە تۆ دەکرێت

عومەر دەستی کرد بە گریان بە دەنگێکی بەرز گوتی :-

هیچ کەسێك ڕاستی لەگەڵ نەکردووە لەو کاتەی بووم بە فەرمانڕەوا وەك ئەوەی تۆ ڕاستت کردووە لەگەڵم ، تۆ کێی ؟

پیاوەکە گوتی :- ڕەبیعی کوڕی زیادی حارثی

ئیمام گوتی :- برای موهاجیر کوڕی زیاد ؟

ڕەبیع گوتی :- بەڵێ

کاتێك کۆڕەکە کۆتایی پێ هات ( عومەری کوڕی خەتتاب ) ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ داوای موسای ئەشعری کردو پێی گوت :-

له ( ڕەبیعی کوڕی زیاد ) بکۆڵەوە ، ئەگەر ڕاست بکا و خێرێکی پێوە بێت و بۆمان ببێت بە یارمەتی دەرێك بۆ ئەم کارە ...

بەکاری بهێنەو هەواڵی ئەم پیاوەم بۆ بهێنەرەوە

ئەم ڕۆژە زۆری بەسەردا نەچوو تاکو – ئەبو موسای ئەشعەری – سوپایەکی دروست کرد بۆ ڕزگارکردنی ( مەناذیر) لە خاکی ئەهواز لەسەر فەرمانی خەلیفەی موسڵمانان ، ( ڕەبیعی کوڕی زیاد )و براکەی لەسەر سوپاکە لەگەڵ خۆی برد ....

– ابو موسای ئەشعەری – شاری ( مەناذیر)ی گەمارۆداو جەنگێکی سەختی لەگەڵ خەڵکەکە کرد بەدەگمەن جەنگی ئاوا ڕووی داوە و ، جەنگێکی بێوێنە بوو ...

هاوبەش پەیداکەران لە سەرەتادا هێزو توانایەکی بێوێنەیان نیشان دا بە هۆی خۆڕاگری و ئازایەتیان ، کە خۆڕاگرییەکی کەم وێنەیان نیشان دا ، کوشتار لە لایەنی موسڵمانان ئەوەندە زۆر بوو سنووری بۆ دیاری ناکرێت .

موسڵمانەکان لەم ڕۆژەدا جەنگیان دەکرد بەڕۆژوو بوون و کاتی مانگی ڕەمەزان بـــوو ...

کاتێك موهاجیر برای ( ڕەبیعی کوڕی زیاد ) بینی کوشتار زۆر بووە لە ڕیزەکانی موسڵمانان ، بڕیاریدا کەوا گیانی خۆی بفرۆشێت بە خوای گەورە و لە پێناوی ڕەزامەندی خوا گیانی خۆی فیدا بکات ، ئەو بۆنەی لە مردوو دەدرێت لە لەشی خۆیداو کفنی لەبەرکردو، لە لای برایەکانی وەسیەتی کرد

( رەبیع کوڕی زیاد ) چووە لای ئەبو موسای ئەشعەری و پێی گوت :–

موهاجیر بڕیاری داوە کەوا گیانی خۆی فیدا بکات و بەڕۆژووە ، موسڵمانان بە هۆی ناخۆشی جەنگ و ئازاری ڕۆژوو ورەیان دابەزیووەو ڕۆژووەکانیان ناشکێنن ، چۆنت پێ باشە وا بکـــە

ئەبو موسـای ئەشـعەری ـ خـوا لـێی ڕازی بێـت ـ هەڵسایە سەرپێ و هـاواری کردو ، گوتی :–

ئـەی کۆمـەڵی موسـڵمانان ، بڕیـارم داوە و سـوێندم خـواردووە لەسـەر هـەموو بەڕۆژوویەك ڕۆژووەکەی بشکێنێت یان واز لە جەنگ بهێنێت ، خۆی لە گۆزەکەی لای خۆی ئاوی خواردەوە و خەڵکەکەش لە دوای ئەو خواردیانەوە .

کـاتێك ( موهاجـیر ) گـوێی لـە بڕیارەکـەی ئـەبو موسـا بـوو ، کـەمێك ئـاوی خواردەوەو گوتی :–

سـوێند بـەخوا لـە تینوێتیـان ئـاوم نـەخواردەوە بـەڵام بڕیـارو سـوێندی گەورەکـەم جێبەجێکرد

پاشان شمشێرەکەی هەڵکێشاو بۆ ناو ڕیزەکانی گاوران دەرچوو بە بێ ترس و بیم لە ملی گاورەکان و دوژمانی خوای دادا ....

کاتێك زۆر چووە ناوەوەی سوپای دوژمنان لە هەموو لایەك گەمارۆیان دا ، لە هەر چوار دەوری شمشێریان ئاڕاستەکرد ، تاکو کەوتە سەر زەوی و شەهید کرا ...

پاشان دوژمنان سەریان لە لەشی جیاکردەوە و لە شوێنێکی ئاشکرا لە گۆڕەپانی جەنگ هەڵیان واسی

ڕەبیع تەماشی ئەم دیمەنەی کردو ، گوتی :–

بەختەوەری بۆ تۆ و باشترین جێگات گرت ... سوێند بەخوا تۆڵەی تۆو کوژراوە موسڵمانەکان دەکەمەوە ( انشاء الله ) ...

کاتێك ( ئەبو موسای ) بینی ( ڕەبیع کوڕی زیاد ) بە هۆی شەهید بوونی براکەی وورەو ئازایەتی گرتوویەتی و زانی چ شۆڕشێك و گڕێك لە سینەی هەڵگیرساوە بەرامبەر بە دوژمنانی خوا ، بۆیە سەرکردایەتی سوپای بۆ بەجێهێشت و ڕووی لە (سوس) کرد بۆ ڕزگارکردنی ...

ڕەبیع و سەربازەکانی هێرشیان بردە سەر هاوبەش پەیداکەران ، وەك ڕەشەبایەك کە دارو درەخت لە ڕەگ و ڕیشەوە دەربهێنێت ، پەلاماری مۆڵگەکانیان دان ، چۆن لافاو بەردو چڵکاو لەگەڵ خۆی دەبات !!

ڕیزی بێباوەڕانیان شێواندو پەرت و بڵاویان کردن و ورەیان دابەزاندن ، خوای گەورە لەسەر دەستی ( ڕەبیعی کوڕی زیاد) (مەناذیر)ەی رزگار کرد ، ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوانی تر بەدیل گیران و ، ئەوەندەی خوا حەز بکات دەسکەوتیان وەدەست هێنا .

پاش جەنگی ( مەناذیر) ئەستێرەی گەشی ( ڕەبیعی کوڕی زیاد ) گەشایەوە و ناوی کەوتە سەرزاری موسڵمانان و هەر باسی ئازایەتی ئەو دەکرا

ڕەبیع بوو بە یەکێك لە فەرماندە ناودارەکان کەوا موسڵمانان بۆ کارە گرنگەکان بە هیوای ئەو بوون و شانازییان پێوە دەکرد ...

کاتێك موسڵمانان بڕیاری ڕزگارکردنی ( سیجیستان)یان دا پەیمانیان دا بە فەرماندەیی ( ڕەبیعی کوڕی زیاد)و هیوایان وابوو سەرکەوتنەکە لەسەر دەستی ئەو بێتە جێ ....

( ڕەبیعی کوڕی زیاد)بە سوپا هێرش بەرەکەی لە پێناوی خوا دەرچوو بۆ ( سیجستان ) پاش بڕینی ڕێگایەك کە خۆی لە حەفتاو پێنج فەرسەخ دەدا ، کەوا دڕەندەیی بیابانەکان بە بڕینی ئەم ڕێگە دوورە ماندووی کردوون و پەکی خستن

یەکەم شوێن هاتە پێشەوە شاری ( روستاق زالیق ) بوو لەسەر سنووری ( سیجستان ) ئەمەش شارێك بوو ئاوەدان کرابووەوە بە کۆشك و تەلاری یەکجار گەورە ڕازابووەوە و ، دەوردرابوو بە شوورەیەکی پۆلایین . بەروبوومێك و خێروبێرێکی زۆری هەبوو

ئەم فەرماندە زیرەکە هەواڵگرەکانی خۆی ڕەوانەی ( روستاق زالیق ) کرد پێش ئەوەی پێی بکات و بچێتە ناو شارەکە ، پاش لێکۆڵینەوە بۆی دەرکەوت کە ئەم میللەتە بەم زووانە ئاهەنگێك دەگێڕن ، ئینجا چاوەڕوانی دەرفەتێکی کرد لە شەوی ئاهەنگەکە بۆ ئەوەی لەناکاو هێرش بکاتە سەریان و شمشێریان لەسەر ملی دابنێ و هەموویان بەدیلی بگرێت ...

بەم جۆرە شێست هەزاری کەسی ( بەدیل ) گرت و ، یەکێك لەوانە سەرۆك ئیقلیمەکە بوو کە کەوتبووە دەستیان وە هەروەها سەرکاری سەرۆك ئیقلیمیش هەروەك ئەو بەدیل گیرابوو ، کە سێ‌صەد هەزاریشی پێبوو کۆیکردبووەو ، بە نیازی ئەوە بوو بۆ گەورەکەی ببات .

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) پێی گوت :- ئەو ماڵەت لە کوێ هێناوە ؟

ئەویش گوتی :- لە یەکێك لە گوندەکان گەورەم

( ڕەبیعی کوڕی زیاد)پێی گوت :- ئایا هەر گوندێك هەموو ساڵێك ئەوەندەماڵە ئەدات ؟

ئەویش گوتی :- بەڵێ ...

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) ئەمە چۆن ؟!!

سەرکارەکە گوتی :- بە تەورەکانمان و ، داسەکانمان و ، ئارەقەمان .

کاتێك جەنگەکە کۆتایی هات سەرۆك ئیقلیمەکەیان هێنا بۆ لای ( ڕەبیعی کوڕی زیاد) ، ئەویش پێشنیاری ئەوە کرد بە موڵکەکەی خۆی ، بکڕێتەوە ...

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) پێی گوت :- ئازادت دەکەم فیدیەی خۆ کڕینەوەت ئەگەر بە موسڵمانان بدەیت

ئەویش گوتی :- خۆ کڕینەوەکە چەند دەبێت ؟

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) گوتی :- ئەم ڕمە لە زەوی بچەقێنە ، پاشان زێرو زیوی بەسەردا کە تا دایدەپۆشێت و ونی دەکات ...

سەرۆك ئیقلیم گوتی :- ڕازیم ، زێڕو زیوی سپی و زەردەکانی هێنا دەرەوە دەستیان کرد بە داپۆشینی ڕمەکە تا ون بوو ...

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) لەگەڵ سوپا سەرکەوتووەکەی سوپایەوە لە خاکی ( سیجیستان ) ، قەڵا لە دوای قەڵا شوورە لە دوای شوورە لەژێر ناڵی ئەسپەکانیان تەسلیم دەبوون ، هەروەك گەڵای دار لە پایزدا هەڵدەوەرێت کە بە هۆی با هەڵدەوەرێت .

خەڵکی گوندو شارەکان دەهاتنەدەرەوەو پێشوازییان لێدەکردن ، ئاواتی ئەوەشیان دەخواست کە مل کەچ بن بۆیان ، بچنە ژێر پەنای ئەوان پێش ئەوەی شمشێر هەڵبکێشرێت لە بەرامبەریان ، تا گەیشتنە شاری ( زەرەنج )ی پایتەختی( سیجستان )..

بۆ گەیشتن بە دوژمنەکانیان کەرەستەی جەنگییان ئامادەکردەوەو ، کەتیبە سوپاکانیان بۆ ئامادەکردن ولە دووری وڵات هاتن بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ، بەڵێنیان داو بڕیاریان دا لەسەر ئەوەی نەهێڵن بێن بۆ ناو شارە گەورەکانیان و ، بیانوەستێنن لە ( سیجستان ) و نەهێڵن زیاتر بێنە پێشەوەو هەموو هێزو توانایەکیان بۆ بخەنە کار .

ئینجا جەنگ دەستی پێکرد لە نێوان ( ڕەبیعی کوڕی زیاد)و دوژمنەکانی و ، هەردوو لا نەیاندەزانی ئەوەندە قوربانییە دەدرێت

کاتێك یەکەم جەولەی شەڕ دەستی پێکرد سەرکەوتن بۆ موسڵمانان بەدیار کەوت ، بۆیە ( مەرزەبان ) سەرۆکی کۆمەڵەکە کەوا ناوی ( پەرویز ) بوو زانی موسڵمانان سەرکەوتن بەدەست دەهێنن و ، تا ئێستاش بەشێك لە هێزی جەنگی ماوە ، لەبەر ئەوە هەوڵیدا بە چەند مەرجێکی چاکتر ڕێك بکەوێت لەگەڵ موسڵمانان .

( پەرویز ) نوێنەرێکی خۆی ڕەوانەی لای ( ڕەبیعی کوڕی زیاد) کرد و داوای لێکرد کاتێکی بۆ داببن بکات و چاوی پێ بکەوێت ، بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەگەڵ بکات و لەسەر چەند خاڵێك ڕێککەون ، ئەویش وەڵامی داواکارییەکەی دایەوە....

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) فەرمانی دا جێگایەك ڕێکبخەن بۆ ئەوەی تێیدا پێشوازی لە ( پەروێز ) بکات و داوای لێکردن دەورەی کۆڕەکە بە لاشە کوژاوەکانی فارس دەورە بدەن ...هەروەها هەندێك لاشەی تریش بڵاوبکەنەوە و لەسەر ڕێگای ( پەروێز ) داینێن .

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) _ خوا لێی ڕازی بێت _ پیاوێکی باڵا بەرزو ، بە هەیبەت و ڕەشتاڵەو لاشە گەورە بوو ترسی دەخستە دەروونی ئەو کەسەی دەیبینی

کاتێك ( پەروێن) لێی چووە ژوورەوە ترس و لەرز گرتی و دڵی داخورپا ، لەبەر دیمەنی ئەو کوژراوانەی کە لەسەر ڕێگای بوون ، زاتی نەبوو بچێتە پێشەوە لە ( ڕەبیع ) و تەوقەی لەگەڵ بکات و ، کە قسەی لەگەڵ ( ڕەبیع ) دەکرد زمانی تێك دەئالاو ، هەموو جەستەشی لەگەڵ یا دەلەرزی ، بە شێوەیەك ڕێککەوتن کە هەزار غولام بۆ ( ڕەبیع ) بنێرێ و هەریەکەشیان جامێك زێڕی لەسەر سەری دا بنێت و بیبات بۆ ( ڕەبیع ) ، ( ڕەبیع )یش قبوڵی کرد .

بۆ ڕۆژی دواتر ( ڕەبیعی کوڕی زیاد ) چووە ناو شار لەگەڵ ژمارەیەك لە بەندەکان لە نێوان تەهلیل و تەکبیری موسڵمانان

ئەمەش ڕۆژێکی پرشنگدار بوو لە ڕۆژەکانی خوا

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) وەکو شمشێرێکی زاڵ مایەوە ، موسڵمانان بە هیمەتی ( ڕەبیع ) شارەکانیان ڕزگار دەکرد ، تا جڵەوی دەسەڵات کەوتە بەردەستی بەنی ئومەمەی‌یە ، معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان کردی بە فەرمانڕەوا لە خوراسان .

لەگەڵ ئەوەش دا ( ڕەبیع ) دڵی خۆش نەبوو بەم فەرمانڕەوایەتی‌یە ... بەڵام زیاتر دڵی ناخۆش بوو حەزی لەم فەرمانڕەوایەتی‌یە نەما کاتێك کەوا ( زیاد کوڕی ئەبیە ) نامەیەکی بۆ نووسی و تێیدا نووسی‌بووی :- ( ئەمیری بڕواداران - معاویەی‌کوڕی ئەبو سوفیان - فەرمانت پێ دەکات زێڕو زیوە دەسکەوتەکانی جەنگ بۆ ( بیت المال ) بهێڵەوەو ، ئەوانی تر لەسەر موجاهیدان دابەش بکە ... ) .

( ڕەبیعی کوڕی زیاد) وەڵامی دایەوە بۆی نووسی :-

( من کتابی خوای گەورەم بینی ئێوە فەرمانم پێ‌دەکەن بە غەیری فەرمانی خوا لەسەر زاری ئەمیری بڕواداران ... ) .

پاشان هاواری کرد :- بڕۆن بەشی غەنیمەی خۆتان وەرگرن ... ئینجا پێنج یەکی دەسکەوتەکانی ڕەوانەی دیمەشق ( دیوانی خەلافەت ) کرد

هەر کە ڕۆژی هەینی هات لەو هەفتەیەی کە نامەکەی پێ گەیشتبوو ( ڕەبیعی کوڕی زیاد) دەرچوو بۆ نوێژ بە جل و بەرگێکی سپی ، وتاری ڕۆژی هەینی بۆ خەڵك خوێندەوە .

پاشان گوتی :- ئەی خەڵکینە من لەم ژیانە بێزارم ، دوعایەك دەکەم ، ئێوەش بڵێن ئامین ....

پاشان گوتی :-پەروەردگارا ، ئەگەر چاکەی منت دەوێت بۆ خۆت بمبەرەوە بە زووترین کات و بەبێ دواکەوتن .

خەڵکەکەش گوتیان ئامین ...

هێشتا ڕۆژ ئاوا نەبووبوو تا ( ڕەبیعی کوڕی زیاد) گەیشت بە خزمەتی پەروەردگاری و دوعاکەی قبوڵ بوو ، لە هەمان ڕۆژ کە ڕۆژی هەینی بوو کۆچی دوایی کرد

ڕەحمەتی خوا لە یاوەری بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەبیعی کوڕی زیادی حارثی

*　　　　*　　　　*

---

**بە پشتیوانی و یارمەتی خوای گەورە چاوەڕوانی بەرگی چوارەم بن ( انشاء اللە )**

# ناوەڕۆك